# له ڕێبازه هزرییه هاوچه‌رخه‌كان

نووسینی

د. سعدون محمود ساموك

وه‌رگێڕانی

بوخاری عبدالله نـــالی یوســف

# له ڕێبازه

# هزرییه هاوچه‌رخه‌کان

**نووسینی**

د. سعدون محمود ساموك

**وه‌رگێڕانی**

بوخاری عبدالله          نالی یوسف

پێشکەشە بە:

دیاری ڕێز و سوپاسگوزاری بۆ بە ڕێز:

مامۆستا دکتۆر عبدالرحیم الحنیطي

سەرۆکی زانکۆی ئەردەنی

ناوی کتێب بەعەرەبی: في المذاهب الفكرية المعاصرة

نوسینـــــــــی: د. سعدون محمود ساموک

ناوی کتێب بەکوردی: لە رێبازە هزرییە هاوچەرخەکان

وەرگێرانـــــــی: نالی یوسف - بخاری عبدالله

نەخشە سازی ناوەوە: وەرگێڕ

ساڵی چـــــاپ: ٢٠١١ز - ١٤٣٠ك

ژمارەی سپـــاردن: ٩٨٣ ی ساڵی ٢٠١١ ی پێدراوە

بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی

website:www.nareenpub.com

E-mail: info@nareenpub.com

تەلەفۆن: ٢٥١١٩٨٢ ٦٦ (٠٠٩٦٤)

مۆبایل: ٠٠٩٦٤ ٧٥٠٤٠٦٤٦١٠

## سوپاس و پیزانین:

**سوپاسی هەموو ئەوانە دەکەم کە بەشدار بوون لە نوسینی ئەم کتێبە.... بە تایبەتی:**

- بەڕێز دکتۆر عبد المجید الصلاحین          ڕاگری کۆلێژی شەریعە لە زانکۆی ئەردەنی.

- بەڕێز دکتۆر یوسف علی غیظان          ڕاگری کۆلێژی اصول الدینی زانکۆیی لە زانکۆی البلقاء التطبیقیة.

- بەڕێز دکتۆر محمد هاشم سلطان          سەرۆکی پێشوی بەشی عەقیدە لە کۆلێژی أصول الدینی زانکۆیی و جێگری سەرۆکی زانکۆی آل البیت.

- بەڕێز دکتۆر بشار عواد معروف          سەرۆکی پێشوی زانکۆی ئیسلامی لە بەغداد مامۆستا لە بەشی أصول الدین لە کۆلێژی أصول الدینی زانکۆیی.

خوای گەورە پاداشتی بەخێریان بداتەوە

# پێشەكی وەرگێڕان

بەناوی خوای كارساز

سوپاس بۆ خوای بێ هاوتا كە پاش هەوڵ و ماندوبوونێكی زۆر توانیمان ئەم ئینسایكلۆپیدیایە وەربگێڕینە سەر زمانی كوردی.

خوێنەری بەڕێز..

لەم سەردەمەدا، هزرو تیۆرو بیردۆز و ڕێبازە مرۆییە دەستكردەكان ئەمسەرو ئەوسەری دنیایان داگرتووەو، شەڕو ململانێی نێوان هزرەكان لەوپەڕی گەرمی دایە، هۆش و بیر و ڕای مرۆڤی ئەم سەردەمە بە هزر و ئایینە مرۆڤكردەكانەوە تەواو سەرقاڵكراوە.

ئێستا گۆڕەپانی جیهان وەكو شاشەیەكی سینەمای لێهاتووە، هەركەسەو دێت و دواڤیێرژنی فیلمی خۆی لە هزرو بیروڕاو ڕێبازەكان نمایش دەكات..، بزانێ ئاخۆ كێ ڕەنگاوڕەنگترین و سەرنجڕاكێشترین هزری جیهانی دادەڕێژێ و خەڵكی پێوە سەرقاڵ دەكات.

لە جیهانی ئیسلامیشدا خەڵكی كەم تازۆر كەوتوینەتە ژێر كاریگەری ئەم هزرو ڕێبازە دەستكردانەو لە شوێنەوارەكانی بێبەش نەبوون..، زۆربەی جاریش هەستیان بە لایەنە مەترسیدارەكانیان نەكردووەو، نەویستانەو دوور لە ئاگایی خۆیان تێیاندا ژیاون و تەنانەت كردویانن بە پڕۆگرام و بەرنامەی ژیانیان.

لەبەرئەوە لەم سەردەمەدا پێویستە لەسەر هەر تاكێكی مسوڵمان بەتایبەتی لە چینی لاوان (كە وشیارترین چینی كۆمەڵگان) هەوڵبدا بڕێك زانیاری لەسەر ئەم قوتابخانەو ڕێبازانە هەبێ و لە نهێنیەكانیان حاڵی بێت تا بتوانێ لەمەڕ هەر ڕوداو و پرسێكی هەنوكەییدا هەڵوێستی بابەتیانەو دانایانە بنوێنێ. بەداخەوە ئەمڕۆ سەرەڕای هەبونی سەرچاوەو ئامرازی جۆراوجۆری زانیاری لەچینێكی كەمی وشیارو چاوكراوە بترازێ زۆر كەم وابووە كۆمەڵگای ئیسلامی لەپاڵ فێربونی زانستە ئیسلامیەكان چەمك و مەبەستەكان و دیوی دواوەی ئەم ڕێبازانەشی خوێندبێتەوەو شیكردنەوەیەكی بابەتیی بۆ كردبن، ئەگەر هەشبوبێ پێویستی بە زانیاری نوێترو هاوچەرخ هەیە.

هەرچەندە وا باوە کە دەوترێ شەڕی هزر و ئایینەکان باوی نەماوە، بەلاّم لە ڕاستیدا لە ڕۆژهەلاّتی ئیسلامی دا لە پاڵ هزری ئیسلامی بازاڕێکی گەرم بۆ ئەم ڕێبازو هزرە ڕۆژئاواییانە هەیەو، هێشتا ململانێی هزری هەر لە ئارادایە، ئەگەرچی جەنگی نەریتەکان لە چوارچێوەی جەنگی ڕۆتینی چۆتە دەرەوەو ڕەوتێکی ڕامیاری بەخۆوە دیوە.

بۆ نمونە ئێستا سەرجەم ڕاگەیاندنی ڕۆژاوا بە زمانی وجودیەت قسە دەکا، زاناو سەرکردە دیبلۆماتکارەکانی ئەوروپا لەڕێی عەقلّیەتی ڕۆژهەلاّتناسیەوە سەیری مسولّمانان دەکەن و مامەلّەیان لەگەلّ دەکەن. ولاّتە زلهێزەکان بەپێشڕەوایەتی ئەمریکا بە زمانی سەرمایەداری قسە لەگەلّ کۆمەلّگای ئیسلامی دەکەن و ...هتد.

لەسەر ئەم بنەما گرنگە، ئێمە هەلّساین بە وەرگێڕانی ئەم کتێبەی بەردەستت لە عەرەبییەوە بۆ کوردی کە لەلایەن دکتۆر سەعدون مەحمود ساموك، مامۆستای کۆلێژی شەریعەی یەکێ لە زانکۆکانی ئوردن لەشێوەی ئینسایکلۆپیدیا ئامادەکراوە.

ئەم کتێبە دە بابەتی سەرەکی گرتۆتەخۆ کە هەریەکێکیان کاریگەری بەرچاوی لەسەر کۆمەلّگای مرۆڤایەتی دوێنێ و ئەمڕۆ هەبوە، ئەوانیش بریتین لە:

(دیموکراسی، ڕۆژهەلاّتناسی، سیکۆلاریزم، جیهانگیری، وجودیەت، پڕاگماتیزم، سەرمایەداری، مارکسیەت، شیوعیەت، زایۆنیزم).

خوێنەری بەڕێز لەکاتی خوێندنەوەی ئەم کتێبەدا پێویستە ئەم خالاّنەت لەبەرچاو بێت:

١- ئەم کتێبە لە بنەڕەتدا وەکو کتێبێکی مەنهەجی Textbook ئامادەکراوە تاکو قوتابیانی کۆلێژی زانستە ئیسلامیەکان لەسەری بخوێنن، بۆیە نوسەر تاڕادەیەك ڕستەو چەمکی کورت و وشکی بەکارهێناوە، ئەمەش لەبەرئەوەی شێوازی نوسینی مەنهەجی وادەخوازێ، جا کاتێ هەلّساین بە وەرگێڕانی بۆ کوردی ویستمان هەمان ڕیتمی مەنهەجیەتەکەی بهێلّینەوە، هەرچەندە هەولّیشمانداوە ڕستەسازی تێدا بکەین و لە وەرگێڕانی وشە بە وشە خۆمان بەدووربگرین، تا خوێنەر هەست بە بێزاری نەکات و چێژ لە خوێندنەوەی وەربگرێ.

٢- مه‌رج نیه ئێمه وه‌كو وه‌رگێڕ له‌گه‌ڵ هه‌مو بیروڕاو بۆچونه‌كانی نوسه‌ردابین، به‌ڵكو له‌زۆر شوێنان تێبینی و سه‌رنجی خۆمان له‌سه‌ری هه‌یه، به‌ڵام به‌شێوه‌یه‌كی گشتی خوێندنه‌وه‌ی ئه‌م كتێبه زانیارییه‌كی به‌سود و پێویست به خوێنه‌ری كورد ده‌گه‌یه‌نێ.

٣- بۆ ڕاڤه‌كردنی ئه‌و ئایه‌تانه‌ی كه هاتوون، ته‌فسیری "ئاسان" مان به‌كارهێناوه.

ئیدی هیواداریـن ئه‌م كتێبه به‌ئه‌ندازه‌یه‌ك سودبه‌خش بێت كه‌بگاته ئاستی ئه‌و ماندوبوونه‌ی كه بۆ وه‌رگێڕانی كێشراوه، هه‌روه‌ها كه‌لێنێكی پێویست له كتێبخانه‌ی هزری ئیسلامی كوردی دا پڕبكاته‌وه‌و، له‌سه‌روی هه‌موشیه‌وه خوای به‌خشنده لێمان ڕازی بێ.

وه‌رگێڕان

بوخاری و نالی

٢٠١١\٨\٢٦

هه‌ولێر

# پێشەکی

سوپاس بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیـان، درووود و سـلاو بڕژێتـه سـەر گیـانی بـەرزترینی نێردراوەکانی...، پاشان. ئـەم کتێبـە کۆمەڵـە توێژینەوەیـەکی کورتـە لـەبارەی ئـەو ڕێبـازە هزرییانـەی کـە مرۆڤـی هاوچـەرخ پێیانـەوە سـەرقاڵ بـووە، مرۆڤـی ئێـستا وا لـە گێـژاوی بیردۆزانێکدایە کە بەخێرایی دێن و دەڕۆن، هەندێکیان دادەڕێژرێن و تا ماوەیـەکی دوورودرێـژ دەمێننەوە و هەندێکیشیان مرۆڤ بۆماوەیەك سەرقاڵ دەکەن و پاشان بزر دەبن.

ئێمە دەزانـین کـە ئـایینی ئیـسلام بـە بەهێزیەکەیـەوە لـەڕوویان دەوەسـتێ، هەربۆیـەش پێویستمان بەوە نییە کە بزانیین ئاخۆ هەڵوێستی ئیـسلام بەرامبـەریان چـی یـە، چـونکە زۆر ڕوون و ئاشـکرایە کـە ئیـسلام زۆر نەلەخـشاوو خـۆگرەو لەگـەڵ ئـەم ڕێبـازە دەسـتکردانەدا بەراوردناکرێ ئەمەش لەبەر دوو هۆکاری سەرەکی:

یەکەم: ئیسلام لە ئاسمانەوە پشتگیری لێ دەکرێ، خوای وەدیهێنەر کە مرۆڤـی وەدیهێنـاوە زاناترە پێی و ئاوەزو توانستەکانی چاکتر دەناسێ، وە قورئانی بۆ ئەم مرۆڤە ڕەوانە کردووە کـە بۆ هەموو کات و شوێنێ گونجاوەو پارێزگاریشی لێ دەکـات بـەپێی وتـەی خـوای گـەورە کـە دەفەرموێ: {إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ} (٩) الحجر، وە قورئـان سەرچـاوەی سەرەکییە بۆ ئیسلام، نەبیرۆکەکان دەیلەرزێنن و نە ڕێبازە جیاجیاکانیش دەیڕوخێنن.

ئـەم کتێبـە ئـەم بابەتانـە لـەخۆی دەگـرێ: دیموکراسیەت، ڕۆژهەلاتناسـی، تەبـشیری و هەرهەولێك بۆ سەرخستنی، پاشـان عەلمانییـەت و جیهـانگیری و وجودییـەت و پڕاگمـاتیزم و سەرمایەداری و مارکسیەت و شیوعییەت و زایۆنیزم. هەرچەندە دەشـکرا زۆر بابـەتی تریـشی تێدا باسبکرێ کە جیهانی ئەمڕۆی ئیسلامی داگرتووە، بەلام بواری تر هەیە کە پەیوەستە بـەم بابەتانەوە وەکو فیرقە کۆنەکان و فیرقـە نوێیـەکان و بیروڕاکـان.. و زۆری تـریش، هەربۆیـەش

كورتمانهه‌ڵهێنا لەم بابه‌تانه به‌جۆرێك كه إن شاء الله له چاپه‌كانی داهاتوودا لێكۆڵینه‌وه‌ی نوێ له‌سەر ئەم بابه‌تانه ده‌كه‌ین..، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا ده‌بێ ئه‌وه بزانرێ كه ئه‌م كتێبه وادانراوه كه بۆ یه‌ك وه‌رزی خوێندن له زانكۆكاندا بخوێنرێ، بۆیه‌ش ده‌بێ كورت و پڕ و سنووردار بێت.

ئه‌م كتێبه ده‌رخستنی ڕاستیه‌كانه له‌باره‌ی تێكه‌ڵه‌یه‌ك له كۆی هزرو بیروڕاو فه‌لسه‌فه جیاجیاكانه‌وه كه قوتابی زانسته ئیسلامیه‌كان پێویستیان پێیه‌تی به شێوه‌یه‌ك كه هه‌ندێك لەم هزرانه ده‌ناسن و هه‌ندێكی تریان ناناسن، جا بۆیه پێویسته هه‌ڵویستی ئیسلامیان بۆ بخرێته‌ڕوو له‌باره‌یانه‌وه، خۆ مه‌رج نییه قوتابی پسپۆڕ له زانسته ئیسلامیه‌كان ته‌نها له پسپۆڕیه‌كه‌ی خۆیدا شاره‌زا بێت و نه‌شاره‌زا بێت به‌و هزرو بیروڕایانه‌ی كه له ده‌ورووبه‌رینی و ڕه‌نگه بۆماوه‌یه‌كیش سه‌رئێشه‌ی بۆ دروستبكه‌ن. بارودۆخی ڕامیاری ئه‌مڕۆ وا له‌سه‌ر مسوڵمان پێویست ده‌كات كه ڕووبه‌ڕووی زۆرێك له‌و هزرانه ببێته‌وه كه هه‌ماهه‌نگه له‌گه‌ڵ ده‌ركه‌وتنی ئه‌و پارته ڕامیاریانه‌ی كه بانگه‌شه‌یان بۆ ده‌كه‌ن، یان ئه‌و قه‌واره نێو ده‌وڵه‌تی و ڕامیاریانه‌ی كه كار ده‌كه‌ن بۆ سه‌پاندنیان به‌سه‌ر جیهانی ئیسلامی دا. به‌مه‌ش ماناكانی جیهادو ڕۆشنبیری ئیسلامی له‌بیر مسوڵمان ده‌باته‌وه‌و پاشان كار ده‌كه‌ن له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه ئیسلام به‌ته‌واوی له‌بیر مسوڵمانان ببه‌نه‌وه به‌شێوه‌یه‌ك سه‌رقاڵیان بكه‌ن به لایه‌نی تری ژیانه‌وه.

پارته شیوعیه‌كان كارده‌كه‌ن له‌سه‌ر بڵاوكردنه‌وه‌ی ماركسیه‌ت و بنیاتنانی دام و ده‌زگای ماركسی له تێكڕای جیهاندا، وه جیهانی ڕۆژئاوا كار ده‌كات له‌سه‌ر بڵاوكردنه‌وه‌ی سه‌رمایه‌داری و دیموكراسی ڕۆژئاوا وه‌كو هه‌وڵێك بۆ ڕاگرتنی هه‌ر كۆششێك كه مه‌ترسی بۆسه‌ر ئیسڕائیل و ده‌وڵه‌تی زایۆنی هه‌یه، وه ئه‌گه‌ر هه‌موو ئه‌مانه‌ش ڕوویده‌ن ئه‌وا گه‌شه‌سه‌ندنی ئیسلام و هزری ئیسلامی ڕاده‌گرێت كه ئێستا سه‌رله‌نوێ له باری ژیانه‌وه‌دایه.

لە ڕوویەکی ترەوە، ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا هەمان تێگەیشتنیان هەیە لەبارەی ئیسلامەوە کە ئیسلام وەکو ئاینی تیرۆر دەبینن، بۆیە لەم کتێبەدا کۆششێکی زۆر کراوە بۆ ڕوونکردنەوەی واتای تیرۆر و هەڵوێستی ئیسلام لەبارەیەوە، چونکە هەر ئیسلام بوو بۆ یەکەمین جار وەستا لە دژی تیرۆری نێودەوڵەتی کە ئەمڕۆ خودی ئیسلامیش بەبلاۆکردنەوەی مەترسیەکانی تیرۆر تاوانبار دەکرێ و لەژێر ناوی ئیسلامدا کردەوەی تیرۆریستی ئەنجام دەدرێن. گیانی بێ تاوانێکیش زۆر بەنرخترە لەوەی کە تەنها پێویست بێ پارێزگاری لێ بکرێ..، لەڕاستیدا ئیسلام وشەی تیرۆری بەکار نەهێناوە تەنها بەمانای پارێزگاریکردن لە نەتەوەی ئیسلام و بیرو هزری ئیسلامی نەبێ، وە ئەم تیرۆرەش "ستاییشکراو"ەو بەهیچ جۆرێك نەویستراو نییە چونکە هەموو نەتەوەیەك پارێزگاری لە خۆی و کیانەکەی دەکات و، ئەسڵ وایە کە هەموو بیروڕایەکی ڕاستەقینە لەپێناو مانەوەی دەبێ بەرگری لەخۆی بکات لەبەرامبەر هەر دەستدرێژییەکی ڕوخێنەر تا ڕاستی سەربکەوێ و ناهەقیش بڕوخێ[1]. و لەکۆتایی دا هیوادارم توانیبێتم سەرکەوتووبم لە هەڵبژاردنی ئەو بابەتانە بۆ کتێبێکی دیراسی وەکو ئەمە، سەرکەوتنیش هەر لەخواوەیە.

دانەر

م . د. سعدون محمودساموك

[1] نوسەر ئەم بابەتە لە ژێرباسی تیرۆر لەبەشی ڕۆژهەڵاتناسیدا بە درێژتر باس دەکات -وەرگێران- .

# دیموکراسی

زاراوەی دیموکراسی داتاشراوە لە وشەی لاتینی(democracy) کە بە مانای "فەرمانڕەوایی گەل" دێت. هەروەها دەشتوانرێ پێناسەی دیموکراسیەت بکرێت بەوەی کە سیستەمێکی فەرمانڕەوایی یە کە تێیدا گەل خۆی مومارەسەی دەستەلآت دەکات، ئەمەش یان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە ڕێگەی گردبونەوەی هاولآتیان بۆ گفتوگۆکردن و چارەسەرکردنی کێشەکانیان، یان بە شێوەی ناڕاستەوخۆ لە ڕێگەی نوێنەرانی گەل کە بە شێوەی خول لە لایەن گەلەوە هەڵدەبژێردرێن. جۆری یەکەم پێی دەگوترێت دیموکراسی ڕاستەوخۆ کە لە دەوڵەتی شاری ئەسینا پەیڕەو دەکرا، هەروەها جۆری دووەم ناسراوە بە دیموکراسی ناڕاستەوخۆ یان نوێنەرایەتی (ئەندامیەتی) ئەم جۆرەش لە زۆربەی ولآتانی ئەمڕۆدا باوە کە لە ئەنجامی زیادبوونی ڕێژەی دانیشتوان لە ولآتە هاوچەرخەکان سەریهەڵدا. هاوکات لەگەڵ شێوازی نوێنەرایەتیش دا هەندێك جار گەڕانەوەی ڕاستەوخۆ دەبێت بۆ گەل لە هەندێك بابەتی تایبەتی وەکو هەمواركردنی دەستوور، کە لە ڕێگای ڕاپرسیەوە دەبێت.[٢]

## تۆتالیتاری ( شمولیەت ):

لە بەرامبەر سیستەمی فەرمانڕەوایی دیموکراسی و حکومەتی دیموکراسی دا کە پەنا دەباتە بەر پەرلەمانێکی هەڵبژێردراو لە لایەن گەلەوە کە نوێنەرایەتی ئاراستەکان و بۆچونەکانی گەل دەکات، سیستەمی تاکڕەوی یاخود شمولی بەدی دەکرێ کە تێیدا دەستەلآت چڕدەبێتەوە لە دەستی تاکەکەسێك یاخود کۆمەڵەیەکی دیاریکراو لە خەڵکی کە مومارەسەی شکۆمەندی بەسەر گەلەوە دەکەن، وێنە جیاجیاکانی ئەو سیستەمەش لە تاکحیزبی و دیکتاتۆری تاکڕەوی دا خۆی دەبینێتەوە.

---

٢ مبادیء العلوم السیاسیة، د. أحمد محمد الکبیسی و آخرون/١٢٩

لە کاتێکدا کە سیستەمی پاشایی لە ڕۆژئاوا گۆڕا بۆ شانشینی دەستوری بۆ هۆی بڵاوبوونەوەی هزرەکانی دیموکراسی وەکو وڵاتانی ئەسکەندەنافیا و تێشیاندا سوێد و نەرویج، شمولیەت لەگەڵ سەرکەوتنی شۆڕشی روسیای شیوعی لە ساڵی ١٩١٧ ز لە ڕۆژهەڵات باڵادەست بوو. بە شێوەیەك کە سیستەمی فەرمانڕەوایی بنیاتنرا لە سەر سیستەمی حیزبی تاکڕەوی ئایدیۆلۆژی، لەوانە حیزبی شیوعی کە لەسەر ئایدیۆلۆژیای مارکسیەت هەڵنرابوو. پاشان لە نێوان هەدوو جەنگە جیهانییەکە (١٩١٩ تا ١٩٣٩ ز) وە بە تایبەتی لە سیەکاندا دوو سیستمی شمولی لە ڕۆژئاوا سەریان هەڵدا کە ئەوانیش نازیەت لە ئەڵمانیا بە سەرکردایەتی هیتلەر و فاشیەت لە ئیتاڵیا بە سەرکردایەتی مۆسۆلۆنی بوون، وە لە دوای جەنگی دووەمی جیهانی لە ساڵی ١٩٤٥ ز سیستمی شوعیەت لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا بڵاو بوەوە کە لە ژێر دەستەلاتی یەکێتی سۆڤیەت دا بوون، کە وای لێ کردبوو مۆسکۆ ببێتە سەنتەری سەربازگەی ڕۆژهەلاتی بەر لە هەرەسهێنانی[٣] .

## هۆکارە بنەڕەتیەکانی دیموکراسی

دیموکراسیەت لەسەر کۆمەڵێك گریمانەی پێشوەختە پەیدا دەبێت کە گرنگترینیان بریتین لە داننان بە ئازادی و یەکسانی و بنیاتنانی دەزگای دەستوری لە پێناو شکۆمەندبوونی ویستی گەل لە ڕووی ڕامیاری و سەرجەم دۆزە جیاجیاکانەوە، هەروەها دەبێ بە لایەنی کەمەوە ئازادی ڕامیاری هەبێ بۆ هەبوونی دیموکراسی. جەوهەری ئەو ئازادیە ئەوەیە کە هەر تاکێك لە کۆمەڵگا مافی ئەوەی هەبێت کە بەشداری بکات لە پرۆسەی بڕیاردان، ئەمەش بە کردار دەکرێ لە ڕێگەی سازدانی هەڵبژاردنی خولی و یەکسانبوونی هەموو تاکە پێگەیشتوەکان لە

---

٣ مبادىء العلوم السياسية /١٣٥

دەنگدان و خۆ پالاوتن بۆ هەر پلەیەکی جێ بە جێ کردن و دادوەری هەرکاتێ هەموو مەرجە پێویستەکانی بۆ ئەم پلەیە تێدا هاتە دی.

یەکێك لە گرنگترین بنەماکانی دیموکراسی بریتیە لە لێکجیاکردنەوەی دەستەلاتەکان، چەمکی لێکجیاکردنەوەی دەستەلاتەکان لەوەوە سەری هەلدا کە فەرمانڕەواکانی سەدەکانی ناوەڕاست دەستەلاتی ڕەهایان هەبوو بەسەر هەموو دەستەلاتەکان دا. جۆن لۆك پێی وایە چڕکردنەوەی هەموو دەستەلاتەکان لە دەستی تاکە فەرمانڕەوایەك دا ئەوە خۆی لەخۆی دا لەخۆباییبوونە. بۆیە ئامانجی **جیاکردنەوەی دەستەلاتەکان** بریتی یە لە لێسەندنەوەی بەشێك لە دەستەلاتەکانی فەرمانڕەوا بە تایبەتیش جێبەجێ کردن و دادوەری، و دانیان بە کەسانی تر. ئەمە جگە لەوەی کە کۆمەلێك ڕێو شوێنی لەبار پەیڕەو دەکرێ بۆ ڕێگری کردن لە فەرمانڕەوا کاتێ بیەوێ ئەو دەستەلاتانە بگێڕێتەوە یاخود دەستبخاتە نێویان.

ئەگەربێتو دوو دەستەلات لەیەك دەستدا کۆ ببێتەوە ئەوا بە شێوەیەك لە شێوەکان زۆرداریو بەکارهێنانی زۆربگێری لە دەولەتداری دا دروست دەبێت هەروەکو چۆن لە زۆربەی سیستمە دیکتاتۆریەکانی جیهانی ئەمڕۆدا بەدی دەکرێ[٤].

بەشێوەیەکی گشتی دەستوری زۆربەی ولاتانی جیهان شێوازی فەرمانڕەوایی ئەو ولاتە دیاری دەکات و، بنەما کۆمەلایەتی و ئابووری و ڕامیاری و فەرهەنگی یەکانی کۆمەلگا و دەولەت بنیات دەنێت. هەروەها پسپۆریەکانی دەزگاکانی دەستە دەستوریەکان ڕوندەکاتەوەو، شکلێك دەدات بە سنوری سێ دەستەلاتەکە ( یاسادانان، ڕاپەڕاندن، دادوەری)، وە پەیوەندیەکانی ئەو دەستەلاتانە لەگەلێ یەکتری ڕێك دەخات و، گرێنتی ماف و ئازادیە گشتیەکان بۆ هاولاتیان دابین دەکات و لە هەمان کاتیشدا ئەرکە سەرەکیەکانیشیان دەخاتە ڕوو[٥].

٤ الدساتیر العراقیة، حکمت حکیم لاپەرە ١٧

٥ ماذا تبقی من صدام، إسماعیل صادق لاپەرە ٢٣٠

ئەمە لە کاتێکدا کە هیچ سیستمێکی فەرمانڕەوایی نییە لە جیهاندا کە بانگاشەی گەرەنتی ئازادیەکان نەکات و باس لە پاراستنی ئازادیەکان نەکات کەچی لە هەموو سیستمەکانیش زیاتر ئازادیەکان دەخنکێنێ، لەوانەیە هەندێ ئازادی دابێ بە دارو دەستەکەی کە بۆیان ڕەوابێ هەموو شتێ بە گەل بکەن هەر لە گرتن و ئەشکەنجەدان و کوشتن ئەگەر خواستیان لەسەربێ.

لەڕاستیدا گرێنتی دۆزی ئازادی ناکرێ تەنها لە ڕێگای یاسادانان و جیاکردنەوەی دەستەلاتەکان نەبێ، چونکە مرۆڤ بە سروشتی خۆی تینوی تاکڕەوی و مومارەسەکردنی زۆرداری یە[٦]، هەروەها دەستەلاتیش پاڵ بەمرۆڤەوە دەنێ بۆ گەندەڵی هەروەکو مۆنتسیکۆ لە کتێبی(ڕۆحی یاساکان) باسی لێوەکردووە، مرۆڤ هەرچی بکات بەبێ هەبوونی یاسا ئۆقرە ناگرێ.

لێرەدا هەردەبێ یاسادانان هەبێ کە دان بە ئازادیە ڕەواکان دا بنێ و بڕیار لەسەر جۆرەکانیان و چۆنیەتی مومارەسەکردنیان بدات، واتە هێڵی سەوز و سور بۆ هەموو ئازادیەك دابنێ وەکو: ئازادی موڵکدارێتی و، ئازادی بیرو ڕا و هتد ... . پێش هەموو شتێك بوونی کۆمەڵەو ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ پێویستە کە پێکدێت لە یاسادانەران و خەڵکی ئاسایی کە هەڵدەستن بە کاری چاودێری و دانانی مافە مرۆییەکان لە وڵاتدا، جا ئەگەر هاوڵاتی ترسی هەبوو لەوەی کە داوا تۆمار بکات لەسەر ئەو لایەنەی کە دەستدرێژی کردۆتە سەر مافەکانی بەهەر هۆکارێك بێ ئەوا ئەم کۆمەڵەو ڕێکخراوانە سەلاحیەتی تەواویان هەیە کە بەرگری لەو مرۆڤە بکەن، یان بە نوێنەرایەتی ئەو داواکەی بەرز بکەنەوە.

---

٦ مبادئ العلوم السياسية-١٣٦

کاری ئەم ڕێکخراوانە تەنها بەم بەرپرسیاریەتیە سنوردار ناکرێ بەڵکو هەڵدەستێ بە چاودێری کردنی مافە مرۆییەکان لە یاسادانان و گفتوگۆکانی نێو پەرلەمان و هەروەها چاودێریکردنی بڕیارەکانی ئەنجومەنی وەزیران وبڕیارنامەی دەرچووی وەزیرەکان و، کار دەکات لەسەر هەڵوەشاندنەوەی هەرشتێك کە مەترسی لەسەر مافەکانی مرۆڤ هەبێت.

ڕەنگە جیاکاریە ڕەگەزی و ئایینیەکان لە گرنگترین کێشەکان بن کە تێیدا ئەو کۆمەڵەو ڕێکخراوانە دەستە وەستان دەبن ، و دروشمی دیموکراسیەت بەرز دەکەنەوە بۆ گەیشتن بە یەکسانی ڕاستەقینە کە بە گرنگترین بنەماکانی دیموکراسیەت دەژمێردرێت.

## بەراوردێك لە نێوان سیستمی دیموکراسی و سیستمی تۆتالیتاری:

سیستمی تۆتالیتاری لە سەر مەبدەئی (الغاية تبرر الوسيلة) واتە "ئامانج ڕەوایی دەدات بە هۆکار " کاردەکات. لە گرنگترین ئەولەویاتەکانی تۆتالیتاریزم بریتیە لە پارێزگاری کردن لە دەستەڵات بە هەموو شێوەیەك وئەمەش سەر دەکێشێ بۆ بەکارهێنانی زەبر و زەنگ و هۆکارە جیاجیاکانی توند و تیژی لە لایەن حکومەتەوە تەنانەت ئەگەر پێچەوانەی بەها ڕەوشتیەکان و یان بەها دەستوریەکانیش بێت کە مەرجە حکومەت پێیانەوە پابەندبێت. بە ئاسانی هەست بەوە دەکرێت کە سیستمی تۆتالیتاری قێزەونترین ئامرازەکانی زەبر و زەنگ و زۆرداری دەخاتەگەڕ بۆ سەرکوتکردنی ئۆپۆزسیۆن لە ڕێی دەزگا نهێنی و هەواڵگریەکانەوە کە خاوەنی سەلاحیاتێکی بەرفراوانن. لە نمونەی ئەو دەزگایانە: ئەوەی کە بە "جستابۆ" ناسراوبو لە ئەڵمانیای نازی و "کەی جی بی" لە یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو.

لە لایەکی ترەوە تێبینی دەکرێ کە دەستەڵاتی تۆتالیتاری هۆکارەکانی پەیوەندی وەکو ئیستگەو ڕۆژنامەو تەلەفزیۆنەکان قۆرخ دەکات بەوەی کە هەڵدەسوڕێنرێن لەلایەن دەوڵەتەوە،

یان تەنانەت خاوەندارێتیان دەکرێت بە مەبەستی زاڵبوون بەسەر ڕای گشتی. لەوانەیە ئەو خاسیەتە جیاکەرەوەی سەرەکی نێوان دەستەڵاتی تۆتالیتاری هاوچەرخ و دیکتاتۆریەتی زۆرداری کۆن بێت.

بە شێوەیەکی گشتی سیستمی تۆتالیتاری ڕێز لە ئازادی هزری و ئازادی ڕادەربڕین ناگرێ، بەڵکو ئایدیۆلۆژیایەکی فەرمی نەویستراو لە لایەن حکومەتەوە بەسەر هەموو تاکێکی کۆمەڵگادا دەسەپێنرێ.

## دیموکراسیەت و نوێنەرایەتی کردن:

یەکێ لە گرنترین پاساوەکانی سیستمی نوێنەرایەتی بریتیە لە ئەستەم بوونی جێبەجێ کردنی دیموکراسیەتی ڕاستەوخۆ، هەربۆیەش یاسادانەرەکان گەیشتونەتە دوو بیردۆزی جیاواز بۆ ڕەواپێدانی نوێنەرایەتی کردنی گەل لە فەرمانڕەوایی دیموکراسی کە لە لایەن گەل خۆیەوە شەرعیەتەکەی پێ دەدرێ، کە ئەمانیش بریتین لە:

- *بیردۆزی نوێنەرایەتی کردنی یاسایی*: بەو واتایەی کە نوێنەر یاخود بریکار هەڵدەستێ بە ڕاپەڕاندنی کارە یاساییەکان بەجۆرێك کە هەر بەرهەمێکی لێبکەوێتەوە ئەستۆیەکەی دەکەوێتە باڵی بریکار پێدەرەکە یاخود ئەو کەسەی کە نوێنەرایەتی دەکرێت، بەمەش نوێنەرەکان و بریکارەکان تەمسیلی گەل دەکەن.

- *بیردۆزی ئەندامیەتی*: سودەکەی ئەوەیە کە تەنها کەسێك نوێنەرایەتی کۆمەڵێك یاخود ڕێکخراوێك دەکات و هەڵدەستێ بە بڕیاردان، بوون بە ئەندام لە کۆمەڵێکی ڕامیاری وەکو ئەندامێکی لەشی مرۆڤ وایە بە جۆرێك کە کەسایەتیەکەی تەواو سەربەخۆ نی یە، بەڵکو هەڵدەستێ بە مومارەسەکردنی ئەرکێکی دیاریکراو.

مامۆستا "پارتملی" پێی وایە بۆ هەبوونی هەماهەنگی لە نێوان سیستمی نوێنەرایەتی و یاسادا پێویستە تەنها ڕەچاوی ڕێو و شوێنە یاساییەکان نەکرێت بەڵکو پێویستە بە چاوێکی واقیعیانە سەیری پرسەکان بکرێ، چونکە هێنانەدی سیستمی دیموکراسی ڕاستەوخۆ ئەستەمە وە لێرەوە دیموکراسیەت تەنها بریتیە لە بەشداریکردنی گەل لە فەرمانڕەوایی لە ڕێی نوێنەرەکانیەوە، بەمەش یاسا پارێزراو دەبێت.

بێگومان پەرلەمان نوێنەری ڕاستەقینەیە بۆ ویستی گەل و سەرەڕای ئەمەش هەندێك جار گەڕانەوەی ڕاستەوخۆ بۆ گەل پێویست دەبێت بۆ زانینی ویست و ئارەزووەکانی، ئەمەش نایەتە دی تەنها لەڕێی خولی هەڵبژاردنەکانەوە نەبێ. نوێکردنەوەی خولی پەرلەمانی نابێ بۆ ماوەیەکی کەم بێت تاوەکو نوێنەرەکان بە شێوەیەکی بەردەوام نەکەونە ژێرباری دەنگدەرانەوە، هەروەها نابێ ماوەی نێوان خولەکانیش دوور و درێژ بێت ئەمەش بۆ ئەوەی پەرلەمان دوورنەکەوێتەوە لە ئاراستەکانی گەل، ئیتر لەمەوە ماوەی نێوان خولەکانی پەرلەمان بە چوار یاخود پێنج ساڵ دیاریکراوە.

بەم شێوەیە هەرسێ سیستمی ڕامیاری وڵات بە شێوەی لەیەکترجیاکراوە شکڵی خۆیان وەرگرت بە تێڕوانینی ئاستی پەیوەندی و پەیوەست بوونیان بەیەکەوە: ئەگەر پەیوەندی نێوان دەستەڵاتەکان لەسەر بنەمای یەکسانی دروست بوو ئەوا سیستمەکە پەرلەمانی دەبێت، خۆ ئەگەر توانست و زۆرینە بگەڕێتەوە بۆ دەستەڵاتی جێبەجێکردن ئەوا ئەو سیستمە ناو دەبرێت بە سیستمی سەرۆکایەتی، ئەوەی کۆتاییشی پێی دەگوترێ سیستمی "دەستە جەمعی" ئەگەر بێت و دەستەی یاسادانان زاڵ بێت بە سەر ئەوانی تردا[٧].

٧ مبادئ العلوم السيسية، النظام البرلماني لاپەرە ١٤٣

## سیستمی په‌رله‌مانی :

له سیستمی په‌رله‌مانی دا سه‌رۆكی ولآت یان پاشا ده‌بێت به شێوه‌ی میرات، یاخود سه‌رۆك كۆمار له ڕێی هه‌ڵبژاردنه‌وه‌، به‌لاّم سه‌رۆكی ولآت ده‌بیّ سه‌ربه‌خۆ بێت هه‌م به‌رامبه‌ر په‌رله‌مان‌و هه‌م به‌رامبه‌ر ئه‌نجومه‌نی وه‌زیرانیش، واته ده‌بیّ كه‌سایه‌تی سه‌رۆكی ولآت جیابێت له كه‌سایه‌تی سه‌رۆكی حكومه‌ت كه سه‌رۆكایه‌تی ئه‌نجومه‌نی وه‌زیران ده‌كات.

له نمونه‌كانی سیستمی په‌رله‌مانی وه‌ك ئه‌وه‌ی كه له به‌ریتانیا و هیندستان و یابان و ئوستوڕالیا و كه‌نه‌دا و ئیتالّیا دا هه‌یه‌.

## حكومه‌تی تێكه‌ڵ:

به كورتی، ئه‌م سیستمه به‌وه جیا ده‌كرێته‌وه كه په‌رله‌مانێكی هه‌ڵبژێردراوی هه‌یه كه له‌سه‌ری پێویسته حكومه‌تێك هه‌ڵبژێرێت، ئه‌م حكومه‌ته بۆ ماوه‌یه‌كی دیاریكراو سه‌رۆكایه‌تی ده‌كرێت له لایه‌ن سه‌رۆك كۆماره‌وه كه ڕاسته‌وخۆ له لایه‌ن گه‌له‌وه هه‌ڵبژێردرابێت.

ئه‌م سیستمه له تێكه‌ڵه‌ی سیّ به‌شی گرنگ پێك دیّ كه هه‌ریه‌كه‌شیان ده‌سته‌لاّت و سه‌لاّحیاتی خۆی هه‌یه‌و، ئه‌م حكومه‌ته سه‌رۆك كۆمار و په‌رله‌مانی هه‌یه كه كاره‌كانیان به شێوه‌ی هه‌ماهه‌نگی و هاوسه‌نگی جێبه‌جیّ ده‌كه‌ن له نێوان هه‌ردو ده‌سته‌لاّتی یاسا دانان و جیّ به جیّ كردندا، سه‌باره‌ت به ده‌سته‌لاّتی سه‌رۆكایه‌تیش جیاكاری ده‌كرێت له نێوان هه‌ردوو ده‌سته‌لاّته‌كه‌دا.

هه‌روه‌ها ده‌كریّ سه‌رۆك كۆمار و سه‌رۆك وه‌زیران له دوو حیزبی جیا بن كه هه‌ندیّ جار ده‌بێته هۆی ململانیّ له نێوانیاندا. له نمونه‌ی ئه‌م سیستمه تێكه‌ڵه‌یه ولآتانی وه‌كو فه‌ڕه‌نسا و ئێرله‌نداو فنله‌نداو نه‌مسا هه‌یه‌.

بەدرێژایی هەموو مێژوو دیموکراسیەت پەیڕەو نەکراوە تەنها لە کاتی دەرکەوتنی دا نەبێت لە شارە یۆنانیەکانی وەکو ئەسینا و ئەسپارتە.

ئەو حکومەتەی کە ئەو سیستمەی بەکارهێنا پێی دەوترێ (حکومەتی شاری) ... پیاوانی شار لە هەر یەکێك لەو شارانە کۆ دەبوونەوە بە شێوەی ئەنجومەنی یاسادانان، کە فەرمانڕەوایەکیان لە نێوان خۆیاندا هەڵدەبژارد و گفتوگۆیان دەکرد لە بارەی پرسەکانیان و هەروەها یاسایان بۆ خۆیان دادەڕشت، سەرەڕای ئەمەش چاودێری جێبەجێکردنی حکومەتیان دەکرد.

ئەم دیاردەیەش بەردەوام بوو لە یۆنان تاکو دەرکەوتنی مەسیحیەت و سەرهەڵدانی ڕابوونی ئیغریقی تێکەڵ بە کەلتوری یۆنانی..، وەکو سیستمێکی "دەرەبەگایەتی" دەرکەوت و شوێنی دیموکراسی گرتەوە. سیستمی دەرەبەگایەتی زیاتر لە هەزار ساڵ فەرمانڕەوایی یۆنانی کرد، ئەمەش لە بەرژەوەندی ئایینی مەسیحیەت دا بوو وە تەنانەت بە یەکەوە دەستبار بوون. هەموو هەوڵێکی مەسیحیەت ئەوە بوو کە فەرمانڕەواکان بێنە ژێر باری کلێسا نەك ئازاد کردنی گەل، تا وای لێهات گەل دەینالاند بە دەستی سیستمەکانی دەرەبەگایەتی و کلێسای سەپێندراو بە شێوەیەك کە گەل هیچ مافێکی نەبوو تەنانەت کەرامەتیش. لەم ناوچەیەدا کە ئەو سیستمە دیموکراسیەی بەرهەمهێنا کە ئێستا باسی لێوە دەکەین هیچ مانایەك بۆ بوونی مرۆڤ نەمابوو.

وای لێهات، لە سیستمی دەرەبەگایەتی کلێسایی دا پاشا بە "سێبەری خودا لە زەوی" دادەنرا و، ئەوەی شەڕی پادشای کردبایە ئەوا شەڕی "خودای" دەکرد... ، پاشا وای لە خانەدان و بەگزادەکان کردبوو کە دەست نەپارێزن لەو زەویانەی کە لە ژێر دەستیان بوون، میر و ئەشرافەکان بە هەرشێوەیەك ئارەزویان لێبوایە بە بێ دەستگێرانەوەو یاسا پارێزی مامەڵەیان

به زەویەکانی خۆیان و گەلەکەیان دەکردو، وای لێهات خەڵکی سەر ئەو زەویانەیان بە"بەنده" بانگ دەکرد، میر یان بەگ دەسەلاتدارێکی ئەوەنده ڕەها بوو کە نوێنەرایەتی هەموو دەستەلاتەکانی دادوەری و یاسادانان و جێ بە جێکردنی دەکرد.

هەروەها هەڵدەستان بە خواردنی هەرچی موڵك و سامانێك کە جوتیارەکان کۆیان دەکردەوە بە کارکردن لە زەوی دەرەبەگ و خانەدانەکان، ئەو جوتیارانەی کە بە درێژایی تەمەنیان لە کارکردندا بوون بۆ پادشا. خودی پادشا بێ بەشی دەکردن لە وەرگرتنی دەستحەقەکانیان .

ئینجا ئەگەر بێت و سەیری دەستەلاتی دووەمی کۆمەڵگای ئەوسا بکەین، ئەوا دەستەلاتی کلێسا دەبینین بە جۆرێ کە ژێردەستەبوونی خەڵکی بۆ کلێسا بە پیرۆز دادەنرا، کلێسا هەڵدەستا بە سەپاندنی باج و دەیەك (واتە دەست بەسەراگرتنی دەیەکی بەرهەم یان دەیەکی موڵکەکانیان) جا چ وەکو باج یان وەك کارکردنی بێ بەرامبەر لە زەویەکانی کلێسادا.

کاتێکیش پادشا یان ئیمپراتۆر یان میر لە سیستمەکەیان دەردەچون، کلێسا هەڵدەستا بەزۆر خەڵکی دەکرە سەربازو شەڕی لەدژیان ڕادەگەیاند و کۆتایی پێدەهێنان. زۆر نمونەمان هەیە لە مێژووی کلێسا کە بەمشێوەیە بووە... وەکو (شەڕە خاچپەرستیەکان)، گەورەترین نمونەش بریتیە لە "شەڕی میللی گەورە" کە لە هەموو لایەکی ئەوروپا پیاوان کۆبوونەوە بۆ ڕوبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ڕۆژهەلاتی ئیسلامی.

کاتێك کە شۆڕشی دەرونی بۆ سەر کلێساو سیستمی دەرەبەگایەتی زۆری بۆ هێنان ئەوروپا هەڵسا بە بانگەشە کردن بۆ"جەنگی پیرۆز" لە دژی مسوڵمانان لە ڕۆژهەلات، ئەمەش دوای ئەو بانگەشەیەی دەیانکرد گوایە ستەمیان لێ کراوە لە لایەن مسوڵمانە سەلجوقیەکان بەوەی کە هێرشیان کردبێتە سەر قافڵەیەکی حاجیانی مەسیحی کە بۆ شاری قودس دەڕۆیشتن.

چیرۆکەکەش ئەوەیە کە قافڵەیەکی ئەوروپی کە پێکهاتبوو لە چەند حاجیەکی مەسیحی ئاسایی بۆ شاری قودس دەڕۆیشتن و هەندێ موڵك و پارەو زێڕو یاتاغ و ئاژەڵیان پێبوو، لە ڕێگادا ڕووبەڕوی هێرشێك بوونەوە لە لایەن سەربازە سەلجوقیە مسوڵمانەکان (کە تورك بوون)و، ئەو کاتی فەرمانڕەوایی ڕۆژهەلاتی ئیسلامیان دەکرد لە ژێر ناوی " دەوڵەتی سەلجوقی ئیسلامی". ئەو هێزە هەموو ئەوانەیان کوشت کە لە قافلەکەدا بوون و هەرچی کە پێیان بوو لە موڵك و ماڵ بردیان، تەنها یەکێکیان نەبێ کە دەرباز بوو و هەلات. ئەو کەسە گەڕایەوە ئەوروپاو هانای بردە بەر پاپا بۆ پاراستنی قودس.

دوای ئەمە پاپا داوای لە هەمو مەسیحیەکانی جیهان کرد کە یەکگرن و دەستبارگری یەکدی بن و بێنە پاڵ یەکتری لە پێناوی دابینکردنی ڕێگایەکی سەلامەت بەرەو قودس تاوەکو مەسیحیەکان بە سەلامەتی و بە ئاسایشەوە حەجی خۆیان بکەن، ئەوەبوو کە لە هەموو ئەوروپاوە خەڵکی لەسەر داوای پاپا یەکیانگرت و هاتنە ڕیزی سوپاکانی خاچپەرستی ڕزگاریخوازیەوە کە بەرەو ئەو ئامانجە هەنگاویان ناو دواتریش هێنایانە دی.

بۆ لێکۆڵینەوەی ئەم چیرۆکە پێویستە بگەڕێینەوە بۆ ئەوروپای ئەوکات بۆ هەڵوەستە کردن لەسەر ئەو بابەتە و زانینی ڕاستیەکە.

## ئەوروپا لە چاخەکانی خاچپەرستی دا:

ئەوروپا لەو ساتانەدا نوقمی ئەمانەی خوارەوە بوبوو:

١-خەڵکی بە دەستی سیستمی دەرەبەگایەتی و زۆرداریيەوە دەیانناڵاند، شۆڕشەکان لە دژی سیستمی زاڵی دەرەبەگایەتی و کڵێسەیی زیادیان کرد، بەم هۆیەشەوە زیندانەکانی ئەوروپا لە هەموو لایەك پڕبوون لە یاخیبووەکان و شۆڕشگێڕان سەرەڕای هەبوونی زیندانیە تاوانبارەکانی وەکو دز و دەستدرێژیکار و بکوژ و هی تریش کە سیستمی دەستەلاتدار پالی پێوەنابوون بۆ ئەنجامدانی ئەم تاوانانە.

کڵێساو دەزگاکانی ئەوکاتی ئەورووپا لەسەریان بوو کە خواردن و خواردنەوەو شوێنی حەوانەوەو دڵنیایی پزیشکی و هی تریشیان بۆ دابین بکەن ( ژمارەیان ئەوەندە زۆر بوو کە بودجەی ولاتانی ئەورووپا چیتر نەیتوانی لەخۆیبگرێت) .

٢-میرنشین و موڵك لە ژێر چنگی تاکە کەسێك لە تاکە بنەماڵەیەکدا چڕ دەبویەوە، لە کاتی فراوان بوونی بنەماڵەکان و گەورەبوونیان خەڵکی چاوتێبڕ پەیدا دەبوون لە نێو خودی بنەماڵەکاندا بۆ گەیشتن پێیان. هەرچەندە کە کەسانی بە تواناتر هەبون لە نێویاندا لە ڕوی جەستەیی و عەقڵی و هزری دا بەلاّم کڵێساو سیستمەکەی خەڵکی تری دادەنا، ئیتر بەم جۆرە ململانێی توند پەیدابوو لە نێویاندا لەسەر فەرمانڕەوایی کە پاپاییەکان بە دەستیانەوە دەیاننالاّند.

٣- دەنگ و هەرایەکی زۆر هەبوو لەسەر سیستمی پاپایی و کلێسایی زاڵ بەسەر ئەورووپا، زۆر لە خەڵکی داوای ڕزگاربوونیان دەکرد لێی... تەنانەت هەندێك جار پیاوانی ناو کڵێساش بەشداریان دەکرد تێیاندا، هەروەك چۆن دواتر لە کاتی سەرهەڵدانی کڵێسای پرۆتستانتی دەرکەوت. پاپا کەوتە بارێکی لاواز بە شێوەیەك کەوا پێشبینی دەکرا لە کۆتاییدا دوژمنانی سیستمەکەی بتوانن شۆڕش لە دژی بەرپا بکەن. شتێکی ئەوتۆ نەبوو کە بکرێ لەبەرامبەر ئەو شۆڕشە کە کەسەراپای ئەورووپای گرتەوە، هەربۆیەش پاپا هەڵسا بە بانگاشەکردن بۆ شەڕی پیرۆز کە ئەوانەی بڕوایان بە ئاین هەبوو بەهیچ جۆرێك نەیاندەتوانی ملەجیڕەی لێ بکەن. پاپا لە کاتی بانگاشەکردن بۆ شەڕی پیرۆز ئەم بەڵێنانەی دابوو بەو کەسانەی بەشداری دەکەن لە شۆڕش:

أ- هەر زیندانیەك بەشداری شەڕی پیرۆز بکات ئازاد دەکرێت وە ئەمەش جۆرە لە کۆڵکردنەوەیەك بوو لە ڕووی سیاسی و پاشان ئابوریش، هەروەها بەڵێن بەوانەش درا کە

چاوتێبڕییان دەکرد لە میرنشینەکان بە دروستکردنی میرنشین بۆیان لە زەویەکانی ڕۆژهەلاّت پاش داگیرکردنیان، بەمەش دەرگا بەڕووی هەندێ لەو هەراو ئاژاوەیە داخرا کە داوای هەبوونی میرنشینیان دەکرد لە ئەوروپا بەوەی کە دەکرانە میر لە خاکێکی تردا.

ب- دورخستنەوەی مەترسی لەسەر ئەو میرانەی کە کێبڕکێیان دەکرا لەسەر خاکەکانیان لە ئەوروپا، بەشێوەیەك کە هەریەکێکیان بێخەم بن لەم ترسە.

ئەوەی کە لێرەدا گرنگە ئەوەیە کە ئەوانەی باسمانکردن هەمویان هاتنەدی و، خاکەکانی ولاّتانی ئیسلامی "ڕزگارکران" لە سالاّنی ١٠٩٨ز ەوە، هەموو ئەو شتانەی کە دەیانویست لە پادشانشین و میرنشین دایانمەزراند و ئەو زەویانەش لەلایەن مسولّمانانەوە ڕزگار نەکرانەوە تا سالّی ١١٩٦ز کاتێ کە سەلاّحەددینی ئەیوبی و ئەوانەی کە لەگەلّی بوون لە مسولّمانان بەیەکەوە هەلّسان بە وەدەرنان ودەرکردنی خاچپەرستەکان و دورخستنەوەیان لە زەویەکانی دەولّەتی ئیسلامی بە تەواوی.

خاچپەرستەکان بە تێکشکاوی گەڕانەوە بۆ زەویەکانیان و بێسەروبەری لەنێویاندا بلاّوبویەوە، گۆڕان بەسەر عەقلّیەتیاندا هات و بە هۆی هەندێ شۆڕشی ناوەخۆیی کلّێسایان دابەشکرد بۆ کلّێسای پرۆتستانتی سەربەخۆ و کاسۆلیکی کە پێشی دەوترا سیستمی پاپایی.

پاپا ناچاربوو لەشوێنێك نیشتەجێ بێت کە سیستمی ناڕەزایی پرۆتستانتی تێدا سەری هەلّنەدابێ و، هەلّسا بە هەلّگیرساندنی شەڕێکی ناوەخۆی خاچپەرستی لە زەویەکانیدا کە باشوری ئەوروپای دەگرتەوە. دادگاکانی پشکنین (محاكم التفتيش) لە سەدەکانی ناوەڕاست هەلّسان بە جێبەجێکردنی سەختترین سیستمی دیکتاتۆری لە ئەوروپا ئەمەش ئەوەی لێ کەوتەوە کە ئاڕاستەی خەلّکی گۆڕا بۆ هزری یۆنانی کۆن کە زۆربگیری و دیکتاتۆریەتی ڕەت دەکردەوە، سەرەڕای ئەوەی کە ماوەیەکی زۆریشی بەسەردا تێپەڕی بوو. خەلّکەکە داوای بنیاتنانی سیستمی دیموکراسیان دەکرد لەنوێوە.

لەوانەشە زانکۆکان و شۆڕشی پیشەسازی و شۆڕشی فەڕەنسی و گۆڕانکاری تریش هۆکار بووبن بۆ لاواز بونی پاپا، ئەمە جگە لە بەربلاوبونی هزری نەتەوەیی کە هەڵشاخی بەڕووی شەقڵی ژیانی کۆمەلایەتی ئەوروپا[٨].

ئیدی ورده ورده دەستەلاتی پاپا بەرەو تەسکبونەوە دەچوو، تاکو هاتنی سیستمی ئیستیعماری نوێ ( کەهەر سیستمی خاچپەرستی بوو بەڕویەکی ئایینی ساکارتر بەلام دڕندەتر)، چونکە داخوازی ئەوەی دەکرد کە تێکڕای هەرێمەکانی جیهان لە ژێر باری دەستەلاتی ئەوروپادا کۆببنەوە، بەمجۆرە هەر ولاتێك کەسایەتییەکی تایبەتی خۆی وەردەگرت و هەر نەتەوەیەکی ئەوروپییش دەبوە بانگەشەکارو بەرگریکاری خۆی. جا بۆ مەبەستی تەواو هێنانەدی ئەمەش ئەم شتانە پێویست بوون:

١- کەمکردنەوەی دەستتێوەردانەکانی پاپا، تا لە کۆتاییەکەیدا توانرا دەستەلاتی پاپا لەتێکڕای کاروبارەکانی ئەوروپا بوەستێنرێ.

٢- گەڕانەوەی حکومەتەکان بۆ گەلەکانیان، بۆ دلنیا بوون لە پالپشتیکران و پارێزرانیان، ئەمەش هەرگیز نەدەکرا تەنها لە حالی هەبونی دیموکراسیەت نەبێ سەر لەنوێوە.

## سیستمی دیموکراسی نوێ لە ئەوروپا:

ئەو سیستمە دیموکراسیەی کە گەڕایەوە بۆ ئەوروپا جیاواز بوو لەو دیموکراسییەی کە پێشتر هەبوو لەمانە:

١- لەناوچەکانی ئەوروپا چەند حیزبێك دامەزران کە خەلکی ئینتیمایان بۆیان هەبوو، وە سیستەمەکەشیان سیستمی حیزبی براوە بوو لە هەلبژاردنەکان یاخود ئەو هاوپەیمانێتیانەی شوێنی دانیشتوانی ئەو شارە دەگرێتەوە کە باسمانکرد لە بابەتی سەرهەلدانی دیموکراسی دا.

---

٨ ڕەنگە نازیەت یەکێك بێت لە توندترین سیستمە نەتەوەییەکان کە لە ئەوروپا پەیدا بوو و بە کاولکاری جیهانی کۆتایی پێهات.

٢- چیتر دیموکراسیەت بەواتای فەرمانڕەوایی گەل لەلایەن خودی خۆی نەدەهات بەڵکو بەمانای فەرمانڕەوایی زۆرینەی گەل دەهات لە پەرلەمان دا، بە واتایەکی تر کەمینە دەبێ ملکەچی ڕای زۆرینە بێت و پێی ڕازی بێ.

٣-بە مەبەستی درێژەپێدانی دیموکراسیەت لە لایەن دەنگدەرانەوە کەمینە هەر دەبێ ڕازی بێ و نەیار بێت لەگەڵ ئەو یاسایانەی کە دادەڕێژرێن و کاریان پێ دەکرێ، لەگەڵ چاوەڕوانی هەڵبژاردنێکی تر سا بەڵکو تێیدا بتوانن فەرمانڕەوایی بگرنە دەست.

## هەڵوێستی ئیسلام بەرامبەر دیموکراسیەت :

بەر لەوەی بچینە سەر باسکردنی هەڵوێستی ئیسلام بەرامبەر دیموکراسیەت با ئاماژەیەك بکەین بە "شورا" لە ئیسلامدا کە کە شکلێکی کردەیی تری دیموکراسیانە نیشان دەدات.

شورا زاراوەیەکی قورئانی یە، خوای پەروەردگار دەفەرموێ {وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ} (٣٨) الشوری، واتە: ئەوانەش بەدەم بانگەوازی پەروەردگاریانەوە چوون و نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجامداوەو کاروباریان هەردەم بە مەشوەرەت و ڕاپرسی و ڕاوێژکارییە، و لەو ڕزق و ڕۆزیەی کەپێمانداون دەبەخشن.

بەڵام دیموکراسیەت بە واتای ( فەرمانڕەوایی گەل) دێت کە زاراوەیەکی لاتینیە. لە کاتێکدا کە شورا بریتیە لە مەبدەئێکی کۆششکاری "إجتهادي" کە لە چوارچێوەی شەریعەتی ئیسلام ناچێتە دەرەوە. دیموکراسیەت لە پاش شۆڕشی فەرەنسا لە ساڵی ١٨٧٩ز لکێندرا بە شکۆمەندی نەتەوە" لە گشت کاروباردا." پرەنسیپەکانی

بەڵام سیستمی شورا بە شکلێکی دیاریکراوەوە نابەسترێتەوە بە فەرمانڕەوایی یەوە، چونکە لە ئیسلامدا ئەوەی کە گرنگە ناوەڕۆکە نەك شکڵ و شێوە، وە ئێستا ئەو دیموکراسیە هاوچەرخانەی کە لە ڕۆژئاوا هەیە چەند شکڵ و شێوەیەکی دیاریکراوی وەرگرتووە کە خۆی لە سیستمی پەڕلەمانی و سەرۆکایەتی و دەستە جەمعی دا دەبینێتەوە .

سەرەڕای هەبوونی ئەو جیاوازیانە لە نێوان سیستمی شوراو دیموكراسی دا، بەلاّم هەردوكیان لە یەك ئامانجدا یەك دەگرنەوە كە ئەویش ڕەتكردنەوەی حوكمی تاكڕەوی زۆرداری و دیكتاتۆری یە، وە هەروەها بەرپرسیارێتی گەل لە هەلبژاردنی دەستەلاّتداران و چاودێری كردنیان. هەروەك چۆن لەسەر فەرمانڕەوایانی دەوڵەتی ئیسلامیش پێویستە كە ڕاوێژ بە گەل یاخود بە زانایان بكەن لە بارەی ئەو پرسانەی كە دەقێكی قسەبڕیان لەسەر نەهاتبێ لە قورئانو سوننەتدا، كە ئەمەش وا لە سەر فەرمانڕەوا پێویست دەكات كە ئازادی بداتە تاكەكانی گەل لەوبارەیەوە[9].

ئەگەر سەیری ئیسلام بكەین دەبینین مافی ڕاوێژ پێ كردنی لەسەر ئوممەتی ئیسلامی پێویست كردووە، هەر لە پێغەمبەرەوە (علیه الصلاة والسلام) هەروەك چۆن خوای پەروەردگار دەفەرموێ {فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ } (١٥٩) آل عمران، واتە: كەوابو (ئەی موحەممەد (صلى الله علیه وسلم) بەهۆی ڕەحمەتی خواوەیە تۆ نەرم و هێمن بویت لەگەلّیاندا، خۆ ئەگەر توڕەو قسە ڕەق و بێ بەزەیی بویتایە، ئەوە هەموو لەدەوروبەرت بلاّوەیان دەكرد، كەواتە چاوپۆشیان لێ بكەو لێیان ببورەو داوای لێخۆشبونیان بۆبكە، لەكارو پێشهاتدا پرس و ڕایان پێ بكە (دوای مەشوّرەت و پرس و ڕا) ئەگەر بڕیارتدا (كارێك ئەنجام بدەی، ئەنجامی بدەو) پشت بەخوا بەستە. ئەم دەقە قورئانیە زۆر بە ڕاشكاوی پێویست بوونی ڕاوێژ پێ كردن لەسەر سەرۆكی دەوڵەت دەخاتە ڕوو، چونكە مانا ڕوكاریەكەی پێویست بوونی ڕاوێژ پێ كردن دەردەخات تەنها مەگەر هۆكارێك هەبێت بۆ لابردنی ئەم حوكمە. خۆ هەرچەندە دوواندنی ئەو ئایەتە پیرۆزە (كە فەرمان بە ڕاوێژ پێ كردن دەكات) ڕوو لە پێغەمبەر دەكات (علیه الصلاة والسلام) لەگەلّ ئەو هەموو ڕێزو گەورەیی پلەو

---

٩ مبادئ العلوم السياسية ص ١٣٣

پایەی كە هەیبوو، حەوت جار پێویستتره لەسەر فەرمانڕەوایان و سەرۆكەكانی ولاَتانی ئیسلامی كە بە ڕاوێژپێكردنەوه پابەندبن.

**لێرەدا جیاوازیەكی ورد و هەستیار هەیه لە نێوان شوراو دیموكراسی دا:**

١-دیموكراسیەت ڕای چینێكی هەلَبژێردراوه، بەلاَم شورا بریتیه لە ڕای تێكڕای نەتەوه بە پێی ڕێو و شوێنەكانی شەرع.

٢-دیموكراسیەت پەرلەمانێكە كە دوای هەلَبژاردنی هیچ كەسێ ناتوانێ پەنجەی ڕەخنە ئاراستەی یەكێ لە ئەندامەكانی بكات، لە كاتێكدا شورا وەكو پەرلەمانێكە كە ئەندامەكانی ملكەچن بۆ ڕای نەتەوه.

٣-دیموكراسیەت مافی ڕەها دەداتە زۆرینە، بەلاَم شورا ڕێسای باشترین هەلَدەبژێرێ بەسەر ڕای زۆرینەدا، ئەگەر هاتوو ڕاستی لەگەلَ كەمینەدابوو ئەوا شایانتره بەوەی كە وەربگیرێ و كاری پێ بكرێ چونكە پێوەر بریتیه لە ڕاستی نەك زۆرینەو كەمینە.

٤- دیموكراسیەت هیچ پێوەرێكی واقیعیانەی نی یە بۆ ڕاستێتی چونكە ڕای زۆرینە دەستەلاَتی پەسند كردنی بڕیارەكانی هەیه، لە كاتێكدا شورا پێوەری ڕوونی هەیه كە كتێبی خوایە و هیچ ناتەواوی و نادروستی یەك ڕوی تێ ناكات لە هیچ كاتێكداو لە هیچ لایەكەوه، وه هەروەها سوننەتی پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) كە لە خۆیەوه هیچ فەرمایشتێكی نەفەرمووه مەگەر لە ڕێی سروشی خوای پەروەردگارەوه نەبێ. بەكورتی، پێوەری ڕاستێتی لە لای شورا بریتیه لە شەریعەتی ئیسلام.

لێرەوه بۆمان دەردەكەوێ كە پەیڕەوكردنی سیستمی شورا سەركەوتووتره لە پەیڕەوكردنی سیستمی دیموكراسی چونكە تێكڕای كاراكتەرەكانی دیموكراسیەت لە خۆدەگرێت و بگرە زیاتریش...، بەلَكو شورا دیموكراسیەتێكی پتەو وپوختەكراوه ئەگەر بۆشمان ڕەوا بێ كە زاراوەی دیمەكراسیەت لە بەرامبەر شورادا بەكاربێنهین چونكە دیموكراسیەت مانایەكی تایبەت

دەگەیەنێ بەو واتایەی کە گەل مافی یاسادانانی هەیە، لە کاتێکدا کە تەنها خودا(جل جلالـە) یاسادانەرە.

لە سەر ئەم بنچینەیەو هی تریش بۆمان ڕوون دەبێتـەوە کـە خـوای پـەروەردگار مەبـدەئی شورای لەسەر پێغەمبەرەکـەی (علیـه الـصلاة والـسلام) دانـاوەو، هـەروەها لەسـەر تێکـڕای نەتەوەی ئیسلام چونکە شورا دڵنیایی مـسۆگەر دەکـات و متمانـە لـە نێـو دڵـی بڕوادارانـدا دەڕوێنێــت وهەمیــشە دەیانگەیەنێتــە ڕاســتیەکان، خــوای پــەروەدگار فــەرمانی بــە پێغەمبەرمان(علیه الصلاة والـسلام) کردووە کە دڵـی هـاوەڵانی (خـوا لێیـان ڕازی بێـت) بـە یەکەوە هۆگر بکات، تاوەکو لە دوای ئەویش پەیڕەوی بکەن بـۆ هـەڵێنجانی هـەر ڕایـەك کـە پێشتر سروشی لەسەر نەهاتبێتە خوارەوە بۆ نمونە لە کاروبارەکانی جـەنگ و وردە بابـەتی تـر، پێغەمبەر (علیـه الصلاة والـسلام) لەو کاروبارانـەی کـە هـیچ دەقێکـی دیاریکراویـان لەسـەر نەهاتبووە خوارەوە ڕاوێژی لەگەڵ هاوەڵانی دەکرد چونکە بۆی ڕەوا نەبوو ڕاوێژ بکات لـە سـەر ئەو شتانەی کە دەقی قورئانی لە سەر هەبوو.

ئەو کارو بارانەی کە دەقی قورئان و سونەتیان لەسـەر هەیـە خـاڵی نـابن لـەوە کـە ئـاخۆ دەقەکە موحکەمە[١٠] یاخود ناموحکەمە، بە شێوەیەك کە هیچ مەودایەك بۆ ڕاوێژو شـورا نـی یە لە شتێکدا کە دەقێکی موحکـەمی لەسـەر هـەبێت، بـەڵکو لەسـەر ئوومـەتی ئیـسلامی پێویستە کە شوێنی بکەون و کاری پێ بکەن، بەڵام ئەگەر بێت و دەقێکی ناموحکـەم هـەبێت (زیاتر لە مانایەك لە خۆی بگرێ) پێویستە ڕاوێژپێکردن لەسەر ماناو تێگەیشتنەکەی بکرێت.

وە ئەو کاروبارانەی کە هیچ دەقێکیان لە سەر نەهاتووە ئەوا دەکرێ ڕاوێژیان لە سەر بکرێ، لەوانە: بەرپاکردنی جەنگ و بەستنی پەیماننامە و پێدانی پۆستە گـەورەکان لـە دەوڵەتـدا بـەو کەسانەی کەشـیاون، وە هـەروەها سـەرجەم کاروبـارە ئـابووری و کـارگێری و کۆمەڵایـەتی و ڕامیاریە جۆربەجۆرەکان یاخود هەر شتێکی دیکە کە دەقەکان لە خۆیان نەگرتبێت.

---

[١٠] موحکەم زاراوەیەکی فیقهی یە کە بۆ ئەو دەقانە بەکاردێ کە وەکو فەرمان هاتووە. وەرگێر

جا به‌رله‌وه‌ی بچینه سه‌ر باسی ئه‌و ولاٌتانه‌ی كه سیستمی دیموكراسی په‌یڕه‌و ده‌كه‌ن یاخود هه‌وڵی بۆ ده‌ده‌ن تێشیاندا ولاٌته ئیسلامیه‌كان، پێویست ده‌كات باسێك له باره‌ی فه‌رمانڕه‌وایی له ئیسلام بكه‌ین تاوه‌كو بزانین تا چ ئه‌ندازه‌یه‌ك مسوڵمانان پێویستیان به سیستمی دیموكراسی ڕۆژئاوا هه‌یه كه ده‌یه‌وێ به سه‌رماندا بسه‌پێنێ.

## سیستمی فه‌رمانڕه‌وایی له ئیسلامدا:

بۆ ئه‌وه‌ی له‌وه تێبگه‌ین ئیسلام به‌رامبه‌ر دیموكراسیه‌ت هه‌ڵوێستی چی یه (كه باسمان لێوه‌ی كرد) پێویست ده‌كات تیشكێك بخه‌ینه سه‌ر سیستمی فه‌رمانڕه‌وایی له ئیسلامدا. یه‌كێك له كاراكته‌ره‌كانی ئیسلام بریتیه له گشتگیری، ئه‌مه‌ش به‌و واتایه‌ی كه له ئیسلامدا چه‌ندین ڕێساو ئه‌حكام هه‌یه كه كاروباری فه‌رمانڕه‌واو هاولاٌتیان ڕێكده‌خات كه پێشی ده‌وترێ سیستمی فه‌رمانڕه‌وایی، شه‌رعزانان له‌گه‌ڵ هه‌بوونی ئه‌و ده‌قانه‌ی كه له قورئان و سوننه‌ت دا هاتوون هه‌ڵساون به كۆششكاری له زۆرێك له كاروبار و ڕێسا گرنگه‌كانی فه‌رمانڕه‌وایی دا.

**فه‌رمانڕه‌وا، جێنشین، وه‌لی ئه‌مر، پێشه‌وا:**

جێنشین(الخليفه) ناوێكه به‌و كه‌سه ده‌وترێت كه شوێنی كه‌سێكی تر ده‌گرێته‌وه یاخود جێی كه‌سێكی تر ده‌گرێته‌وه له ڕاپه‌ڕاندنی كاروبارێكدا[11]، له ڕوی چه‌مكه شه‌رعیه‌كه‌شیه‌وه به كه‌سێك ده‌وترێت كه كاروباری موسوڵمانان ڕاپه‌ڕێنێ و هه‌بوونی پێویسته له‌سه‌ر ئوومه‌ت، ئیبن ته‌ییمیه ده‌ڵێت "پێویسته بزاندرێ ڕاپه‌ڕاندنی كاروباری خه‌ڵكی یه‌كێكه له گه‌وره‌ترین پێویستیه‌كانی دین، به‌ڵكو به بێی وی دین ڕاناپه‌ڕێندرێ"[12]، ئه‌مانه‌ش به به‌ڵگه ده‌هێنێته‌وه:

---

[11] منهاج السنة النوبية لإبن تيمبة، به‌رگ١، لاپه‌ڕه١٣٧

[12] السياسة الشرعية لإبن تيمية، ١١٣٨، وه بڕوانه الإسلام والخلافة. لاپه‌ره ٢٢-٢٤

**یەکەم:** خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ{أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ} (٥٩) النساء . ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، فەرمانبەردارو گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرو فەرمانڕەواکان بن کە لەخودی خۆتانن (لە بیروباوەڕو پابەندیدا).

**دووەم:** لە سوننەتی گوفتاری دا پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ (من مات وليس في عنقه بيعة مات ميتة الجاهلية)[١٣]، واتە: هەرکەسێ مردو بەیعەتی لەگەردندا نەبوو ئەوا بەمردنێکی نەفامانە مردووە. کە ئەم فەرموودەیە بەواتای بەیعەتدان بە پێشەوا دێت، وە لە سوننەتی ڕەفتاری دا پێغەمبەری پێشەوا بە سەرجەم کاروبارەکانی دەستەڵات هەڵسا، ئەمەش بە دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی لە مەدینە و بونە سەرۆك تێیدا.

**سێیەم:** لە ئیجماعی زانایانیش دا، ماوەردی و شافیعی و ئەبویەعلای حەنبەلی دەڵێن: " لەڕاستیدا بەڵێننامەی پێشەوایەتی پێویستە لەسەر کەسێك کە بە کۆدەنگی زانایان پێی هەڵسێ"[١٤]، هەروەها ئیبن خەلدون لە (مقدمة) کەیدا دەڵێ: " دانانی پێشەوا پێویستە و پێویستبونیشی لە شەرعدا زانراوە بە کۆدەنگی تێکڕای هاوەڵاَن و تابیعین، چونکە هاوەڵاَنی پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام) لە دوای کۆچی دواییکردنی دا پەلەیانکرد لە بەیعەتدان بە ئەبوبەکر -خوا لێی ڕازی بێت- تاوەکو مشوری کاروباریان بخوات، ئا بەمشێوەیە لە هەمو چەرخ و بارێکدا پێویستیی دانانی پێشەوا نەگۆڕ بووە".[١٥]

**چوارەم:** زۆرێك لە حوکمەکانی شەریعەتی ئیسلام وەکو جیهاد و جێبەجێکردنی حەددەکانو سزادان و پەیڕەوکردنی دادگەری لەنێوان خەڵکی دا نایەنە دی ئەگەر پێشەوایەك

---

١٣ صحيح مسلم، باب وجوب ملازمة جماعة المسلمين عند ظهور الفتن، فەرموودەی ١٨٥١-بەرگی٣ لاپەرە ١٤٧٨.

١٤ الماوردي، الأحكام السلطانية ــص٣، الأحكام السلطانية لأبي يعلى الحنبلي ص٣.

١٥ مقدمة ابن خلدون، ص١٩١، هەروەها بڕوانە الإسلام والخلافة ص ١٧-١٨.

له‌ئارادا نه‌بێ خاوه‌نی هێز و ده‌سته‌ڵات بێ بۆ ڕاپه‌ڕاندنیان، ئیبن ته‌یمییه ده‌ڵێت: "وه ئه‌مه‌ش له‌به‌ر ئه‌وه‌ی خوای په‌روه‌ردگار فه‌رمان كردن به چاكه و ڕێ له‌خراپه گرتن و به‌رپاكردنی پێویستكردووه‌و، حه‌ج و جه‌ژن و بۆنه ئایینیه‌كان و سه‌رخستنی سته‌ملێكراوانیش نایه‌نه‌دی ته‌نها به‌هه‌بوونی ده‌سته‌ڵات و فه‌رمانڕه‌وایی نه‌بێ"[١٦] .

كه‌سێكیش مافی جێنشینایه‌تی پێ ڕه‌وا ده‌بینرێ كه سه‌رجه‌م مسوڵمانان له‌سه‌ر پێشه‌وایه‌تی‌و به‌یعه‌تپێدانیدا كۆك بن، به‌مجۆره پێشه‌وابونی ئیسپات ده‌بێ و پاڵپشتیكردنی پێویست ده‌بێ، خوای په‌روه‌ردگاریش ده‌فه‌رموێ: {وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ} (٧١) التوبة، واته: ئیمانداران له‌پیاوان و له‌ئافره‌تان هه‌ندێكیان خۆشه‌ویست و پشتگیرو هاوكاری یه‌كترن (كه ئه‌مه‌ش سیفه‌تیانه): فه‌رمان به‌چاكه ده‌ده‌ن و قه‌ده‌غه له خراپه ده‌كه‌ن. وه‌هه‌روه‌ها ده‌فه‌رموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُونُواْ قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ} (١٣٥) النساء، واته: ئه‌ی ئه‌وانه‌ی باوه‌ڕتان هێناوه هه‌میشه ڕاگری داده‌وه‌ری بن. هه‌روه‌ها زۆر ئایه‌تی تریش كه به‌ڵگه‌ن له‌سه‌ر به‌رپرسیارێتی كۆمه‌ڵی مسوڵمانان له جێبه‌جێ كردنی حوكمه‌كانی ئیسلام. ناشتوانرێ تێكڕای كۆمه‌ڵی مسوڵمانان ڕاسته‌وخۆ له‌گه‌ڵ ده‌سته‌ڵاتدارانیان تاوتوێی بابه‌ته‌كانیان بكه‌ن له ئه‌رزی واقیع دا، به‌ڵكو ده‌بێ په‌نا ببردرێته به‌ر "نوێنه‌رایه‌تیكردن" به‌و واتایه‌ی كه گه‌ل كه‌سانێك هه‌ڵده‌بژێرێ وه‌كو بریكارو نوێنه‌ری یاسایی بۆئه‌وه‌ی هاوكار له‌گه‌ڵ فه‌رمانڕه‌وادا مشوری كاروباره‌كانیان بخۆن.

**چۆنێتی هه‌ڵبژاردنی جێنشین یان پێشه‌وا له‌لایه‌ن ئوممه‌ته‌وه:**

مافی ئوممه‌ت له هه‌ڵبژاردنی پێشه‌وادا له بنه‌ڕه‌تدا ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ وته‌ی خوای گه‌وره: {وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ} (٣٨) الشورى، واته: وه كاروباریان هه‌میشه به مه‌شۆره‌ت و ڕاپرسی‌و

---

١٦ المغني لأبن قدامة، ح٨، ص١٠٧، هه‌روه‌ها سه‌یری المعتزلة و أصول الحكم بكه ص ٢٧ و به‌ولاوه..

ڕاوێژكارییه. ئیدی هه‌ڵبژاردنی پێشه‌وا ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ ویستی ئوممه‌ت كه چۆن چۆنی به‌وكاره هه‌ڵده‌ستێ:

١- ده‌توانن ئه‌م پرۆسه‌یه به‌شێوه‌یه‌كی ڕاسته‌وخۆ به‌ئه‌نجام بگه‌یه‌نن، به‌و واتایه‌ی كه تێكڕای تاكه‌كانی گه‌ل به‌شداری ده‌كه‌ن له هه‌ڵبژاردنی دا، ته‌نها ئه‌وانه‌ی كه هه‌لاوێر ده‌كرێن وه‌كو منداڵ و شێت و نامسولمانه‌كان.

٢- یاخود به‌شێوه‌ی ناڕاسته‌وخۆ، له‌ڕێی نوێنه‌رانه‌وه‌و به ڕێژه‌یه‌كی دیاریكراو كه له سه‌رده‌می ڕاشیدینه‌كان-كه نزیكترین چاخه بۆ وێنه‌ی ڕاسته‌قینه‌ی ئیسلام- په‌یڕه‌و كراوه.

خه‌لیفه ڕاشیدینه‌كان -خوا لێیان ڕازیبێت- له‌لایه‌ن ده‌سته‌یه‌ك له مسولمانانه‌وه هه‌ڵده‌بژێرران كه پێیان ده‌وترا ئه‌هلی "حه‌ل و عه‌قد" و مسولمانانی تریش گوێڕایه‌ڵیان ده‌كردن، نه‌ك سه‌رجه‌م مسولمانان له تێكڕای شاره‌كانی ده‌وڵه‌تی ئیسلامی دا هه‌ڵسن به هه‌ڵبژاردنیان یاخود به‌یعه‌تپێدانیان، وه‌ئه‌گه‌ر دانانی جێنشین به فه‌رمانڕه‌وا به كۆی ده‌نگ پێویست بێ ئه‌وا ده‌بێته فه‌رزی كیفایه به‌جۆرێك كه ئه‌ركی هه‌ڵبژاردنی ته‌نها له‌سه‌ر ئه‌هلی حه‌ل و عه‌قده‌و خه‌ڵكی تریش ته‌نها له‌سه‌ریان پێویست ده‌بێ كه گوێڕایه‌ڵیان بكه‌ن.[١٧]

## ئه‌هلی "حه‌ل و عه‌قد" :

كۆمه‌ڵه كه‌سێكن له ئوممه‌تی ئیسلامی كه ناسراون به پارێزكاری و دادوه‌ری، خه‌ڵكی گوێڕایه‌ڵیان ده‌كه‌ن، ئه‌وكه‌سانه پێویسته مسولمان بن و نیازپاك و پشودرێژو خاوه‌ن ڕای به‌جێ بن و شاره‌زاییان هه‌بێ له كاروباری ژیانی خه‌ڵكی دا و سوربن له‌سه‌ر پاراستنی به‌رژه‌وه‌ندیه‌كانی میلله‌ت و، وه‌كو نوێنه‌ر و بریكار (وه‌كیل) له‌بری خه‌ڵكی هه‌ڵده‌ستن به هه‌ڵبژاردنی سه‌رۆكی وڵات و میلله‌تیش ده‌بێ پابه‌ند بێت به هه‌ڵبژاردنه‌كه‌یان[١٨].

---

١٧ مقدمة ابن خلدون لاپه‌ره١٩٣، الأحكام السلطانية للماوردي لاپه‌ره١

١٨ أصول الدعوة لاپه‌ره ١٥٨

لەسەردەمی ڕاشیدینەکان دا ئەهلی حەل و عەقد دەناسرانەوە بەوەی کە خاوەنی تەقوابون و ئۆباڵیان بۆ لە ئەستۆ دەگیرا کە لە مسوڵمانە پێشینەکان بون و ئەوەیان پێ ڕەوا دەبینرا کە مشوری کاروباران بخۆن و نیازپاك بون لە ڕاپەڕاندنی کاروبارەکاندا، سەرەڕای فەزڵی هاوەڵ بونیان لەگەڵ پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام)و ستایشکرانیان لەلایەن قورئان و پێغەمبەرەوە(علیه الصلاة والسلام)..، ئەوەندەشی کە زانرابێ هیچ ڕەخنەیەك لە بڕیارەکانیان نەگیراوە.

لەسەردەمی ئەمڕۆشدا هیچ شتێك نیە ڕێگری بکات لە ئوممەتی ئیسلامی بۆ هەڵبژاردنی ئەهلی حەل و عەقد بەجۆرێك کە ئەو مەرجانەی زانایان دایانناون کە تێیاندا هەبن بێنە دی، ئەوانیش بریتین لە:

١- دادگەری بە هەمو مەرجەکانیەوە.

٢- شارەزابونیان لە زانست کە وایان لێ دەکات بگەنە ئەو ڕایەی کە کێ شایستەیە ببێ بە پێشەوا بەو مەرجانەی کە پێویستە تێیدا هەبێ.

٣- ڕای پەسند و دانایی کە ڕێ ڕۆشن دەکەنەوە بۆ هەڵبژاردنی کەسێك کە باشترە بۆ پێشەوایەتی و چاکتر مشور لە بەرژەوەندیەکانی وڵات دەخوات.[19]

ئەو خاسیەتانەی کە باسکران سەرجەم ئەمیرو فەرمانڕەواو زانایان و سەرۆکەکان و فەرماندەسەربازیەکان دەگرێتەوە، هەروەها هەر سەرۆك و بەرپرسێك کە خەڵکی بۆ کاروبارو بەرژەوەندی گشتی بگەڕێنەوە بۆ لایان[20].

١٩ بڕوانە المعتزلة وأصول الحكم، لاپەرە ١٢٨ و بەولاوە.

٢٠ تفسير المنار بەرگی ٥، ١٨١

## مەرجەكانی جێنشین یان پێشەوا:[٢١]

شەرعزانان چەند مەرجێكیان باسكردووه لەبارەی ئەوكەسەی كە ئەو پلەی پێ دەسپێردرێ، لەوانە:

١- دەبێ مسولمان بێ، وەكو خوا دەفەرموێ: {وَلَن يَجْعَلَ اللّهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلاً} (١٤١) النساء. واته: دلنیابن هەرگیز خوا نایەلێت بێباوەڕان بەسەر ئیمانداران دا دەستڕۆیشتو بن.

٢- دەبێ پیاو بێ، بەپێی وتەی خوای گەوره: {الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاء} (٣٤) النساء، واته: پیاوان سەرپەرشتیارن بەسەر هاوسەرەكانیانەوه. هەروەها فەرمودەی پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام): (لن يُفلح قوم ولوا أمرهم امرأة)[٢٢] واته: هیچ گەلێك سەرفرازو سەركەوتو نابێ ئەگەر ئافرەتێك مشور و كاروباریان هەلسوڕێنێ.

٣- دەبێ شارەزابێ له زانستی حوكمە شەرعیەكان چونكە پێویستە لەسەری جێبەجێیان بكات و بەبێ شارەزابونیش لێیان هەرگیز جێبەجێ ناكرێن. هەندێ له زانایان كۆششكاری (اجتهاد)یشیان تێدا بە مەرج گرتوه..، هەروەها دەبێ دادگەر بێ له ئایین دا و، هیچ گومڕایی و لەرێ دەرچونێكی لێ نەزانرابێ و، دەبێ شارەزابێ له كاروباری ڕامیاری و فەرمانڕەوایی دا و بەرژەوەندیەكانی ئوممەت بەهەند وەربگرێ هەولیش بدات بۆ پاراستنیان.

---

٢١ له كتێبی المعتزلة و أصول الحكم لاپەره١٥١-٢٠٠ دا گفتوگۆیەكی چڕوپڕ كراوه لەبارەی مەرجەكانی جێنشین (الخليفه)، كە دەتوانی بگەڕێەوه سەری، بەشێوەیەك كە هەر كۆمەلێك چەند مەرجێكی تری داناوه بەلام ئێمە تەنها بەوانە وازمان هێنا كە هەموویان لەسەری ڕێككەوتون.

٢٢ صحيح البخاري، باب كتاب النبي صلى الله عليه وسلم الى كسرى و قيصر، حديث ٤١٦٣، وباب الفتنة التي تموج كموج البحر، حديث ٦٦٨٦

٤- دەبێ لە قورەیش بێ، چونکە پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: (الأئمة من قریش)[٢٣] واتە: پێشەوایان لە قورەیشن. سەبارەت بەم فەرمودەیە (کە بە سەنەد و مەتنەوە صەحیحە) لێکدانەوەی زۆر کراوە، دکتۆر عەبدولکەریم زەیدان بە سود وەرگرتن لە ڕای سەرجەم لێکدەرەوەکان گەیشتۆتە ئەو ڕایەی کە ئەگەر هاتو دووکەس لە جێنشینایەتیکردن دا یەکسان بوون و، یەکێکیان لە هۆزی قورەیش بوو و ئەویتریان لە غەیری قورەیشی، ئەوا پێویست دەکات کە قورەیشیەکە هەڵبژێردرێ. وە ئەگەر هاتو قورەیشیەکە مەرجەکانی جێنشینایەتی تێدا نەهاتنەدی و ئەوەی تریان ئەو مەرجانەی تێدا هەبوون، ئەوا ئەو بەسەر قورەیشیەکەدا زاڵ دەکرێ چونکە مەبەستەکانی جێنشینایەتی بەو قورەیشیە نایەتەدی کە خاڵی یە لە مەرجەکان بەڵکو لێرەدا ئەویتریان شایستەیە و دەکرێ بە جێنشین. وەهەروەها دکتۆر زەیدان پێی وایە ئەگەر هاتو هیچ قورەیشیەك چنگ نەکەوت، ئەوا جێنشینایەتی بۆ هەرکەسێك دەبێ کە مەرجەکانی تری جێنشینایەتی تێدا بێنەدی[٢٤].

**لادانی جێنشین یان پێشەوا:**

هەرکەسێ مافی دانانی هەبێ مافی لابردنیشی هەیە، بەڵام ئەوەی دواییان پێویستە لەکاتی هەبونی هۆکارێکی شەرعی بێت، ئەگەرنا دەبێتە ناڕەوایی لەبەرامبەر حەق و شوێنکەوتنی هەواو هەوەس کە نادروستن و ڕێ پێنەدراون. هۆکارە شەرعیەکەش ئەوەیە ئەگەر بێتو جێنشین لە ئۆباڵی مشورخواردنی ئومەت بچێتە دەرەوە ئەمەش وای لێدەکات چیتر بە ئەرکی جێنشینایەتیکردن هەڵنەستێ، "چونکە جێنشین پێشەوایەو گوێڕایەڵیکردنی پێویستە ئەگەر بێتو بە کتێبی خوای گەورەو سوننەتی پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام)

---

٢٣ المستدرك علی الصحیحین – الحاکم، ذکر فضل القبائل- بەرگ٤ لاپەرە ٨٥ فەرمودەی ٦٩٦٢

٢٤ أصول الدعوه، لاپەرە ١٦٦، وەهەروەها بڕوانە الإسلام والخلافة لاپەرە ٤٧-٤٨

سەرکردایەتیمان بکات، بەڵام ئەگەر لە شتێکدا لێیان لا بدات ئەوا ڕێگری لێ دەکرێت و حەددی ڕەوای لێ دەردەکرێ، خۆ ئەگەر هەر دڵنیا نەبوین لە زیانەکانی تەنها بە لادانی نەبێت ئەوا لادەدرێت و کەسێکی تر لەجیاتی دادەنرێ"[25] هەروەها وتراوە" ئوممەت بۆی هەیە پێشەوا لابدات ئەگەر هۆکارێك هەبوو ببێتە هۆی تێکچونی بارودۆخی مسوڵمانان و هەرەسهێنانی کاروباری ئایین، هەروەکو چۆن لەسەرەتاشدا بۆیان هەبو پێشەوا دابنێن بەمەستی ڕێکخستن و بەرزکردنەوەی ئایین و کاروباری مسوڵمانان". [26]

لەهۆکارەکانی پێویستبونی لادانی پێشەوا بریتین لە: ناتەواوی لە هۆشدا، کوێری، دیل بوون لەژێر دەستی دوژمن بەشێوەیەك کە ڕزگاری نەبێ، وەکاتێ پێشەوا لادەبردرێ نابێ زیانی بەدواوەبێ بۆ ئوممەت، ئەگەر لادانەکەی زیانی زیاتر بو ئەوا لانەبردرانی پێویست دەبێ لەو حاڵەتەدا، چونکە یەکێك لە ڕێساکانی فەرمانکردن بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپە ئەوەیە کە ڕێگەگرتن لە خراپەیەك نەبێتە هۆی ڕوودانی خراپەیەکی گەورەتر.[27]

## شورا:

یەکێکە لە گرنگترین بنەماکانی سیستمی فەرمانڕوایی لە ئیسلامدا، قورئانی پیرۆز فەرمانی پێ کردووەو لە سوونەتی پیرۆزیشدا ئاماژەی پێ کراوەو تێکڕای شەرعزانانیش لەسەری کۆکن، ئەویش بریتیە لە مافێکی ئوممەت و جێنشینیش لە سەری پێویستە کە پێیەوە پابەند بێت، چونکە کەمتەرخەمی لە ڕاوێژپێکردندا دەبێتە هۆکارێك بۆ لادانی جێنشین،

---

٢٥ الملل والنحل بەرگی٤، لاپەرە١٠٢

٢٦ النظريات السياسية الإسلامية لأستاذ ضياء الدين الريس، لاپەرە ٢٧٠، هەروەها أصول الدعوه لاپەرە ١٦٦ (من المواقف الائيجي وشرحه).

٢٧ الإسلام والخلافة لاپەرە٧٢-٨١ هەروەها بڕوانە فتاوى إبن تيميه بەرگی٢٨ لاپەرە١٢٩

بەڵگەی زۆر هەیە لەسەر پێویستبوونی ڕاوێژپێ کردن(شوری) کە لە قورئانی پیرۆز و سوونەتو وتەی شەرعزاناندا ئاماژەیان پێکراوە.

١- لە قورئاندا، خوای پەروەردگار دەفەرموێ { وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ} (١٥٩) آل عمران، هەروەها خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی کردووە کە پابەند بێ بە شوراوە تاوەکو ببێتە سەرمەشق و موسوڵمانان لە دوای ئەویش پێیەوە پابەند بن.

٢- ئیسپاتکراوە کە پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام) ڕاوێژی بە هاوەڵانی دەکرد لە زۆرێك لە کاروبارەکاندا بۆ نمونە لە ڕۆژی بەدر و ڕۆژی خەندەقەکە، کە ڕاوێژی بە سەعدی کوری مەعاذ و سەعدی کوری ئەبو عبادە کرد، " هیچ کەسێکیش بە ئەندازەی پێغەمبەری خوا ڕاوێژی بە هاوەڵانی نەدەکرد"[28] .

### ئەو کاروبارانەی کە ڕاوێژیان تێدا دەکرێ:

ڕاوێژکردن لەگەڵ ئوممەتدا لەو کاروبارانەدا دەکرێ کە پەیوەستن بە دەوڵەتداریەوە، هەروەها ئەو کاروبارە شەرعیانەی کە دەقیان لە سەر نەهاتووە و پێویستیان بە کۆششکاری هەیە، بەو واتایەی کە سەرۆکی وڵات ڕاوێژ دەکات لەو کاروبارانەی ئاپین کە دەقی وەحیان لەسەر نەهاتووە، وە هەروەها لە کاروباری دونیاشدا وەکو بەڕێکردنی سوپا و هەڵگیرساندنی جەنگ و گرێدانی هاوپەیمانی و بەڵێننامەی ئاشتی یاخود دانانی خەڵکی شیاو لە پلەو پۆستەکانی دەوڵەتدا.

### ئەهلی ڕاوێژکاری:

ئەوەی کە لە سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دا هاتووە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە ئەهلی ڕاوێژکاری هەندێ جار بریتی بوون لە تێکڕای ئوممەت، هەندێك جاریش بریتیبوون لەو موسوڵمانانەی کە ئامادەبیان لەوێ دا هەبووە لە کاتی ڕاوێژکردنەکەداو، وە هەروەها پەیوەندی یان هەبوو بەو بابەتەی کە ڕاوێژیان تێدا دەکرا، یاخود هەڵدەستان بە جێ بە جێ

---

٢٨ السیاسة الشرعیة لإبن تیمیة، لاپەرە١٦٩

کردنی، هەروەها ئەو کەسانەشی کە خاوەنی ڕا بوون تێیاندا. کەسانی ڕاوێژپێ کراو لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی تر جیاوازدەبن بە پێی جیاوازی کارەکە، "بۆ نمونە پێشەوا ڕاوێژ بە زانایان دەکات لە شتێکدا کە پەیوەستە بە ئاینەوە، وە هەروەها ڕاوێژ بە کەسانی پەیوەست بە سەربازی و سوپاوە دەکات لە شتێکدا کە پەیوەندی بە جەنگەوە هەبێت، یاخود لە هەرشتێکی ترەوە کە پەیوەندی بە بەرژەوەندی خەڵکی یەوە هەبێت ڕاوێژ بە خەڵکی گشتی دەکات. لەو شتانەش کە پەیوەندیان بە بەرژەوەندی وڵات و ئاوەدانکردنەوەی هەیە پێشەوا هەڵدەستێ بە ڕاوێژکردن لەگەڵ نوسەران و وەزیرەکان و کارگوزارەکان[٢٩].

### ئەی ئەگەر سەرۆکی وڵات لەگەڵ ئەهلی شورا ڕێکنەکەوتن؟

١- دەبێ دۆزەکە بگەڕێنرێتەوە بۆ کتێبی خواو سونەتی پێغەمبەرەکەی وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموێ {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً} (٥٩) النساء. واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، فەرمانبەرداروگوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرو فەرمانڕەواکان بکەن کە لە خودی خۆتانن (لە بیروباوەڕو پابەندیدا)، خۆ ئەگەر لەشتێکدا بوو بە کێشەتان دەربارەی حوکمی خوایی، ئەوە ئەو کێشەیە بگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) - کە قورئان و سوننەت دەگەیەنێ-، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خواو بەرۆژی قیامەت هەیە، (ڕەفتارکردنتان) بەوشێوەیە چاکترین و جوانترین سەرچاوەیە بۆ چارەسەری کێشەکانتان.

٢- خۆ ئەگەر حوکمەکە بە شێوەیەکی دەقاودەق لە قورئان و سونەتدا نەهاتبوو ئەوا لێرەدا کام ڕا نزیکتر بوو لە کتێبی خواو سوونەتی پێغەمبەرەکەی ئەوا کاری پێ دەکرێ.

٣- ئەگەر هیچ کام لەم دووڕایەش نزیکی نەبوون لە کتێبی خواو سوونتی پێغەمبەر ئەوا جێنشین بۆی هەیە دەست بەڕا ی زۆرینە یان کەمینە یاخود ڕای خۆی بگرێت بە پێی ووتەی خوای پەروەردگار {وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ } (١٥٩) آل عمران.

---

٢٩ السياسة الشرعية،إبن تيمية، لاپەرە١٧٠

ڕاویژکردن پێویسته و وەکو جێبەجێ کردن نی یه، چونکه جێبەجێ کردنی بۆ سەرۆکی وڵات جێ دەهێڵدرێت چونکه ئەوه بابەتێکی کۆششکاری یەو ئـەویش ئـەو ڕایـە وەردەگـرێ کـە بـە ڕاستترینیان دەزانێت.

## مەبەستەکانی فەرمانڕوایی لە ئیسلامدا:

مەبەست لە "مەبەستەکانی فەرمانڕەوایی" بریتیه لە ئەرکەکانی فەرمانڕەوایی، ئـەمانیش بریتین لە:

**مەبەستی یەکەم: پاسەوانی کردنی ئایین، کە ئەمەش دوو مانا لە خۆ دەگرێت:**

١- ***پاراستنی:*** کە بریتیـە لـە پارێزکـاری کـردن لـە مانـەوەی ڕاسـتیەکانی و واتاکـانی و بڵاوکردنەوەیان لە ناو خەڵکی دا هەروەك چۆن پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەنجامی دا و هاوەڵانیشی لە دوایدا لەسەری بەردەوام بوون و لـەنێو خـەڵکی دا بڵاویـانکردەوە، " بـەم پێیەش پێویستە پێشەوا پارێزگاری لە ئایین و بنەماکانی بکات، کە پێشینەکانی ئـەم ئومەتـە لەسەری ڕێککەوتوون"[٣٠] .

٢- **جێ بە جێ کردنی:** ئەمەش بە پەیڕەوکردنی حوکمەکانی لە ئەرزی واقیعـدا لـە هـەموو کاروبارەکانی خەڵکی و هەروەها پەیوەندیەکانیان لە نێـوان خۆیانـداو لەگـەڵ دەوڵەتیـشدا، وە هەروەها پەیوەندی دەوڵەتی ئیسلامی لەگەڵ وڵاتـانی تـردا، پاشـان ناچـارکردنی خـەڵکی بـە مانەوەیان لە سنوورەکانی خوا و گوێڕایەڵی کردنی، وە هـەروەها ئاگادارکردنەوەشـیان لەسـەر ئەمە، ئینجا سزادانی لاڕێبوان بە سزا شەرعیەکان بۆ نەهێـشتنی گەنـدەڵی و خراپـەکاری لـە کۆمەڵگادا بەو شێوەیەی کە ئیسلام داوای کردووە. خـوای پـەروەدگار دەفـەرموێ {الَّـذِينَ إِن مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ

---

٣٠ أبو يهعلى الحنبلي، لاپەرە١١ هەروەها بڕوانه الإسلام والخلافة، لاپەرە٢٠

الْأُمُورِ} (٤١) الحج. واتە: ئەوانەی کە ئەگەر پایەدارمان کردن لە زەویدا نوێژو دروشمەکانی بەچاکی ڕادەگرن، زەکاتیش بەتەواوی دەدەن، فەرمان بەچاکە دەکەن، قەدەغە لە خراپە دەکەن، سەرەنجامی هەموو کارێکیش هەر بۆلای خوا دەگەڕێتەوە.

**مەبەستی دووەم ڕامیاری کردن بە پێی ڕێساکانی ئیسلام:**

کاری ڕامیاری بەشێوەیەك لەگەڵ بنەماکانی ئاییندا دەستبار دەبێت ئەگەر کاروبارەکانی وڵات و گەل بە شێوەیەك ڕاپەڕێندرێن کە ڕووی چاکسازیان تێدا بخوێندرێتەوە و گەندەڵی ڕیشەکێش بکرێت، وە هەروەها فەرمانڕەوایی ئیسلامی جۆرە ڕامیاریەك دەگرێتە بەر کە هەوڵدەدات کاروبارەکانی ژیان کۆکبن لەگەڵ بنەماو ڕێساکانی شەرع و دەقەکانی دا، بە بەکارهێنانی کۆششکاری دروست.

بە شێوەیەکی گشتی فەرمانڕەوایی ئیسلامی هەوڵدەدات ئەم شتانە بێنێتە دی:

١- بەرپاکردنی دادگەری لە نێو خەڵکی دا ئەمەش بەوەی کە هەر مرۆڤێك مافی خۆی وەربگرێت و لە هیچ شتێکدا ستەمی لێنەکرێت.

٢- بلاّوکردنەوەی هێمنی و ئاسایش و سەقامگیری تاوەکو خەڵکی لە گیان و ماڵ و ناموسیان دڵنیابن و بە ئاساییشەوە لەنێو دارولئیسلامدا بجولێنەوە.

٣- فەراهەمهێنانی هەرپێداویستیەك کە خەڵکی پێویستیان پێیەتی و بە نەبوونی پەکیان دەکەوێت، " لە ڕاستیدا وەلی ئەمر بۆی هەیە پیشەوەر و پیشەسازەکان ناچار بکات بە چونە سەر کار بە دەستحەقێکی دیاریکراو ئەگەر هاتوو وازیان لە کارکردن هێناو خەڵکیش پەکیان لەسەر بەرهەمەکانیان کەوتبوون"[31].

---

[31] الطرق الحكمية لإبن القيم، ص٢٢٢ وە هەروەها بڕوانە الإسلام والخلافة ص ٢٠-٢٢

٤- وەبەرهێنانی خێر و بێرەکانی وڵات، بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە ئاوو کارێز و ڕوبارەکان ببوژێنێتەوە و، ئەمەش بە بەکارهێنانی پارەی بەیتولمالەوە دەبێت، وە هەروەها کار بکات لەسەر چاککردنی ڕێ و بان و دروستکردنی پرد و چاککردنی کشتوکاڵ و بنیاتنانی کارگەکان و، هەروەها خۆش کردنی ڕێ و بان بە مەبەستی گواستنەوە ی بەروبووم و هاتو چۆکردنی خەڵکی تێیدا بە ئاسانی.

# ڕۆژهه‌ڵاتناسی (Orientalism)

لــه توێژینــه‌وه‌ی بزوتنــه‌وه‌ی ڕۆژهه‌ڵاتناســی ئــه‌وه‌مان بــۆ ڕوون ده‌بێتــه‌وه كــه چــه‌مك و كاراكته‌ره‌كانی ڕۆژهه‌ڵاتناسی ئاماژه‌ن بۆ هه‌ڵوێستی دووژمنانــه‌ی هــزری ڕۆژهه‌ڵاتناســه‌كان و بیروباوه‌ڕیان به‌رامبه‌ر به ئیسلام، هه‌ر له سه‌ره‌تای سه‌رهه‌ڵدانیه‌وه. ئه‌م چه‌مكه ڕه‌هه‌نــدی زۆر مه‌ترسیداری ڕامیاری و كه‌لتوری لێ ده‌فامرێته‌وه.

شوێنكه‌وتوانی بزوتنه‌وه‌ی ڕۆژهه‌ڵاتناسی گه‌یشتونه‌ته ئه‌و ڕایه‌ی كه ئامانجی هه‌ره گــه‌وره‌ی ئه‌و ڕۆژئاواییانه‌ی كه له بواری ڕۆژهه‌ڵاتناسی كاریانكردووه بریتیبــووه لــه نكــوڵی كــردن لــه په‌یامی ئیسلام و به درۆخستنه‌وه‌ی پێغه‌مبه‌ر(صلی الله علیه وسلم) و، وورووژانــدنی گومــان و دوودڵی له باره‌ی ئیسلام و قورئان و په‌یامی پێغه‌مبه‌ر(صلی الله علیه وسلم) وه‌كو هه‌وڵێك بۆ لێكترازاندنی ڕیزه‌كانی نێــوان موســوڵمانان و لــه دژ وه‌ســتانیان، ئه‌مــه ســه‌ره‌ڕای ئــه‌و وێنــه چه‌واشه‌كاریه‌ی كه ڕۆژهه‌ڵاتناسه‌كان دژ به ئیسلام و مسوڵمانان كێشاویانه‌و، له نێو دانیــشگا و زانكۆكانیان بلاویان كردۆته‌وه به به‌كارهێنانی هه‌موو هۆكاره‌كانی ڕاگه‌یاندن، كه كاریگــه‌ری نێگه‌تیڤی زۆر گه‌وره‌ی هه‌بووه له‌سه‌ر بڕیاره‌كانی حكومه‌ته‌كانی ڕۆژئاوا.

له ڕاستیدا ئایینی ئیــسلام بــه شــێوه‌یه‌كی زۆر ئاســان و ســه‌رنجڕاكێش بــلاو بویــه‌وه لــه ڕۆژهه‌ڵات و ڕۆژئاوای زه‌وی دا، به ئه‌ندازه‌یه‌ك كه ئێستاشی له‌گه‌ڵدابێت له‌وپه‌ڕی گه‌شه‌ســه‌ندن دایه، وه بلاوبوونه‌وه‌ی یه‌كه‌می ئیسلام زۆر سه‌رسوڕهێنه‌ر بوو، به جۆرێك كــه ڕێخۆشــكه‌ربوو بۆ كۆتاییپێهێنانی زاڵبوونی جوله‌كه به‌ســه‌ر نیوه‌دورگــه‌ی عــه‌ره‌بی و كاریگه‌ریــه‌كانی له‌ســه‌ر زۆربه‌ی هۆزه‌كانی ئه‌و نیوه‌دوورگه‌یه، وه هه‌روه‌ها ئیسلام باڵــه‌كانی ئیمپراتۆریه‌تــه‌كانی وه‌كــوو ساسانی و بیزه‌نتی و ڕۆمــانی بــڕی و تــوانی حكومــه‌تێكی ناوه‌نــدی پێكبهێنــێ كــه هــه‌موو زه‌ویه‌كانی ئیسلامی له ڕۆژهه‌ڵات و ڕۆژئاوا به دانایی و ژیری و سه‌لامه‌تیه‌وه به‌ڕێوه ببــات و

چەندین سەدە درێژە بکێشێت. ئەمە لە کاتێکدا کە جولەکەکان و گاورەکان لە هەموو شوێنێك تینیان بۆ هاتبوو، هەر ئەمەش وایکرد کە ئیمپڕاتۆرەکانی کلێسا ڕوو بکەنە ڕۆژهەلاّت بۆ فێربوونی زمانی ئەو ئایینەی کە لە زیادبووندایەو بەردەوام خەلّك شوێنی دەکەون. ئیدی دەستیان کرد بە دەستوەردان لە کاروبارەکانی ژیانی نەتەوە موسولّمانەکان بە هەموو شێوەیەکی نالەبار و نابەجێ بە جۆرێك کە هەلّسان بە ئامادەکردنی کادیری زانستی ئامانجدار بۆ ئەنجامدانی چەند لێکۆلّینەوەیەك کە پێیان دەوترا (ڕۆژهەلاّتناسی) بۆ جیاکردنەوەیان لە هەموو زانستە مرۆییەکانی تر هەروەکو دواتر دەبینین کە ئەم زانستە تایبەت بوو بە لێکۆلّینەوەی ڕۆژهەلاّتی ئیسلامی.

لە گرنگترین کاراکتەرەکانی ئەم لێکۆلّینەوانە بریتیبوون لە:

١-ئەم لێکۆلّینەوانە پەیوەندی یەکی توندو تۆلّیان هەبوو بە ئیستیعماری ڕۆژئاوا کە چالاکیەکانی لە سەدەی نۆزدە دا گەیشتبووە لوتکە.

٢- ئەو لێکۆلّینەوانە پەیوەندیان هەیە بە بزوتنەوەی تەبشیری و بەگاورکردنی ڕۆژئاوایی، کە لە ڕوخاندنی هزردا سەرکەوتنی بەدەستهێنا بەلاّم لە بەدەستهێنانی شوێنکەوتواندا شکستی خوارد.

٣- لەو لێکۆلّینەوانە هەندێ لێکۆلّینەوەی جولەکە بەدیدەکرا کە مەبەست تێیدا چەسپاندنی ئەو چەمکانە بوو کە یارمەتی زالّبونی ئابوری و ڕامیاری جولەکەی دەدا لە ناوچەکەدا.

٤- بەهۆی ئەم ئامانجانەو هۆکارە جۆربەجۆرەکانی، ئەو لێکۆلّینەوانە بەشێوەیەکی کاریگەر بەشداریان کرد لە دەرکردنی بڕیاری ڕامیاری لە ڕۆژئاوا لە دژی ئیسلام و مسولّمانان.

بێگومان لێکوڵینەوە لە قورئان و سوننەت لە بەرزو پیرۆزترین لێکۆڵینەوەکانن لە هەردوو جیهانی عەرەبی و ئیسلامی ئێستاشی لەگەڵدابێ، خەڵکی ئەم دوو جیهانە بەشێوەیەکی توندو تۆڵ پەیوەستن بە قورئانەوە چونکە ئەمە ناسنامەی ژیانیانەو، ڕۆژئاواییەکانیش هەستیان بەوە کردبو کە شوێکەوتنی قورئانی پیرۆز مەترسی هەیە لەسەر بەرژەوەندییەکانی ڕۆژئاوا لە هەموو زەمانێکدا، بۆیە پێویست بوو لەسەریان بچنە نێو ئەم دوو جیهانە لەڕێی ئەو کون و کەلەبەرانەی کە چنگیان کەوت لە ئەنجامی گۆڕانی بارودۆخی ئەوکاتە، ئیتر دەستیانکرد بە ڕەوەندنەوەی ئەو مەترسیانەی کە لەسەریان بوو لەڕێگای بە ئامێرکردنی عەقڵەکانیان. ڕۆژهەلأتناسی وەکو یەکەم هەوڵی خۆبەخشانە دەهاتە بەرچاو لەپێناو دانانی بەربەست بۆ مەترسیەکانیان..، بۆیە پێویست بو لەسەریان دڵکارانە لەدژی قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوەستن بە بەکارهێنانی هۆکاری جیاجیا، وە ئەمەش چەندین لێکۆڵینەوەی لەهەموو بوارەکانی ژیاندا بەدوای خۆیدا هێنا بۆگەمارۆدانی هەردو جیهانی عەرەبی و ئیسلامی (هەروەکو باسمانکرد) و دواخستنیان لە ڕەوڕەوەی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیایی کە ئێستا لە ڕۆژئاوا دا هەیە بۆئەوەی ڕۆژهەلأت ببێتە پاشکۆی ڕۆژئاوا.

ئەوەبوو ڕۆژئاوا لە سەرەتای ئەم سەدەیە جاڕی یەکەم جەنگی گەردونی دا لە دژی ئەوەی کە ناوی نا(تیرۆر) بەئەندازەیەك کە ئەوروپا کەڵبەکانی لە ڕقان لێککگیرکرد، بۆ نمونە سەرۆك وەزیرانی ئیتاڵیا بە خراپە باسی شارستانی ئیسلامی کرد بەوەی کە دواکەوتووە لە چاو شارستانێتی ڕۆژئاوا و تەنانەت نکوڵی لەوەش کرد کە مسوڵمانان شارستانیەتیان هەر هەبێت، دوای ئەوەی ئەم لێدوانە لەڕێی هۆکارەکانی ڕاگەیاندن بلأو بویەوە بەفەرمی داوای لێبوردنی ڕامیاریانەی ڕاگەیاند و لە ووتەکەی پاشگەز بوویەوە.

پاشان سه‌ركرده‌ی هه‌ڵمه‌تی دژه‌تیرۆری نێوده‌وڵه‌تی هه‌وڵه‌كانی به‌وه ناساند كه ئه‌مه هه‌ڵمه‌تێكی (خاچپه‌رستانه‌یه) دژی تیرۆر، وه ئه‌میش پاش بڵاوبوونه‌وه‌ی لێدوانه‌كه‌ی له ڕێی هۆكاره‌كانی ڕاگه‌یاندنه‌وه داوای لێبوردن كردو به وته‌ی خۆی ته‌نها له زوبانی ده‌رچووه.

ڕه‌نگه ئه‌وه‌ش یه‌كبگرێته‌وه له‌گه‌ڵ وته‌ی كۆڵدامائیر كه به‌ر له نیو سه‌ده به‌شداری له دامه‌زراندنی ده‌وڵه‌تی زایۆنی كرد و نكوڵی له بوونی (فه‌له‌ستین) كرد، به‌لاّم له ڕاستیدا ئه‌وه نكوڵی كردن بوو له ئیسلام و دوای ئه‌وه‌ش شه‌ڕێكی دڕنده‌ی له دژی فه‌له‌ستینیه‌كان لێ كه‌وته‌وه كه له سه‌ره‌تای ئه‌م سه‌ده‌یه گه‌یشته چڵه‌پۆپه‌ی. كه‌واته هه‌ڵمه‌تی خاچپه‌رستی ئێستاش به‌رده‌وامه‌و، ئێستاش جوله‌كه‌ی جیهانی پاڵپشتی ڕۆژئاوا ده‌كات و ئه‌ملا و ئه‌و لا ده‌كات له وه‌ستان دژ به گه‌شه‌سه‌ندنی ئیسلام، هه‌ربۆیه‌ش ڕۆژهه‌لاّتناس كار ده‌كات بۆ بره‌و پێدانی ئه‌مه‌و چه‌سپاندنی له ئه‌رزی واقیعدا.

## پێناسه‌ی ڕۆژهه‌لاّتناسی:

ڕۆژهه‌لاّتناسی به‌و پێیه‌ی كه زانستێكه[1] یاخود په‌یڕه‌و پرۆگرامێكه كه هزری ئه‌وروپا له‌سه‌ری ده‌ڕوات چه‌ندین پێناسه‌ی بۆ كراوه، هه‌ندێ جار وا پێناسه ده‌كرێ كه پرۆگرامێكی ڕۆژئاواییه بۆ تێڕوانینی شته‌كان و مامه‌ڵه‌كردن له‌گه‌ڵیان له‌سه‌ر ئه‌و بنه‌مایه‌ی كه ڕۆژهه‌لاّت و ڕۆژئاوا له بوون و مه‌عریفه‌تدا له ڕه‌گه‌وه لێك جیان. هی یه‌كه‌م ته‌واو زاڵه به‌سه‌ر هی دووه‌مدا له ڕوی ڕه‌گه‌ز و كه‌لتوره‌وه.

هه‌ندێكی تر هه‌وڵیانداوه پێناسه‌یه‌كی ئه‌كادیمی بكه‌ن بۆ ڕۆژهه‌لاّتناسی و ده‌ڵێن: ڕۆژهه‌لاّتناسی ئاماژه‌یه‌كه بۆ چه‌ند لێكۆڵینه‌وه‌یه‌كی "ئه‌كادیمی" كه ڕۆژئاواییه‌كان له وڵاته ئیستیعماریه‌كانی ڕۆژهه‌لاّت ئه‌نجامی ده‌ده‌ن به هه‌موو لق و پۆپه جیاوازه‌كانی یه‌وه، هه‌ر له

---

[1] د. ئیدوارد سعید ڕه‌تی ئه‌وه ده‌كاته‌وه كه ڕۆژهه‌لاّتناسی به زانست ناوو ببات چونكه به ڕای ئه‌و ڕۆژهه‌لاّتناسی بابه‌ته‌كان ده‌شێوێنێ و وێنه‌كان ده‌گۆڕێت شتێكی جیا كه له واقیعدا هه‌یه، بڕوانه نبیل بیهم، الإستشراق علم موضوعی أم سیاسة مقنعة لاپه‌ره١٥١

مێژوو و کەلتورو ئایینەکان و زمانەکان و باری کۆمەلأیەتی و ڕامیاری و سەروەت و سامانی و توانستەکانی و ... هتد له سەر بنەمای زاڵبوونی ڕەگەزی و کەلتوری بەسەر ڕۆژهەلأتدا وەهەروەها بە ئامانجی دەستگرتن بەسەری دا لە پێناوی بەرژەوەندی یەکانی ڕۆژئاوا و بیانووشیان ئەوەیە کە ئەو لێکۆڵینەوانە چەند توێژینەوەو بیردۆزانێکی زانستی و بابەتیانەن[٢]

ئیدوارد سعید لە کتێبەکەی "ڕۆژهەلأتناسی" پێناسەیەکی تر دەکات و دەڵێت " ڕۆژهەلأتناسی شێوازێکی ڕۆژئاواییانەیە بۆ زاڵبوون بەسەر ڕۆژهەلأتدا و، دووبارە پێکهێنانەوەو ڕێکخستنەوەی ڕۆژئاوا له ڕوی هزری و ڕامیاریەوە بە شێوەیەك کە بتوانێ دەستەلأتی به سەردا بگێڕێ".

د.أحمد غوراب بەوە پێناسەی دەکات کە " ڕۆژهەلأتناسی چەند لێکۆڵینەوەیەکی ئەکادیمی یە، ڕۆژئاواییە بێ باوەڕەکان پێی هەڵدەستن بەرامبەر ئیسلام و موسوڵمانان لە هەموو بوارەکانی عەقیدەو شەریعەت و کەلتور و شارستانی و مێژوو و خێرو بێر و توانستەکانی بە ئامانجی چەواشەکردنی ئیسلام و وەکو هەوڵێکییش بۆ لێکترازاندنی مسوڵمانان و بێئاگاکردنیان له ئایینەکەیان، هەروەها بۆ ئەوەش کە ببنە شوێنکەوتەی ڕۆژئاوا. هەوڵیش دەدەن بیانوو بۆ ئەم شوێنکەوتنە بێننەوە کە گوایە ئەوە تەنها چەند لێکۆڵینەوەو بیردۆزێکە کە بابەتیانەو زانستیانەیە، کەچی له ڕاستیدا ڕۆژهەلأتناسی بریتیە لە پێشڕەوایەتیکردن و زاڵبونی ڕۆژئاوای مەسیحی بەسەر ڕۆژهەلأتی ئیسلامیدا دا له بواری ڕەگەزی و کەلتوریدا"[٣].

لەو پێناسانەی سەرەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ڕۆژهەلأتناسی زانستیانەو بابەتیانە نی یە، بەڵکو ئەو زانستەیە کە لە زمانەکانی ڕۆژهەلأت و کەلتور و شارستانیەتەکانی و کۆمەڵگاکانی و ئێستا و ڕابردووی دەکۆڵێتەوە، وە له چوارچێوەی واتای " ڕۆژهەلأتدا" هەموو

---

٢ رؤية إسلامية لإستشراق، لاپەرە ٥

٣ رؤية إسلامية لإستشراق ، لاپەرە٧

ناوچەیەکی ڕۆژهەڵات دەگرێتەوە بەڵام سەبارەت بە خودی چەمکەکە ئەوا هەرشتێك پەیوەندی هەبێت بە لێکۆڵینەوەی زمانی عەرەبی و ئەوزمانانەی کە کاریگەری عەرەبیان لەسەرە وەکو فارسی و تورکی دەگرێتەوە.

پاشان وردە وردە لێکۆڵینەوەکان فراوانتربوون و جۆرێك لە سەربەخۆییان وەرگرت بە شێوەیەك کە بۆ هەر ناوچەیەك ناوێکی تایبەت بە خۆیان وەرگرت. هەندێکیان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە لێکۆڵینەوەی زمانی عەرەبی و ئەو شتانەی کە پەیوەندیان بە عەرەبەوە هەیە بە توێژینەوەی عەرەبی Arabestic ناوببرێن، و ڕۆژهەڵاتناسەکانی تایبەت بەمەش بە عەرەبکارەکان (مستعربین) ناوببرێن[٤].

## مێژووی ڕۆژهەڵاتناسی:

ڕوداوە مێژووییەکان سەلماندویانە کە چالاکی ڕۆژهەڵاتناسی بەردەوام لە گەشەسەندن و بڵاوبوونەوەدابووەو ئەو ئامانجانەشی پێکاوە کە لە پێناویدا دروست بووە، بەتایبەت لە سەدەی نۆزدە دا کە ئیستیعماری ڕۆژئاوا دەستی کرد بە فراوانکردنی داگیرکاریەکانی لە خاکی عەرەبی و ئیسلامیداو خستنیە ژێر چنگی خۆیەوە.

بەڵام ڕاستیە زانستیەکە ئەوەیە کە مێژووی ڕۆژهەڵاتناسی دەگەڕێتەو بۆ کاتێکی زۆر دوورتر لە سەدەی نۆزدە بە جۆرێك کە هەندێك لە زانایان وای بۆ دەچن کە ڕۆژهەڵاتناسی ڕەگو ڕیشەکانی بۆ چاخە خاچپەرستیەکان درێژ دەبێتەوە[٥] کە بە دوو قۆناغدا تێپەڕی:

**یەکەم:** ئەو قۆناغە بوو کە خەڵکی کڵێسا هەڵسان بە گواستنەوەی زانستەکانی کڵێسا و فەلسەفەی یۆنانی لە خاکی عەرەبدا (بەغدا) و ناوچەکانی تریش بۆ ڕۆما لە کاتێکدا کە کڵێسا لە سەرەمەرگی هزری دابوو. ئەو قۆناغە لە ساتە زووەکانی دەرکەوتنی مێژووی ئیسلامی بوو، یەکێك لە گەورەترین ئەو هەنگاوانەی کە عەرەبەکان پێی هەڵسان لە پاڵ

---

[٤] مناهج المستشرقين، د. سعدون محمود السامرك، د. عبدالقهار العاني

[٥] د.عرفان عبدالحميد، المستشرقون والإسلام لاپەرە٤

بلاّوکردنەوەی ئیسلام و دانانی زانستی جۆراوجۆر، هەلّسان بە وەرگێڕانی وێـژەو فەلـسەفەکانی جیهان بە تایبەتی ڕۆمانی و یۆنانی و هیندی و فارسی، هەروەها ئالّو گـۆڕ کردنـی گفتوگـۆ و بەرپەچدانەوەیان، جا یەکێك لەو زانستانەی کە هەلّـسان بـە ڕەخنـە لێگـرتن و گفتـۆکردن لـە سەری بریتیبوو لە زانستەکانی کلێسا، بێگومان هەندێ لە فەیلەسوفە مـسولّمانەکان سـودیان وەرگرت لە فەلسەفەی یۆنانی و تێکەلّکیان کرد لەگەلّ هزری ئیسلامیدا و جۆرە لێکچونێکیان لە نێوانیاندا بەدی کرد، بەلاّم لەڕاسـتیدا بـە بـێ ئـەوەی لـە گرنگـی ئـەو تێکەلّکاریـە کـەم بکەینەوە پێویستە ئەو ڕاستی یە بلّێین کە هزری ئیسلامی هیچ پێویستیەکی بـەو فەلـسەفانە نەبوو، بەلّکو بەبێ فەلسەفەش خەلّکی باوەڕیان پێ هێنابوو چونکە ئیسلام بـەبێ ئاگروئاسـن بلاّو بویەوە بۆیە فەلسەفەکان هیچ فەزلّێکیان بەسەر ئیسلامەوە نی یە، ئەگەر هیچ فەزلّێکیش هەبێت ئەوا فەزلّی ئیسلامە بەسەر نەتەوەکانی ڕۆژئاواوە، چونکە بە بێ وەرگێڕانی فەلـسەفەی ئیسلامی کە لەگەلّ هەندێك لە فەلسەفەکانی یۆنانی دا لێـك دەچـوون، کلّێـسای ڕۆمـا هـیچ توانای ئەوەی نەبوو شاکارە یۆنانی و ڕۆمانی یەکان وەربگێڕێت بە تایبەتی لەو چـاخانەدا کـە گومڕایی و تاریکی سەراپای ڕۆژئاوای گرتبوەوە. لە بەغدا لەنێوجەرگـەی مـسولّماناندا دەیـان نوسەری کلّێسا بە وەفد دەهاتن بۆ گەیشتن بە زانستە ئیسلامیەکان و پەرتوکە یۆنانی یـەکان و گفتوگۆ کردن لەگەلّ مسولّمانە عەرەبەکان بۆ ئەوەی دواتر وەری بگێڕن بۆ زمانەکانی خۆیـان و بە تایبەتیش لاتینی کە زمانی ئەو کاتی کلّێسا بوو تاکو پشتی پێ ببەستن لـە بلاّوکردنـەوەی هزرەکانی کلّێسادا، جا ئیتر دەتوانین ئەو گەشتانەیان بە شەپۆلێکی ڕۆژهەلاّتناسی نـاو ببـەین کە ئێمە مەبەستمانە چـونکە لـە گەشـتەکانیاندا زمـانی عـەرەبی فێربـوون و زانـستەکانیان گواستەوە بۆ نەتەوەکانی خۆیان، بەلاّم لە ڕاستیدا ڕۆژهەلاّتناسەکان هزرێکی چەواشەکراویان لە بارەی مسولّمانان و عەرەبەوە گواستەوە بە جۆرێك کە پێغەمبەری ئیـسلام و ئایینەکـەیان بـە

خراپترین شێوە وێناكرد، پێغەمبەریان وێناكرد بەوەی كە كاردینالێكە لە پاپا جیابۆتەوە و چاوی بڕیوەتە كورسیەكەی و كاتێكیش لە مە بێ ئومێد بووە بانگاشەی پێغەمبەرایەتی كردووە، بانگەشەی ئەوەیان دەكرد كە گوایە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)" دز و بكوژ و و كافر و ساحیر و دەجال و خائین و خراپەكارە" یاخود دەیانوت پێغومبەر(صلی الله علیه وسلم) شەیتانەو تۆقێنەرە و مردن و كاولكاری بلاّودەكاتەوە، هەروەها بانگەشەی بێ ئابڕوو یی دەكات و ئافرەت وەكو هۆكارێك بەكار دەهێنێ بۆ ڕوخاندنی كلّێسای مەسیحی و بنەماكانی ڕەوشت[٦].

هەروەها وێنەی زۆر ناشیرینیان بۆ ئیسلام دەكێشاكە گوایە لە بنەڕەتدا هەر مەسیحیەت و یەهودی یەو پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لە مامۆستاكانی وەرگرتووە كە چەند كاهینێكی جولەكەو گاور بوون، ئینجا ئیسلامیان وێنا دەكرد بە زەندیق و بگرە "كانگای زەندیقەكان" و دەیانوت فیرقەیەكی جیاكراوەیە لە كلّێسا. هەروەها قورئانی پیرۆزیان بە كتێبێكی وا دەخستە بەرچاو كە هەندێكی لەگەلّ هەندێكی تریدا تێك دەگیرێ و لە هزرەكانیدا هەماهەنگ نی یە و ناوەڕۆكەكەی ناڕێكە و بگرە هەرچی تێیدایە پێچەوانەیە لەگەلّ عەقلّ و لە كاری دەخات. " سەبارەت بە مسولّمانەكانیش ئەوا تەنها وەحشیگەر و دڕندەن و لە وەچەی شەیتانەكانن و، خەریكی كاری نێربازین و موشریكن و كۆمەلّە بتێك دەپەرستن".

قدیس یۆحەنای دیمەشقی كە لە سەردەمی خەلافەتی ئەمەوی دا لە دیمەشق ژیاوە هەموو ئەو باسانەی نوسیوەتەوەو هەندێكیان وای بۆدەچن كە لە لایەن دانەرێك بلاّو كراوەتەوە كە گوایە كاتی خۆی موسولّمان بووەو دواتر لە ئیسلام هەلّگەڕاوەتەوە و بڕوای بە مەسیحیەت هێناوە، ناویشی عبدالمسیح كوڕی ئیسحاق بووە، كەئەوەبو دواتر ئەو ڕۆژهەلاّتناسانەی كە بە

---

٦ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٦

کاری تەبشیری مەسیحی هەڵدەستان دووبارە هەڵسان بە بڵاوکردنەوەی لە سەدەی نۆزدە لە لەندەن[٧] لە پێناوی ئامانج و مەبەستەکانیان کە بریتیە لە تیر و توانجگرتن لە ئومەتی عەرەبی و کەلتورەکەی، بێگومان ئەم درۆو هەڵبەستنانەش یارمەتیداون لە وروژاندنی ڕق و کینەی گەلانی مەسیحی بەرامبەر عەرەب و مسوڵمانەکان ئەمە سەرەڕای هەندێ ڕوداوی تریش کە کڵێسا قۆستیەوە بۆ بەگژوەنانی گەلانی خۆی لە دژی وڵاتانی عەرەبی لە جەنگە خاچپەرستیەکان کە دوو ئامانجی سەرەکی هەبوو:

١- داڕوخاندنی بنەماکانی ئیسلام و کۆتایی هێنان بە ڕۆڵە بەرچاوەکەی کە ئەوکات دەستەلاتی بەسەر ڕۆڵی کڵێساشدا کێشابوو.

٢-دۆزینەوە ئیستیعماریەکان لەخاکی عەرەبدا، تاوەکو ناوەندەکانی فەرمانڕەوایی خۆیان بگوازنەوە بۆ ئەوێ دوای ئەوەی ململانێکە لە نێوان میر و پاشاکانی ئەوروپا لەگەڵ پاپای ڕۆما لە سەر دەستەلات توند بوبوو.

بەر لەوەی بێینە سەر قۆناغی یەکەمی ڕۆژهەلاتناسی پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە لێکۆڵینەوە ڕۆژئاواییەکان لەسەر بارودۆخی دوورگە عەرەبیەکان یاخود ڕۆژهەلات بە کاتێکی زۆر بەر لە سەردەمی خاچپەرستی ئەنجامدراوە بۆنمونە بەپێی ڕای مێژوو نوسان دەستگیراوە بەسەر پەرتوکی دانەرێکی ڕۆژئاوایی کە ناوەکەی نەزانراوە بە نێوی (گەشتێك بە دەوری دەریای ئەریتێریدا) کە بە پێی ڕای دکتۆر جواد علی ئەم کتێبە دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی سەدەی یەکەمی زایینی.[٨]

---

٧ هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٩-١٠

٨ د.عبدالجبار ناجي، تطور الإستشراق في دراسة التراث العربي، ص١٣

وە هەروەها چەندین زانیـاری چڕ و پـڕ لـە سـەر کەنـداوی عـەرەبی وەدەسـتهێندراوە لـە کتێبەکانی ( فیلافوس ئاریان)ی یۆنانی لەسەر هەڵمەتەکانی ئەسکەندەری گەورەو گەشـتەکانی سەرکردەی یۆنانی (نیرخۆس) و سەرکردەی ئەسکەندەر لە کەنداوی عەرەبی نوسیووە، بە هەمان شێوە مێژو نووس (سترابو) هاوەڵایەتی هەڵمەتی لیوس گالیوس ی کردووە.

**دووەم:** ئـەو قۆناغەیـە کـە هـەموو مێژوونوسـان لەسـەری کـۆکن بـەوەی کـە قۆنـاغی ڕاستەقینەی بزوتنەوەی ڕۆژهەلاتناسی یە بەو مانا زانستیەی کـە بەسـەری دا بڕدراوە،کـە بـە ڕوونی لە کۆتایی سەدەی حەڤدە سەری هەڵدا، ڕۆژهەلاتناسەکان خزمـەتیان بـەم مەبەسـتانەی خوارەوە کرد:

## ١- تەبشیر :

تەبشیر بریتیە لەو هەوڵ و کۆششانەی کە لە لایـەن کڵێـساکانی مەسـیحیەتەوە دەدرێ بـۆ بانگەشەکردن بۆ ئاینی مەسیحی، کڵێسا چالاکانە هەڵسا بە ناردنی ئەندامەکانی بۆ چـەندین ناوچەی جیاجیای ئەفریقا و ئاسیا و بە تایبەتیش لە ناوچەکانی عەرەبی وەکو باکوری ئەفریقاو سـوریا و لوبنـان و هەنـدێ ناوچـەی تـری دورگەکـە، ئـەو ئەندامانـە لـە بـوارە کـەلتوری و کۆمەلایەتی و ڕامیاریەکانی خۆیاندا زیـاتر سـەرکەوتنیان بـە دەسـت هێنـاوە وەك لـە بـوارە ئایینیەکەیان چونکە مسوڵمانان ڕێگە نادەن کە موژدەدەرەکان هەڵـسن بـە بانگەشـەی ئـاینی یـان، ئەمـە سـەرەڕای ئـەوەی پیـاوانی کڵێـسای ڕۆژئـاوا شکـستیان خـوارد لـە گـۆڕینی موسوڵمانەکان بۆ مەسیحی بە جۆرێك کە وایان لێ هات هەڵسن بە پلار و توانج گرتن لێیان و گواستنەوەی کەلەپوریان بۆ ئەوروپا بە وێنەیـەکی شـێوێندراو کـە لـە ڕاسـتیەوە دوورە، هـەر ئەمەشە وای لە ئەوروپیەکان کردووە کە بە چاوی بوغز و کینەوە سەیری عەرەب و مـسوڵمانان بکەن و وێنەیان ناشیرن بکەن و سیفەتی نەشیاو و قێزەونیان بدەنە پاڵ.

بوونی موژدەدەرەکان لە خاکی عەرەبدا هەلێکی گەورەبوو بۆ برەوپێدانی تواناکانیان لە زماندا، بە ئەندازەیەك توانیان توێژینەوە بکەن لەسەر زمانی عەرەبی دایك نەوەك شێوەزارە خۆماڵیەکان، وە هەندێکیان زۆر گرنگیان دا بە کەلەپووری عەرەبی و لەو بوارەدا ناوبانگیان لە ڕۆژهەڵاتناسیدا دەرکرد.

لە هەرە کۆنترین موژدەدەرەکان ڕۆژهەڵاتناسی ئینگلیز (هێنری بریدۆ)یە کە کاهینێك بوو لە (نورویچ) لە بریتانیا ساڵی ١٦٨١ ز وکتێبێکی لەسەر پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) نوسی، هەروەها (سیمۆن ئۆکلی) کە ڕۆژهەڵاتناسێکی ئینگلیزیە و کتێبێکی بە دوو بەرگەوە دانا لەسەر مێژووی عەرەب هەروەها( قەسیس سوانسی) لە کامبریدج لە ئینگلتەرا لە ساڵی ١٧٢٠ز و جاکنیزی ڕۆژهەڵاتناسی فەرەنسی کە کتێبێکی نوسی لە سەر ژیانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بە پشت بەستن بە کتێبی (المختصر فی الأخبار البشر)ی ئەبولفیدا چاپی ١٧٢٣ز.

لە موژدەدەرە ڕۆژهەڵاتناسە هاوچەرخەکانیش: ( جاك جومیا) و(باوك لویس کاردیت)، کە مامۆستای لاهوت و فەلسەفە بوون لە پەیمانگای تولوز لە فەرەنسا، هەروەها (باوك لامانس)و (سامۆئێل زوەیمەر)ی ئەمریکی و هی تریش.

پێویستە ئەوەش بزانرێت کە زۆرێك لە موژدەدەرەکان بە تایبەتی ڕۆژهەڵاتناسەکان لە ڕوی ئاینیەوە لە ناوچەکانی عەرەبی شکستیان هێنا، بەڵام خزمەتێکی بەرچاویان بە ڕۆژئاواکرد بە گواستنەوەی زۆر وورد وچڕو پڕ لەسەر هەر شتێك کە توێژینەوەیان لەسەر کردووە لە ڕۆژهەڵات لە سیفەت و ڕەوشتی عەرەب و ئەو پاڵنەرە کۆمەڵایەتیانەی کە بە یەکەوە گرێی داون و هەروەها ئەو شتانەی کە پەیوەندیان بە ژیانی ئابووری و ڕامیاری و کەلتوریانەوە هەیە یاخود هەر کون و کەلەبەرێك کە ئیستیعمار لە ڕێیەوە دەتوانێ دەستی خۆی تێکەڵ بە ژیانیان بکات،

بە مانایەکی تر ئەو ڕۆژهەلاتناسیەی کە موژدەدەرەکان پێی هەڵدەستان گرنگیەکی زۆری هەبووە بۆ هەر توێژینەوەیەك کە ئیستیعمار پێویستی پێ بووە بۆ زانینی لەبارەی نیشتیمانی عەرەبەوە، ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی ترەوە ڕۆژهەلاتناسە موژدەرەکان ڕەوشت و ئاکاری ڕۆژئاواو کەلتور و شارستانیەتەکەیان لەگەڵ خۆیان هێنا بۆ گەلانی عەرەبی و بە تێکەڵبوونیان لەگەڵ گەلانی عەرەبدا خەڵکی بە جۆرێك لە جۆرەکان کرانەوە بە بیری ڕۆژئاوایی دا، وە ئەوەش وایکرد کە کلتوری ڕۆژئاوا بە نێویاندا بلاّببێتەوە و ڕێخۆشکەر بوو بۆ دەست تێوەردانی ڕۆژئاوا لە ژیانیاندا، دەشتوانین ڕۆلی موژدەدەرە ڕۆژهەلاتناسەکان لە سێ شتدا پوخت بکەینەوە:

**یەکەم:** لێکۆڵینەوەکانیان جۆرێك بوو لە چەواشەکردنی ئیسلام لە ئەوروپا و کەرستە خاوەکانیشیان بریتیبون لەو کتێبە کۆنانەی کە ڕۆژهەلاتناسە پێشینەکان دایاننابوون، هەروەکو باسی ئەوەشمانکرد کە چ ڕۆڵێکیان هەبوە لە ماوەی جەنگە خاچپەرستیەکان و دوای ئەویش.

**دووەم:** ئەو لێکۆڵینەوانە شکڵێکی مەنهەجییان وەرگرتبوو بۆ هزری ڕۆژئاوا، سەرەڕای ئەوەی کە وایان پیشاندا کە مەبەست لێی تەنها خستنە ڕووی ڕاستیەکانە، کەچی دواتر زۆر لە ڕۆژهەلاتناسەکان هەستیان بە بوونی تێکگیران (تناقض) دەکرد تێیاندا.

**سێیەم:** داپۆشین و لێڵکردنی کەش و هەوای ڕۆژهەلاتناسی بە ڕق و کینەیەکی شاراوە دژ بە ئیسلام و بە تایبەتی گەلانی عەرەبی، لەگەڵ ئەوەی کە بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە ڕۆژهەلاتناسی خالّی بێت لەو شتانە و، بابەتیانەو زانستیانە بێت.

هەندێك نمونەشمان هێنایەوە لەو بارەیەوە کە چۆن کلتوری ئێمەیان بە کەم گرتووە و چەواشەکاریان تیا کردووە هەر لە پیرۆزیەکانی ئوممەتی ئیسلامی و گەورەیی یەکەی و هەروەها تواناکانی گەلانی عەرەب لە هەڵسانەوەیان، ئەوان تەنها هەڵدەستان بە وەرگرتنی شکڵ و وێنەی دەرەکی بابەتەکان بە بێ ئەوەی بچنە قولاّیی بابەتەکان و لەو هۆکارانە بکۆڵنەوە کە ئەو شتانەی ئێستایان وەدی هێناوە، کاتێك کە باسی خێزانەکانی پێغەمبەریان دەکرد(صلی

الله عليه وسلم)، پێغه‌مبه‌ریان به شه‌هوه‌تباز ناوده‌برد و گوایه بانگه‌شه‌ی خراپه‌كاری ده‌كرد و، هه‌روه‌ها له‌به‌رئه‌وه‌ی پێغه‌مبه‌ر(صلی الله علیه وسلم) چه‌ندین خێزانی هه‌بووه‌و به‌وه‌ش وه‌سفیان ده‌كرد كه پێغه‌مبه‌ر(صلی الله علیه وسلم) ویستویه‌تی كڵێسای مه‌سیحی پێ بڕوخێنێ و ڕه‌وشت دابڕمێنێ، ئه‌وه‌یان له‌بیر خۆیان بردبۆوه كه فره‌ژنی له سه‌ده‌ی یه‌كه‌می مه‌سیحیه‌تدا هه‌بووه‌و كڵێسا له سه‌ده‌ی دووه‌مدا قه‌ده‌غه‌ی كرد، ئۆگه‌ستین كه مێژوونوسی كڵێسا بوو، هێرش ده‌كاته سه‌ر "ترتۆڵیان" كه یه‌كێك بووه له هه‌ڵسوڕێنه‌رانی كڵێسا له سه‌ده‌ی یه‌كه‌م به‌وه‌ی كه یازده ژنی هه‌بووه.

هه‌ر به‌وه‌ش نه‌وه‌ستان كه ته‌نها هێرش بكه‌نه سه‌ر پێغه‌مبه‌ر (صلی الله علیه وسلم) به‌ڵكو ڕووی دوژمنكارانه‌یان كرده قورئانی پیرۆز و به‌وه وه‌سفیان ده‌كرد كه له ڕه‌گ و ڕیشاڵی مه‌سیحیه‌ت و جوله‌كه دروست بووه و پێغه‌مبه‌ر(صلی الله علیه وسلم) له كاهین و ڕاهیبه‌كانی جوله‌كه وه‌ریگرتووه... وه كاتێكیش كه ده‌هاتنه سه‌ر ته‌فسیركردنی ئایه‌ته‌كانی قورئانی پیرۆز هه‌ڵده‌ستان به وه‌رگێڕانی ئه‌و وشانه‌ی كه له زمانه‌كانی خۆیان زیاتر له مانایه‌كیان هه‌ڵده‌گرت و به‌و مانایه‌ش وه‌ریانده‌گێڕا كه ڕێك ده‌هاته‌وه له‌گه‌ڵ ئامانجه‌كانی ته‌بشیری خۆیان، به بێ ئه‌وه‌ی بگه‌ڕێنه‌وه سه‌ر ته‌فسیره‌كانی ڕاڤه‌وانانی موسوڵمان تا سود له واتاكانیان وه‌رگرن[٩].

## ئامانجه‌كانی ته‌بشیری:

د. محمد حاج ده‌ڵێ ته‌بشیری به دوو قۆناغدا تێپه‌ڕیوه:

**قۆناغی یه‌كه‌م:** هه‌وڵدان بۆ به گاور كردن، به‌ڵام پاش چه‌ندین سه‌ده شكستی هێنا، بۆیه‌ش ته‌بشیری ده‌ستی كرد به قۆناغی دووه‌م.

**قۆناغی دووه‌م:** دورخستنه‌وه‌ی موسوڵمانان له ئایینه‌كه‌یان، ئه‌مه‌ش ئه‌وه ده‌رده‌خات كه ته‌بشیر په‌یوه‌ندی چه‌نده زۆره به ئیستیعماره‌وه.

---

[٩] أفاض الدكتور محمد صالح البنداق له كتێبه‌كه‌ی ( المستشرقون و ترجمة القرآن الكريم) له باسكردنی ئه‌و نمونانه‌ی كه سوكایه‌تی به وه‌رگێڕانی قورئانی پیرۆز ده‌كه‌ن.

موژدەدەرەکان خۆری ئیستیعمار بون و وەکو چاو بەنرخ بون بۆی، موژدەدەری ئەمریکی " جاك مەندلسۆن" دەڵێ " هەوڵی چالاك خراونەتە گەڕ بۆ ئەوەی موژدەدەرەکان بەکاربهێنرێن بۆ بەرژەوەندی ئیستیعمار نەك تەنها بۆ بەرژەوەندی ئایینی مەسیحی".

ناپلیۆنیش دەڵێ " ئەو پیاوە ئایینپەروەرانە دەبنە پاڵپشتیەکی گەورە بۆ ئێمە لە ئاسیاو ئەفریقیا و دەیاننێرم بۆ ئەوەی زانیاری لە تێکڕای ناوچەکان کۆبکەنەوە، جل و بەرگیان دەیانپارێزێ و هەر نیازێکی ئابوری و ڕامیاریشیان دەشارێتەوە"[١٠].

## ئامڕازەکانی تەبشیری:

مامۆستا محمد حاج دەڵێ موژدەدەرەکان بۆ هێنانەدی ئامانجەکانیان چەندین هۆکار و ڕێچکەیان گرتۆتە بەر و لە چەندین بواری جۆراو جۆردا کاریان کردووە، لە گرینگترین ئەو بوارانەی کە کاریان تیا کردووە (کە هەندێکیانمان لێ باسکرد) ئەمانەن:

١-**خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی:** مژدەدەرەکان پشت دەبەستن بە دروستکردنی دەزگای خێرخوازی بە مەبەستی جۆراوجۆر لەو وولاتانەی کە ڕویان تێ دەکردن، بە ئەندازەیەك کە ئەو دەزگایانە هەڵسان بە پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری سەرەتایی وەکو بەخشینی خواردن و جل و بەرگ بە ئیستیغلال کردنی حاڵەتی هەژاری و کارەساتە سروشتی یەکان، لە چەندین شوێنی جۆراوجۆر کاریان دەکرد و بەرگەی چەندین بارو گوزەرانی سەخت و دژواریان دەگرت لە دۆڵەکان و لادێکان و جەنگەڵ و دارستانەکان و شارەکان و خێوەتگاکان لە کاتی جەنگ و ئاشتی دا، ئێستاشی لەگەڵدابێت لە هەموو خێوەتگا بەربلاوەکانی وولاتە ئیسلامیەکاندا سەرقاڵی کارکردنن.

١٠ الرب والله و جوو، جاك مەندلسۆن، وەرگێڕانی إبراهیم سعد، قاهیرە، لاپەرە٢٠٩

٢- **بواری فێرکاری و ڕۆشنبیری:** گرنگیەکی زۆریان دەدا بە فێرکردن لە هەموو قۆناغە جیاجیاکاندا، هەر لە باخچەی ساوایانی منالأنەوە تا زانکۆکان، هەر لەگەڵ وەسەرپێکەوتنی منداڵەوە خەریکی دەبوون بۆ ئەوەی بەرەو ئامانجەکانی خۆیانی ڕاپێچ بکەن بە ئیستیغلالکردنی منداڵێتیەکەی و هەروەها نەخوێندەواری و پێویست پێ بوونی خێزانەکەی. ئیدی هەڵدەستان بە دانانی پرۆگرامی گونجاو بۆ بەدی هێنانی ئەو ئامانجەیان و لەگەڵ ڕۆژهەڵاتناساندا دەستبار دەبوون لە قۆناغی زانکۆدا.

سەبارەت بە پەیمانگا و مەڵبەند و یانە ڕۆشنبیریەکان ڕێژەیەکی زۆر لەوانە هەن کە هەڵدەستن بە ڕۆڵی تەبشیری، جا چ سەر بە زانکۆ و دەزگا ڕۆشنبیریە فەرمیەکان بن یاخود کۆمەڵە کەلتوریەکان وە یانیش ڕاستەوخۆ سەر بە ڤاتیکان یان ئەنجومەنی کڵێسای جیهانین لە جنێف.

٣- **بواری تەندروستی:** لەوبوارەدا هەڵساون بە کردنەوەی ئەو نۆرینگەو نەخۆشخانانەی کە ڕۆڵەی موسوڵمانان ڕویان تێ دەکەن بۆ پێداویستیەکانیان،چونکە لە زۆربەی حاڵەتەکان هیچ بەدیلێکیان نی یە. جا موژدەدەرەکان هەڵدەستن لە بوارەکانی تەندروستی و نەحۆشەوانی دا نۆرینگەو نەخۆشخانەکان بەکاردێنن وەکو هۆکارێك بۆ تێکەڵبونیان و گفتوگۆ کردن لەگەڵ خەڵك. هەروەها هەڵدەستن بە پیشاندانی سۆز و ڕوخۆشی لە مامەڵەکردن لەگەڵ نەخۆشەکاندا چونکە بەگشتی نەخۆش پێویستیەکی زۆری بەو گرنگی پێدان و نیشاندانی هاوسۆزی یە هەیە، جا بەو هۆیەو بەم ڕەوشتە ساختەیە کاریگەر دەبن و هەڵدەخەڵەتێن. گوێ بگرە لە یەکێك لە موژدەدەرەکان کە ئامۆژگاری پزیشکێك دەکات کە بە نیازە بۆ کاری تەبشیری بچێت، پێی دەڵێ "پێویستە لەسەرت هەر هەلێك بقۆزیەوە بۆ گەشتن بە گوێی مسوڵمانان و دڵەکانیان، موژدەیان پێ بدەیت بە ئینجیل، نەکەی بە هیچ جۆرێك هەلی پزیشکایەتی لە نەخۆشخانەکان

له کیس بدەیت بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە، چونکه ئەم هەلانه به نرخترین هەلن که جارێکی تر دەستت ناکەوێتەوە، ڕەنگه شەیتانیش له خشتەت ببات و بێت بلێت ئەرکی سەرشانی تۆ تەنها پزیشکایەتی یه نەك کاری تەبشیری، سا گوێی لێ نەگری"[11].

ئەگەر ڕێککەوت سەردانی یەکێك له نەخۆشخانه تەبشیریەکان بکەیت ئەوا زۆر به ئاسانی نیشانەی خاچ و ئینجیل له سەر هەموو قەڵەوێرەیەك دەبینی، وه هەروەها دەبینی که سستەرەکان جل و بەرگی ڕاهیبەکانیان لەبەره و ڕۆژانه هەڵدەستن به ئامۆژگاری کردنی نەخۆشەکان، بێگومان هەموو ئەمانه وێنەی ڕۆژئاواییەکان لای مسوڵمانان جوان دەکەن و وا دەردەخەن که ئەوان مرۆڤانێکی ئاکاربەرزن جیا لەو وێنه ڕاستەقینەیەی که له ماوەی جەنگه خاچپەرستیەکان پێیەوه دەرکەوتن و ئەمڕۆش له جەنگی ئاشکرا و نهێنیان ئەنجامی دەدەن بەرامبەر جیهانی ئیسلامی.

٤- **بواری ڕاگەیاندن:** له ڕاستیدا موژدەگارەکان هەموو هۆکارەکانی ڕاگەیاندنی بینراو و بیستراو و نوسراویان قۆستۆتەوه بۆ پەخشکردنی پروپاگەندەو ژەهرەکانیان، بۆ ئەم مەبەستەش چەندین گۆڤار و ڕۆژنامەیان دروست کردووه و وێستگەکانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنیان داگیرکردوه و چەندین فیلم و کاسێتی جۆراو جۆریان بەرهەمهێناوه، هەر لەم ڕێیەوه چونەته نێو جیهانی کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت و چاپخانه و بلاّوکردنەوه. هەروەها هەڵساون به دەرکردنی چەندین کتێب و بلاّوکراوه و به کارهێنانی پۆسته و گەیاندن بۆ ناردنیان، لەم پێناوەشدا به ملیاران پارەیان سەرفکردووه لەو پارانەی که له هەموو گەلانی ڕۆژئاوای کینه له دڵ دژ به مسوڵمانان کۆی دەکەنەوه.

---

[11] الإستشراق والتبشير و صلتهما بالإمبريالية العالمية، إبراهيم خليل أحمد لاپەره ٣٩

موژدەدەرەکان هەڵساون بە دەرکردنی ئەو کتێب و بلاوکراوانە و دانراوانەی کە ئامۆژەکانی[١٢] ئایینی مەسیحیەت بەسەر ڕۆڵەکانی مسوڵمانان بە پیرۆزیەوە دەسەپێنێت.

له بواری ڕاگەیاندنی بیستراویشەوە هەڵساون بە دانانی چەندین پرۆگرامی ڕادیۆیی بە گاورکردن، بۆ ئەم مەبەستەش سەدان وێستگەیان تەرخانکردووە بە هەموو زمانەکانی ولاتانی ئیسلامی بە تایبەتی لە ئاسیا و ئەفریقیا. هەر بە کورتی لە نمونەی وێستگەکان: وێستگەی مۆنتیکارلۆ و (ساعة لإصلاح) لە خەرتووم، وە وێستگەی (المحبة و الوفاء) لە بەیروت و (نداءالرجاء) لە ئەڵمانیا.

ئەمە سەرەڕای چەندین کۆنگرەو کۆبونەوەش کە لەو سۆنگەیەوە گرێدراون، بۆ نمونە: لە نێجیریا کۆبونەوەیەك کرا کە نزیکەی چل گەورە پیاوی ئەفریقی لۆسەری و چەندین بەڕێوەبەری ئێستگەی ڕادیۆ و پیاوانی ڕاگەیاندن تێیدا بەشداریان کرد لە پێناو چڕکردنەوەی هەوڵەکانیان بۆ گەشەپێدانی شێوازی ڕادیۆکانی بە گاورکردن لە ڕۆژئاوای ئەفریقیا، هەروەها لە تەنزانیا لەساڵی ١٩٨١ کۆبوونەوەیەکی تایبەت سەبارەت بە ڕۆژهەلاتی ئەفریقیا گرێدرا[١٣].

ئەمرۆش کاری تەبشیری چەندین وێستگەی تەلەفزیۆن و ئاسمانی بەکار دەهێنێ بۆ هەمان مەبەست و ڕوو لە تێکڕای جیهان دەکات، گرنگترینیان بریتیە لە وێستگەی ئاسمانی یەکەمی مەسیحی لە ڕۆژهەلاتی لە سەر مانگی دەستکردی ئەوروپی. SAT٧ ناوەڕاست و باکوری ئەفریقیا

**٥- بواری کۆنگرەو نێردراوە تەبشیریەکان:**

بۆ هێنانەدی پلانەکانی بە گاورکردن چەندین کۆنگرەی بە گاورکردن گرێ دراون بۆ لێکۆڵینەوە لە پلان و چالاکیەکانیان و هەروەها ئەو کێشانەی کە بزوتنەوەی تەبشیری جیهانی دووچاری دەبێت، لە گرنگترین ئەو کۆنگرانەش: کۆنگرەی قاهیرەی بەگاورکردن ١٩٠٦ کە لە

١٢ تعاليم (وەرگێر)

١٣ نذير حمدان، الغزو الثقافي لاپەڕە ١٢٤

ماڵی سەرکردەی شۆڕش (أحمد العرابی) گرێدرا، لەم کۆنگرەیەدا باس لە ئەزهەر و ڕۆڵی کرا لە جیهانی ئیسلامی و پێویستی لاوازکردنی و بە گژوەستانی خرایە ڕوو، وە سکرتێری کۆنگرەکە داوای کرد کە پەیمانگایەکی مەسیحیی بۆ بە گاورکردنی ناوچەکانی موسوڵمانان بنیات بنرێ، پاشان کۆنگرەکە هەڵسا بە خستنەڕووی نەخشەیەکی بە گاورکردنی جیهانی ئیسلامی لەم چەرخەدا، قەشە زوەیمەر کە سەرۆکی کۆنگرەکەبوو پەرتوکێکی بە ناونیشانی "جیهانی ئیسلامی ئەمڕۆ" پێشکەش کرد، کە چەند ئامۆژگاریەکی لەخۆگرتبوو لە نێویاندا ئەوەبوو کە پێویستە مسوڵمانان وا خاڵی بکرێن کە مەسیحیەکان دوژمنیان نین، وەپێویستە مسوڵمانان بە گاور بکرێن لە ڕێی نێردراوێك لە خۆیانەوە چونکە پێویستە دارەکە لە یەکێك لە لقەکانی کرم بگرێ.

وە هەروەها کۆنگرەی لاکنهۆ کە لە هندستان گرێدرا لە ساڵی ١٩١١، لە گرنگترین ئەو بابەتانەی کە لەو کۆنگرەیەدا باسکرا بریتیبوون لە چاوخشاندنەوە بە بزوتنەوەی کۆمکاری ئیسلامی و، چەند بڕیارێکی دەرکرد لەوانە دامەزراندنی قوتابخانەیەکی تایبەت بە تەبشیری لە میسر و بەشداری پێکردنی ئافرەتان لە کاری تەبشیری[١٤] .

## ٢- ئیستیعمار:

لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە ڕۆژهەلاتناسەکان بە کۆن و نوێیانەوە بە شێوازی جیاجیا خزمەتی ئیستیعماریان کردووە.. پێشتر ئاماژەیەکمان کرد بە دەرکەوتنی نوسراوێك لەسەر دەریای ئەریتێری لە سەدەی یەکەمی زایینی دا، پاشان چەند لێکۆڵینەوەیەکی تر کە لە سەر واقیعی عەرەب لە چاخە خاچپەرستیەکاندا کرابوو چەندین هەڵمەتی دڕندانەو سەختی کردبووە سەر ئیسلام و هەموو کەلەپووری عەرەبی بە گشتی.

---

١٤ د.علی جلایشة و محمد شریفق الزیبق، أسالیب الغزو الثقافي للعالم الإسلامی، دار الإعتصام، بڕوانە محاضرات في الثقافة الإسلامیة، لاپەرە ٢٥٩-٢٦١

هەروەها چەندین لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری و ستراتیژی کراون کە هاوکاتبوون لەگەڵ هەڵمەتی ئیستیعماری پورتوگال لە سەر کەنداوی عەرەبی و دەریای سوور.. ، وەکاتێك ئەوروپا لە ڕووی ئابوریەوە بوژایەوە و بووە خاوەنی چەندین کەشتیگەلی جەنگی بەهێز، پاشاکانی ئەوروپا هەڵسان بە ناردنی زاناکانیان بۆ وڵاتانی عەرەبی بە مەبەستی توێژینەوەی بارودۆخ و کەلەپوریان. لە پاڵ ئەو هەڵمەتە بە هێزەیان فێری زمانی عەرەبیش بوون، بە ئەندازەیەك کە تەنانەت پیاوانی کڵێسا خۆیان داوایانکرد کە مەڵبەندی فێربوونی زمانی عەرەبی لە زانکۆ جیاجیاکانیانی ئەوروپا بکرێنەوەو ئەوەبوو دواتریش وردە وردە تەشەنەی کرد. ئینجا کڵێسا (کە خۆی لە خۆی دا جۆرێکی تر بوو لە زانکۆ) خۆبەخشانە هەڵسا بە خزمەتکردنی مەبەستەکانی ئیستیعماری ئەمەش لە ڕێی ناردنی نێردراوەکانیان بۆ توێژینەوەی حاڵ و بارودۆخی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای عەرەبی و نوسراویشیان بەڕێدەکردەوە بۆ وڵاتانی خۆیان بە مەبەستی سود لێ وەرگرتنی.

ئیدی نێردە دیبلۆماسیەکان دەستیانکرد بە گێڕانی ڕۆڵی ڕۆژهەڵاتناسی، زۆرێك لە سەرانیان و قونسوڵگەریەکانیان لە گۆڕەپانی ڕۆژهەڵاتناسی دا ئەسپی خۆیان تاودەداو چەندین شتیان لەسەر عەرەب نوسی. بۆنموونە بۆکۆن قونسوڵی فەرەنسابوو لە حەلەب و کلریهۆن قونسوڵی فەرەنسابوو لە قودس و پاشان لە ئەستانە و (بۆتی) کە پەرتوکێکی لەسەر شاری ئیسلامی نوسی و لە لایەن ئیدارەی فەرەنساوە وەکو قونسوڵ لە ڕۆژئاوای دوور دانرا[١٥].

کاتافاکۆ قونسوڵی فەرەنسابوو لە دیمەشق کە شەرحی کتێبی (تعاليم الطائفة النصيرية) ی کرد بە زمانی فەرەنسی. وە هەروەها چەند شوێنەوارناسێك هەبوون کە لە خاکی عەرەبیدا کاریان دەکرد و لە پۆستی دیبلۆماسیشدا دانرابوون، بۆ نمونە لۆفتوس شوێنەواری نەینەواو

١٥ د.عبدالجبار ناجي تطور الإستشراق في دراسة التراث العربي ، لا ١٥

پاشماوەکانی کۆشکی ئاشوری دۆزیەوە دوای ئەوە هەڵبژێردرا بە ئەندامی ئەنجومەنی عمومی بەریتانی و پاشان بە بریکاری وەزارەتی دەرەوە[١٦].

باوك جۆسین و باوك جاك جومیە و باوك ساموێل و باوك کاردیا ڕابەرانی هەڵمەتی تەبشیری بوون و هەوڵیان دەدا بیرو بۆچونەکانیان ڕەنگبداتەوە لەسەر ئیسلام کە پڕبوو لە چەواشەکاری، لەڕاستیدا ئەگەر ڕۆژهەلاتناسی مەبەستێکی تری نەبوایە ئەوا کەرستە هزریەکانی ڕۆژهەلاتناسەکان تەنها لەسەر باسکردنی سروشتی ڕۆژئاوا و موسوڵمانان کورتی هەڵدێنا.

لەئەنجامی کاریگەربوون بە دیدو بۆچونەکانی ئیستیعمار و خزمەتکردنی ئیستیعمار بە شێوازی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ ڕۆژهەلاتناسەکان هەر بە ئەنقەست سوکایەتیان بە هەرشتێ دەکرد کە عەرەبی یان ئیسلامی بوایە[١٧].

## ٣- بەڕۆژئاواییکردن:

ئەمەش بەمەبەستی ئەوەی کە ژیاری ڕۆژئاوا پێشڕەوایەتی مرۆڤایەتی بکات و زاڵبونی بەسەر ژیاری عەرەبی ئیسلامی نیشان بدات، لەم پێناوەشدا ئیستیعمار پشتی بەست بە گۆڕینی شێوازی گشتی ژیان لە جیهانی ئیسلامی دا بە جۆرێك کە کۆمەڵگای ئیسلامی لە پێوەر و ڕێگاکاندا پشت بە هزری ڕۆژئاوا دەبەستێ.

بەڕۆژئاواییکردن بریتیە لە بۆیاغکردنی کۆمەڵگای ئیسلامی بە ڕەنگی ڕۆژئاوا لە هەموو بوارەکانی هزرو ژیاندا، بەم پێیەش مسوڵمانەکان هەروەك ڕۆژئاواییەکان دەژین و بیردەکەنەوە، تا وای لێ دێت هیچی بەسەر ئیسلامەوە نامێنێ تەنها ناو نەبێت[١٨].

---

١٦ هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا ٦٠

١٧ أنور الجندی، التراث الإسلامی والمستشرقون، لا٦٠

١٨ محاضرات في الثقافة الإسلامية/ لا٢٦٨

بەڕۆژئاوایکردن لە جیهانی ئیسلامیدا چەندین ڕوو و ڕوخساری جیاواز بەخۆیەوە دەگرێت لەوانە هزری و کۆمەڵایەتی و ڕەفتاری، لە ڕووە هزریە ڕامیاریەکەیەوە، سیستمانێکی فەرمانڕەوایی پەیدابوون کە لاسایی سیستمەکانی ڕۆژئاوا دەکەنەوەو بە جۆرێك سەیری سیستمی دیموکراسی ڕۆژئاواو مافەکانی مرۆڤ دەکرێت بەوەی کە ڕاسترین و بالاترینەو شەڕیان پێ دەکرێت دژی ئاراستەو بزوتنەوە ئیسلامیەکان، پلەو پایەی عەلمانیەکان ئەوەندە بەرزکراوەتەوە کە گەیشتونەتە شوێنی بڕیاردان.

سەبارەت بە بوارە کۆمەلایەتیەکەشیەوە، کۆمەڵگای ئیسلامی چەندین جۆری چاولێکەری ڕۆژئاوا بە خۆوە دەبینێت لە خواردن و، خواردنەوەو، جل و بەرگ و، شێوازە جۆربەجۆرەکانی ژیان و، لەم ڕۆژگارە گوێبیستی ئاوازەکانی ئازادکردنی ئافرەت دەبین (وەك بلێی ئافرەت بەکۆیلەکرابی)و زۆر شتی تر کە قەوارەی ئیسلامی دەڕوخێنن.

سەبارەت بە بواری فێرکردنیش وای لێهاتووە هزرە ڕۆژئاواییەکان لە زانکۆ و قوتابخانەکانمان دەخوێنرێن و بە ئاسایی وەردەگیرێ، هەروەها یاسا ڕۆژئاواییەکان تەواو زاڵبوون و لە سنووری خۆیان دەرچوون دوای ئەوەی شەریعەتی ئیسلام و یاساکانی پشتگوێ خران و ڕەتکرانەوە. ئیتر بەم شێوەیە پرۆگرامەکانی بە ڕۆژئاوایی کردن پاسەوانی دەکەن لە بەرژەوەندیەکانی ڕۆژئاوا لە لایەك و لە لایەکی تریشەوە هۆگربوونی مسوڵمانان بە ئایینەکەیانەوە لاواز دەکەن[19].

## تیرۆر:

**تیرۆر لە ڕووی زمانەوانیەوە:** وشەی ئیرهاب لە (رهب الشئ أي خافه) هاتووە، واتە تۆقاندن و ترساندنی[20]، لەم بارەیەشەوە خوای پەروەردگار دەفەرموێ { وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا و رَهَبا} (٩٠) الأنبياء ، وە هەروەها(أرهبه)واتە ترساندی و تۆقاندی هەر بۆیەش "ڕاهب" بەوە ناو نراوە بە هۆی لە خوا ترسانیەوە.

---

١٩ محاضرات في الثقافة الإسلامية، د.محمد الحاج، لا٢٦٨-٢٦٩ (بە دەستکاریەوە)

٢٠ لسان العرب إبن منظور، بەرگی ١، لا ٤٣٦

**بەلاّم له زاراوەدا:** یەکەم شت بریتیه له ( بەکارهێنانی بـه ئەنقەسـتی هۆکـاره جۆراوجـۆره تواناداره‌کان بۆ دروستکردنی مەترسیەك که هەڕەشه له سەلامەتی و ئاسایش دەکات[21] ) ، ئەم پێناسەیەش تاوانه سوکەکانی تیرۆر دەگرێته خۆی.

یان بریتیه له ( کرداری ڕێکخراوی کوشـتن بـه سـووربوونی پێـشوەخته) کـه گـیرو گرفتـی لێدەکەوێتەوەو هەڕەشه له بێتاوانان دەکات و دەبێته هۆی بلاّو بوونەوەی ترس و دلّـەڕاوکێ بـۆ مەبەستێکی ڕامیاری)[22] و ئەو پێناسەیەش تیرۆر له ڕەهەنده ڕامیاریەکەیدا کورتهەلّدێنێ.

دەزگای هەوالّگری ئـەمریکی وای بـۆ دەچـێت کـه ( تـیرۆر بریتیـه لـه هەڕەشـەکردن بـه بەکارهێنانی توند و تیژی یان بەکارهێنانی توند و تیـژی بـه مەبەسـتی هێنانـەدی ڕەهەنـدی ڕامیاری له لایەن چەند کەسێك یان کۆمەلّێکەوە)[23] ، بەلاّم ئەم پێناسەیه کەم و کورتی تێدایـه و تیرۆر له چەند کەسانێك و چەند کۆمەلّەیەك کورتهەلّدێنێ به بێ باسکردنی تیرۆری ولاّتان.

هەندێکی تریش بەوە پێناسەیان کردووە کـه " بریتیـه لـه بـەکارهێنانی تونـدو تیـژی بـه هەرشێوەیەك بێت بۆ بەدی هێنانی ئامانجێکی ڕامیاری یان ئایدیۆلۆژی یان ئایینی" [24] وه ئەم پێناسەیەش تیرۆری هزری دەگرێتەوە.

دکتۆر بەسام عەمموش بەوە پێناسەی دەکات که ( بریتیه لـه بـەناڕەوا بـەکارهێنانی هێـزی ماددی یان هزری لەدژی خەلّکی تر، لەلایەن تاکێك یان ڕێکخراوێك یان ولاّتێك یان ولاّتان بـۆ هێنانەدی مەبەستێکی دیاریکراو)، وەپێشی وایه که ئەوکەسانەی به کاری تیرۆر هەلّدەستن سێ جۆرن:

تاکێـك یـان چـەند کەسـێك ئـەم کـاره دەکـەن بـەبێ ئـەوەی لەلایـەن هـیچ کەسـێکەوە ئاڕاستەبکرێن، بەزۆریش وایـه کـه ئەوکەسـانه لەحالّـەتی نەخۆشـیەکی دەروونـی دان یـاخود بیربۆچونێکی هەلّەیان هەیه، یانیش ڕقی تۆلّەکردنەوەیان بەسەردا زالّه.

---

٢١ (الإرهاب التهديد والرد عليه) إريك موريس و ئالان هو

٢٢ هەمان سەرچاوە

٢٣ (الإرهاب)هشام الحديدي لا،٤٩

٢٤ (الإرهاب بين التجريم والمشروعية) — إمام حسانين

ڕێکخراوێك یان چەند ڕێکخراوێك...، ئەمەش ڕوویدا لەلایەن مافیاکانی زایۆنی وەکو شتێرن و ئەهاجانا و، هەروەها مافیاکانی ئیتالیا و گروپە هیتلەرییە نوێیەکان و هەندێ مافیای مالی و گروپە گومبوەکانی خوگرتوو بە مادده بێهۆشکەرەکان و موخەددەڕات.

ولاتێك یان چەند ولاتێك کە ئەمەش لە قەوارەی زایۆنی دا دەبینرێت کە ئەم دەوڵەتۆکەیە وا ئێستا مومارەسەی تیرۆر دەکات بەسەر عەرەب و مسوڵمانان و هەڵدەستێ بە کوشتن و بڕین و، ئەمریکاش دوورو نزیك بەچاوی خۆی دەیبینێ و پاڵپشتی لێدەکات (وەك لە داگیرکردنی عێراق) و، ئەمە جگە لەوەی تائەمڕۆش قونبەلە ناوەکییەکانی ئەمریکا کە لە ژاپۆنی دا لە گوێچکەکانی جیهاندا دەزرینگێتەوە.

## مێژووی تیرۆر:

دکتۆر بەسام عەمموش پێی وایە کە تیرۆر تاوانێکە لەژیانی مرۆڤ جیا نابێتەوە، قورئانی پیرۆزیش وێنەیەك لە وێنەکانی تیرۆری -کە کوشتن و خوێنڕشتنە- باسکردوە کاتێك کوڕی باوەئادەم براکەی کوشت و ئەمەش بەدرێژایی مێژوو بەردەوام بوو، وەکو خوای گەورە دەفەرموێ: {وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ابْنَيْ آدَمَ بِالْحَقِّ إِذْ قَرَّبَا قُرْبَانًا فَتُقُبِّلَ مِن أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ الآخَرِ قَالَ لَأَقْتُلَنَّكَ} (٢٧) المائدة، واتە: بەسەرهاتی دووکوڕەکەی ئادەم بۆ ئەو خەڵکە بخوێنەرەوە کە: بەڕاستی ڕویداوە، ئەوەبو کاتێك هەردووکیان قوربانییان کرد، لەیەکێکیان وەرگیرا (کەلەسەر حەق بوو، لەخواترس بوو) و لەویتریان وەرنەگیرا (چونکە ڕق ئەستورو حەسودو خوانەناس بو) بەبراکەی وت هەر دەتکوژم...، پێغەمبەر موحەممەدیش (صلى الله عليه وسلم) دوچاری چەندین هەوڵی تیرۆرکردن بویەوە لەلایەن جولەکەکانەوە کە لەپێشتریشدا پێغەمبەرانیان کوشتبوو وەکو خوا دەفەرموێ: {وَقَتْلَهُمُ الأَنبِيَاء بِغَيْرِ حَقّ} (١٨١) آل عمران،. لە مێژووی ئیسلامیشدا گروپێکی تیرۆریستی دەرکەوتن بەنێوی ئیسماعیلیە نزاریەکان یان حەشاشیەکان کە لە میسر سەریانهەڵدا و وشەی ئینگلیزی (Assasain) کە بۆ غافڵکوژی بەکاردێ لە ناوی ئەوانەوە هاتووە، چونکە ئەوان هەڵدەستان بە بەکارهێنانی

حەشیش بەر لە ئەنجامدانی تاوانەکانیان بۆئەوەی نێچیرەکان بە خوێنێکی سارد بکوژن، بزوتنەوەی نازیش لە چلەکانی سەدەی ڕابردوودا پێشڕەوایەتی تیرۆرو خوێنڕشتنیان دەکرد دژی ناحەزو دوژمنانیان، هەروەکو دواتریش زایۆنیەکان هەڵسان بە ئەنجامدانی قەسابخانەکانی کفرقاسم و دێریاسین و ئەقسا و مزگەوتی ئیبراهیمی خەلیل و بەحر بەقەرو صەبراوشاتێلا و قانا و موخەییەم جەنین.[٢٥]

لەژێر کاریگەری ڕوداوەکانی ١١ی سێبتەمبەردا ئەمریکا جەنگی دژەتیرۆری ڕاگەیاند کە ئەفغانستانی کردە چەق و سیستمی فەرمانڕەوایی تاڵیبانی روخاندو ڕێکخراوی قاعیدەی پەرت و بلاوکردو، دواتریش عێراقی داگیرکردو لەمەشەوە نەهێشتنی تیرۆری کردە هۆکارێك بۆ داگیرکردنی گەلان.

**دکتۆر عەمموش بەپێی پێناسەکەی، تیرۆر بۆ دووجۆر دابەش دەکات:**

**١- تیرۆری ماددی.**

**٢- تیرۆری هزری.**

ئەگەر جۆری یەکەمی تیرۆر ناسراو و بینراو و ئیدانەکراو و ترسناکە -وەکو دەڵێت- ئەوا جۆری دووەمی لەهی یەکەم مەترسی کەمتر نییە، هەرچەندە کە خوێن نارێژێت و گیانی خەڵکی لەناونابات بەلاّم لەگەڵ ئەمەشدا زۆر مەترسیدارە، کەواتە ئەو تیرۆرە هزریە چییە؟!

تیرۆری هزری بریتیە لە ناچارکردنی خەڵکی بۆ پابەند بوون بە ڕایەکی دیاریکراو و ڕێبازێکی تایبەت یاخود هزرێکی دیاریکراو، ئەمەش ڕێك دژی کەرامەتی مرۆڤ دەوەستێ وەکو خوای گەورە دەفەرموێ {وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ} (٧٠) الإسراء، وەهەروەها: {لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ} (٢٥٦) البقرە، وە {أَفَأَنتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ} (٩٩) یونس، سەپاندنی ڕا بەسەر خەڵکی دا دوژمنایەتیەکی ڕاستەقینەیەو زۆر مەترسیدارە بۆسەر مرۆڤ، ئەو خەڵکە چۆن چۆنی دەوێرن ئەوە بکەن لەکاتێکدا خوای پەروەردگار زۆری لەخەڵکی نەکردوە بۆ چونە ناو

---

٢٥ محاضرات في الثقافة الإسلامية، لا ٢٨٧

ئایینه‌كه‌ی، لێره‌شه‌وه شیرینی ووته‌ی مسولّمان ده‌رده‌كه‌وێ كاتێ كه ده‌ڵێ (لا اله الا الله) هه‌ر ته‌نیا خوای په‌روه‌ردگار خۆی فه‌رمانده‌ر و ڕێگره‌، له‌گه‌ڵ ئه‌مه‌شدا هه‌ڵبژاردنی بۆ ئێمه جێهێشتووه {وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ} (١٠) البلد، مامۆستا عه‌موش ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ مێژوی ئیسلامیمان و پێی وایه كه خه‌لیفه مه‌ئمون و ئه‌و موعته‌زیلانه‌ی كه له‌گه‌ڵی دابوون هه‌ڵسان به سه‌ركوتكردنی ئه‌وانه‌ی كه ڕایان پێچه‌وانه‌بوو له‌گه‌ڵیان له بابه‌تی خه‌ڵقی قورئاندا و زۆرێك له زانایانی كوشت و زۆری تریشی ئه‌شكه‌نجه‌دان له‌وانه ئه‌حمه‌دی كوڕی حه‌نبه‌ل. له ڕابوونی ئیسلامی ئه‌مرۆشدا هه‌ندێك ده‌سته‌و كۆمه‌ڵ هه‌ن كه پێیان وایه هه‌میشه له‌سه‌ر حه‌قن و جگه له خۆشیان پێ ناحه‌قه، .به‌م پێیه‌ش هه‌ڵده‌ستن به موماره‌سه‌كردنی تیرۆری هزری و بگره هه‌ندێجار ده‌گاته ئه‌و ڕاده‌یه‌ی كه جگه له خۆیان به فاسق و بیدعه‌چی و كافر داده‌نێن هه‌ر ته‌نها له‌به‌ر ئه‌وه‌ی كه ڕای ئه‌وانیان وه‌رنه‌گرتووه. ئه‌مه‌ش به‌رته‌سككردنه‌وه‌ی ئاسۆكانه‌و هه‌ركه‌سێكیش باش له ئیسلام حاڵی بووبێت ئه‌مه‌ی پێ ڕه‌وا نییه‌، چونكه ئیسلام بانگمان ده‌كات بۆ برایه‌تی ڕاسته‌قینه و كۆبوونه‌وه‌ی مسولّمانان له‌سه‌ر شته بنچینه‌ییه‌كان به چاوپۆشین له‌سه‌ر ڕاجیایی و ووردە بابه‌ته‌كان.

## پاڵنه‌ره‌كانی تیرۆر:

د. عموش پێی وایه كه تیرۆر به هه‌موو جۆره‌كانیه‌وه چه‌ند هۆكار و پاڵنه‌رێكی ئاشكرای هه‌یه و ئه‌مانه‌ش له گرنگترینیانن:

### ١-پاڵنه‌ری ڕامیاری:

ئاره‌زووی بالاّده‌ستی و زاڵبوون نه‌ریتی زۆرێك له ولاّتانه به تایبه‌ت كاتێك خاوه‌نی هێزبن هه‌روه‌ها پاڵنه‌رێكی ڕامیاریه كه پاڵ به ڕێكخراوه خۆبه‌زلزانه‌كانه‌وه ده‌نێ هێز به‌كاربێنن بۆ ناچاركردنی گه‌لانیان بێ ئه‌وه‌ی هیچ بوارێكیان بۆ بهێڵنه‌وه تا ڕای خۆیان ده‌ربڕن یان به‌شداری بكه‌ن له ده‌سته‌لاّتدا وه‌كو ڕێكخراوه تاكه‌كه‌سیه‌كان یان ئه‌و ڕێكخراوانه‌ی كه خاوه‌نی تاكه ئایدیۆلۆژیایه‌كن كه نه ڕاوێژ و نه دیموكراسیش قه‌بوڵ ده‌كه‌ن، له حاڵی هه‌بوونی تیرۆری

ڕێكخراوەكاندا هەندێ جار داواكاری ئەوە دەكرێ كە زیندانیان ئازاد بكرێن وە بەم هۆیەش هەڵدەستن بە گرتنی بارمتە و ڕفاندنی فڕۆكە و ئەنجامدانی زنجیرەیەك لە كوشتنی بە تیرۆر و گرتنی باڵیۆزخانەكان و دەزگاكان وشتی تری لەم جۆرە..، لەوانەیە هەندێ كەس ئامانجیان لە كارە تیرۆریەكەیان بریتی بێ لە دروستكردنی دەنگێكی نارەزایی لەسەر ڕوداوێك، بۆ نمونە زۆرجار ئامانج بریتی دەبێت لە سوكایەتی كردن بە پەیوەندیە نێودەوڵەتی یەكان یاخود وا لەو دەوڵەتە دەكرێ كە دژایەتی كراوە هەڵوێستێكی سیاسی دیاریكراو بنوێنێ.

**٢-پاڵنەری ئابووری:**

فشارە تیرۆریەكان (وەك لە زۆربەی دەوڵەتاندا هەیە) زۆرجار دەبنە هۆی كردنەوەی بازارەكان و بە تالاْنبردنی خێر و بێرەكانیان، ئەمەش ئامانجێكی گرنگە لە ڕوانگەی ئەو زلهێزانەی كە دەیانەوێت خێرو بێری خەڵكی تر ببەن و وڵاتەكانیشیان بكەنە بازاڕێك بۆ كالاْكانیان، بەڵكو هەندێك جار دەگاتە ئەو ئاستەی كەوا كەرەستەی خاوی ئەو وڵاتە لاوازانە ببەن و دواتر لە شێوەی كەل و پەلدا پێیان بفرۆشنەوە، هەروەها وڵاتە زلهێزەكان هەڵدەستن بە قۆرغكردن و ئیستیغلالكردن و بەتالاْنبردنی خێر و بێری وڵاتە لاوازەكان. هەر ئەوەشە كە ئێمە لە وڵاتە ئیستیعماریەكانی وەكو بەریتانیاو فەرەنسا و ئیتالیا و ئەڵمانیادا بینیمان، ئێستاشی لەگەڵدابێ ئەمریكا مومارەسەی دەكات بە داگیركردنی ئاوەكانی جیهان و هەروەها داگیركردنی ڕێكخراوە نێودەوڵەتیەكان و زاڵبوون بەسەر بڕیارەكانیاندا، بەم پێیەش بڕیارە ڕامیاریەكان ملكەچ دەبن پاش ملكەچبوونی بڕیارە ئابوریەكان. تیرۆریستەكانیش جگە لە وڵاتان ئامانجیانە دەست بەسەر ماڵ و سامان بگرن لە ڕێی داواكردنی سەرانە.

**٣-پاڵنەری هزری:**

هەموو شارستانیەتەكان ئارەزویانە دیدوبۆچون و هزرەكانیان بسەپێنن تەنها ئیسلام نەبێت كە هەر زوو پێچەوانەكەی ڕاگەیاند هەروەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ {لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ} (٢٥٦) البقره وە هەروەها دەفەرموێ {فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَالْيَكفُر} (٢٩) الكهف.

دواتر د. عموش باس لەوە دەکات کە خاچپەرستەکان هێرشیان کردوّتە سەرمان بە هەموو هەوڵ و توانایانەوە بەو مەبەستەی کە ژیار و شارستیانیەتەکەمان لیّ خاپور بکەن، هەروەها زایۆنیەکان خاکیان لیّ داگیرکردین و پیرۆزیەکانیان تێکداین و مەغۆلە کۆنەکانیش هێرشیان کردینە سەر و پەرتوکەکانیان لیّ سوتاندین و کەلەپوریان لیّ کاولکردین، شیوعیە ڕوسیەکانیش هەوڵیاندا زاڵبن بەسەرماندا و بەرەو ولاّتانی ئیسلامی ملیان نا لە ڕێی پارتە شیوعیەکانەوە لە هەموو ناوچەکانەوە بەلاّم سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا چونکە ئیسلام زۆر بە توندی بەرهەڵستی دەکردن. شوعیەکان هەوڵیاندا تورەیی مسوڵمانان هەڵبستێنن و زیاتر لە ملیۆنێکیان لە چیچان لیّ کوشتن، بەلاّم شوعیەت ڕۆیشت و گەلی چیچان و هەموو گەلانی تری مسوڵمانیش وەکو خۆیان مانەوە کە ناوی یەکێتی سۆڤیەتیان لیّ نرابوو.

هەروەها دەڵێت ئێمە بڕوامان بە نەلەخشاوی عەقیدەمان هەیە و ئامادەنەبوین هەمان شت دژ بە بەرامبەرەکەمان بکەین بەڵکو هەموو هەوڵێکمان داوە گفتوگۆ بکەین و ئەوەندە شکۆمەندیەمان بەسە کە هەر ئێمەبووین ئەمانەتی فەلسەفەی یۆنانیمان پاراست کاتێك وەرمانگێڕا و ڕەخنەمان لیّ گرت و نەمانسوتاند چونکە پێمان وابوو بەشێکە لە هزری مرۆڤایەتی.

بەڵیّ چوینە نێو ئەندەلوس و ئاوەدانیمان تێیدا بەجیّ هێشت سەرەڕای ئەو شوێنەوارەی کە تا ئەمرۆش ئیسپانیەکان بە هۆیەوە پارەیەکی زۆریان چنگ دەکەوێت لە گەشت و گوزاریدا بەجۆرێك کە ئێستا ئیسپانیا دووەم ولاّتە لە جیهاندا لە دەستهاتی گەشت و گوزاریدا و ئەو دەستهاتەش تەنها لە ئەندەلوسدا هەیە چونکە باکوری ئیسپانیا تیرۆر و تۆقاندنی جوداخوازە ئیسپانیەکانی لێیە[٢٦].

---

٢٦ محاضرات في الثقافة الإسلامية، لا ٢٩٠

**٤- پاڵنەری کۆمەڵایەتی و دەرونی:**

هەژاری و نەداری و بێبەشبوون زۆرجار پاڵ بە هەندێك خەڵکیەوە دەنێن بۆ هەڵگرتنی ڕق و قینە بەرامبەر کۆمەڵگاو هەندێك جار دەگاتە حاڵەتی بەکارهێنانی هێز و کاولکاری و کوشتن و هەموو جۆرە لادانێك. وە هەندێك جاریش لە ئەنجامی باری دەرونی و نەخۆشی دەرونیەوە پەیدا دەبێ، بۆ نمونە حەزی خۆدەرخستن و خۆجیاکردنەوە، یاخو باری شێت بوون. ئەم حاڵەتانە بە زۆری لە کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکاندا دەردەکەوێ چونکە ئەوان بەدەست بۆشایی ڕوحی یەوە دەناڵێنن و هەروەها لە ئەمریکاش ئەوە بە ڕونی هەستی پێ دەکرێ هەروەك چۆن لە تەقینەوەکەی ئۆکلاهۆما بینیمان کاتێك کەسێك هەڵسا بە تەقاندنەوەی باڵاخانەیەك کە پێی دەگوترا ماکفیا و دواتریش لە سێدارەدرا، وە هەروەها ڕوداوەکانی کوشتنی منداڵان لە لایەن هاوڕێکانیان لە قوتابخانەکاندا.

## هەڵوێستی ئیسلام بەرامبەر تیرۆر:

لە ڕاستیدا ئیسلام بە هەموو شێوەیەك بەرهەڵستی تیرۆر دەکات و پێی ڕازی نابێت، د.عموش دەڵێ زۆرێك لە خەڵکی بە هەڵە لەو ئایەتە پیرۆزە تێگەیشتوون {وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدْوَّ اللّهِ وعَدوكُم} (٦٠) الأنفال، واتە: (خوا فەرمان دەکات بە کاربەدەستانی ئیسلام) هەرچی لەتواناتاندا هەیە بۆ بەهێزکردنی سوپای ئیسلام بیخەنەگەڕو ئامادەیی بکەن (هێزی ئاسمانی و دەریایی و وشکانی و..هتد) و لە ئامادەکردنی هەمو جۆرە ئەسپ و(هۆکانی تری گواستنەوە) کەمتەرخەمی مەکەن تا دوژمنانی خواو دوژمنانی خۆتانی پێ چاوترسێن بکەن.

هەروەها پێی وایە کە ئەوە تیرۆرێکی پەسەندکراوە چونکە ئامانجەکەی بریتیە لە پارێزگاری کردن لە خوێنی خەڵکی و ڕێگری کردنە لە بەگژیەکداچوون و مەبەست لێی بەستنی

دەستی دەستدرێژیكارانه هەروەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ (نصرت بالرعب)[٢٧] بەو مانایەی كە دوژمنەكانی ترساندووە[٢٨] و وایلێكردون كە ئامادەی شەڕ نەبن.

زۆربەی هەرەزۆری ئیسلامیەكان وەكو دەبینرێ لەسەر ڕەوشتەكانی ئیسلام پەروەردە دەكرێن كە فەرمان بە چاكەكاری و بلاّوكردنەوەی خێر و سۆز و ئاوەدانی دەكات، چونكە ئەوانە هەموویان لە بنەما سەرەكیەكانی(جێنشینایەتی) ن لەسەر زەوی، لە قورئانی پیرۆزیشدا خوای گەورە دەفەرموێ {إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ} (١٣) المائدة، واتە: بەڕاستی خوا چاكەكارانی خۆشدەوێ. هەروەها دەفەرموێ {مَن قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا لَمُسْرِفُونَ} (٣٢) المائدة، واتە: ئەوەی كەسێك بەناهەق بكوژێت و لەجیاتی كوژراوێك نەبێت، یان گوناهو تاوانی گەورەی ئەنجام نەدابێت لە زەویدا (وەكو جەردەیی و دەستدرێژی و ..هتد)، ئەوە وەك ئەوە وایە كە هەموو خەلّكی كوشتبێ، ئەوەش كەسێك لە مەرگ ڕزگار بكات، هەروەك ئەوە وایە هەموو خەلّكی لە مەرگ ڕزگار كردبێ و ژیانی پێبەخشیبن، سوێند بەخوا بەڕاستی پێغەمبەرانمان بە بەلّگەو موعجیزەی ئاشكراو دیارەوە هاتون بۆلایان (تا پابەندی حەق و داد بن) كەچی زۆربەیان دوای ئەو ڕێنمونیانە هەر زیادەڕەو بوون لەم سەرزەمینەدا لەستەم و كوشتنی ناحەقدا.

هەروەها ئەوە دوپات دەكاتەوە كە پەیوەندیمان لەگەلّ یەكتری دەبێ لە سەر بنەمای حیوارێ مەبەستدار بێ هەروەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ {ادْعُ إِلِى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ} (١٢٥) النحل، واتە: (ئەی پێغەمبەر، ئەی ئیماندار)

---

٢٧ البخاری مع الفتح ٢٢٨/٦ ژمارە ١٢٢

٢٨ وەكو جەنگێكی دەرونی بۆ ترس خستنە نێو دلّی دوژمن تاوەكو پاشەكشە بكەن و شەڕو خوێنڕشتن ڕوو نەدات (وەرگێڕ)

بانگەواز بکە بۆ لای بەرنامەو ڕێبازی پەروەردگارت بە حیکمەت و دانایی و ئامۆژگاری جوان و بەجێ، گفتوگۆو موجادەلە بەجوانترین شێوە بکە.

خۆ ئەگەر ڕێك نەکەوتن ئەوا دەبێ هەڵوێستیان بە پێی ئەو وتەیەی خوای پەروەردگار بێت کە دەفەرموێ {لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ} (٦) الكافرون، واتە: دینی خۆتان بۆ خۆتان و دینی خۆم بۆ خۆم. ئەگەر بێت و بەرامبەرەکەمان هەڵەی بەرامبەرمان کرد ئەو نابێتە بیانو بۆ ئەوەی تیرۆری لە بەرامبەردا ئەنجام بدەین بەڵکو لەسەر مسوڵمان داواکراوە کە بە لێبوردنەوە مامەڵە بکات هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ { وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ } (١٣٤) آل عمران، واتە: ئەوانەی کە ڕق و کینەی خۆیان دەخۆنەوەو خۆگرن، لە خەڵکی خۆشدەبن و لێبوردەن. کە هەڵبەتە ئەوە تاکەکانی مسوڵمانان دەگرێتەوە لە نێو خۆیان کاتێ هەڵە دەکەن، بەلاَم تیرۆری بە ئەنقەست کە لە لایەن چەند کەسێك و ڕێکخراوێك و دەوڵەتانێکەوە دەکرێن ئەوا پێویستە بەرەنگاریان بکرێت.

هەروەها د.عەموش پێی وایە کە گیانی لێبوردنی ئیسلامی بە ڕوونی لە سونەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕەنگدەداتەوە کە دەفەرموێ (إرحموا من في الأرض يرحمكم من في السماء)[29] واتە: بەزەییتان بێتەوە بەوانەی کە لەزەویدان، ئەوەی کە لە ئاسمانە بەزەیی پێتان دێتەوە. هەروەها دەفەرموێ (إن الله رفيق يحب الرفق)[30] وە زۆر فەرمودەی تریش کە ناکرێ بیانهێنینەوە، بێگومان ئیسلام ئامۆژگاری کردوین بە گرینگیدان بە هەژار و نەدار و یەتیم و ڕێبوار و ئافرەت و منداڵ و پیر و پەککەوتە و نەخۆش و دیل و ئەوانەی کە ئاشتیخوازن و شەڕ ناکەن.

---

٢٩ الترمذى ٣٢٣/٤ و قال حسن صحسيح

٣٠ البخارى مع الفتح ٤٤٩/١٠

ئینجا ئەو پێی وایه که مێژووی ئیسلامی پڕیەتی له پەیڕەوکردنی ئەو ڕێبیرانه بـه گـشتی لەگەڵ خەڵکی، لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکانێکی مسوڵمانی نەفام هەڵدەستن به تەکفیرکردنی خەڵکی و پیشاندانی وێنەی ئیسلام به شێوەیەك که ناگونجێ لەگەڵ بنەماکانی و ئیسلام به شـێوەیەکی ناشیرن و چەواشەکراو پیشانی خەڵك دەدەن. ئەوانـه لـه بـری ئـەوەی ببنـه هـۆی بـانگکردنی خەڵکی بەرەو ئیسلام بونەته توندڕەو و خەڵکی له ئیسلام دوور دەکەنەوە.

## ئامرازەکانی تیرۆر:

د.بسام عموش وا دەبینێ که تیرۆریستەکان ئـامرازی زۆر جیـاواز بـەکاردەهێنن لـه کـاره تیرۆریستیەکانیان:

١- **ڕفاندنی بارمته:** له نمونەی ئەوەش ئەوەی که له باشوری لوبنان زایۆنیەکان پێی هەڵسان وەکو ڕەتدانەوەیەکیش بەرهەڵستکارانیش دووباره پێی هەڵسان.

٢- **تیرۆرکردن (إغتیالات):** زۆرێك لـه کەسـایەتیەکان دوچـاری تیرۆرکـران بوونەتـەوه لـه گرنگترینیشیان دەستەلاتداران و بیرمەندەکانن، سەرەڕای شکستهێنانی زۆرێك له هەوڵـەکانیش که چەند جۆرێکیان ئامانجـەکانیان پێکـا و تـیرۆر کـران لـه جیهـانی عـەرەبی وەکـو مـەلیك فەیسەڵی کوڕی عەبدولعەزیز پاشای سعودیه ساڵی ١٩٧٥ له سـەر دەسـتی فەیـسەڵی کـوڕی موساعیدی کوڕی عبدالعزیز کـه بـرازای بـوو ڕاسـتیەکەی ئەوەیـه کـه وڵاتـه یـەکگرتوکانی ئەمریکا له دوای ئەو تیرۆرکردنەوەبوو به هـۆی فەرمانـەکانی مـەلیك فەیـسەڵ بـه ڕاگرتنـی ناردنی نەوت له جەنگی ١٩٧٣ز وه هەروەها سەرۆکی میسر ئەنوەر سادات لـه سـاڵی ١٩٨١ له سەر دەستی مولازم خالد ئیسلامبۆلی به فەرمانی کۆمەڵەی (هجره و تکفیر).

٣-**کوشتن به ئامرازی جۆراوجۆر.**

٤- **تەشکەنجەدان:** ئەمه ئەو جۆره تیرۆرەیه که زلهێزەکانی جیهـان دژ بـه نـەیارانیان پێـی هەڵدەستن وه ئەوەی که به مێشك دا نایەت بـەکاری دێـنن لـه هۆکارەکـانی ئەشـکەنجەدان وه

چەندین کتێبیش لەم بارەیەوە نوسراون لەوانە (أقسمت أن أروى) ی روکس معکرون وە هەروەها (کتێبی البوابة السوداء) ی ئەحمەد ڕائیف .

٥- **لە کەدار کردنی ناوبانگ:** وە هەروەها پێشی دەوترێت تیرۆرکردنی کەسایەتی ئەمەش لە ڕێگای بەکارهێنانی ئامرازەکانی ڕاگەیاندن بۆ گەورەکردنی ڕوداوەکان و ساختەکردنی ڕاستیەکان .

٦- **بەکارهێنانی جەنگەکان:** بانگەشەکردن تێیدا بەوەی کە دژایەتی تیرۆر دەکرێت بەلاّم بە هۆیەوە خەڵکی بێتاوان دەکوژرێن وەکو ئەوەی کە ئیسرائیل و ئەمریکا کردیان و دەیکەن.

## شوێنەوارەکانی تیرۆر:

د. عموش وای بۆ دەچێ کە تیرۆر خۆی لە خۆی دا شتێکی نێگەتیڤە بۆیە بە دڵنیاییەوە شوێنەوارەکانیشی نێگەتیڤن و هەندێکیشی بە نمونە هێناوەتەوە:

١- لە ناوبردنی گیانی خەڵکی.

٢-بڵاوبوونەوەی ترس و تۆقاندن و دڵەڕاوکێ لە نێو خەڵکی دا: (لە ماوەی ٣٤٢١ ساڵ لە مێژوی مرۆڤایەتی دا تەنها ٢٦٨ ساڵ ئاشتی باڵی بەسەر جیهان دا کێشاوە) لە ساڵی ١٩٨٠ کردەوە تیرۆریستیەکان ئەوەندە تەشەنەیانکرد بە جۆرێك کە ٧٦٠ کردەوەی کوشتاری ڕویداوە ٦٤٢ کەس کوژراوە و ١٧٠٨ کەسیش بریندار بووە .

٣- دواکەوتنی ئابووری: ( لە ڕوی بەرهەمهێنان و وەبەرهێنان و گەشت و گوزاری).

٤- نەزیفبونی خوێنبەرەکانی وڵات، کاولبوونی (دەزگا گشتیەکان) و (ئاساییش).

٥- فراوانبوونی بازنەکانی زەبر و زەنگ لە لایەن دام و دەزگاکان و پاشەکشێ کردنی دیموکراسیەت.

٦-تێکدانی پەیوەندیە دەرەکیەکانی دەوڵەت.

٧-بڵاوکردنەوەی وێنەیەکی نارێك لە بارەی ئیسلامەوە.

٨- پەیدابونی بەربەرەکانێ و زیادبوونی لە نێوان تاقمە جیاجیاکاندا.

٩- هاندانی خەڵکی تر بۆ تیرۆر.

١٠- کاولبون و دواخستنی کۆمەڵگا، چونکە لەئەنجامی لەدەستچونی بەخێوکەر خێزان دەربەدەر و پەرش دەبێت.

## چارەسەری تیرۆر:

دیاریکردنی چارەسەرەکانی تیرۆر (بەپێی ڕای د. عموش) دەگەڕێتەوە بۆ دیدوبۆچونی تاکەکان و دەزگاکان و وڵاتان، وە دانانی چارەسەر پێویستی بە دەستنیشانکردنی هۆکارەکانیەتی کە بەشێوەیەکی گشتی ئەمانەن:

١-ئارەزوی زاڵبوون.

٢-ئارەزوی شکاندنی هەیبەتی ئەوانی تر.

٣- تۆڵەکردنەوە.

٤- بەرزڕاگرتنی بیرو عەقیدەکان.

لەڕاستیدا مافی بەرهەڵستکاری (مقاومة) لە یاسا ئاسمانی و دەستکردەکاندا ڕێی پێدراوە، وە بەهەمانشێوە نەتەوەیەکگرتووەکانیش لە ماددەی ٢٧ ی یاسای مافی مرۆڤ دا ڕەوایی پێداوە (إن مقاومة الإضطهاد هي نتيجة منطقية لتلك الحقوق التي يتمتع بها الإنسان والمواطن) واتە: لەڕاستیدا بەرهەڵستیکردنی زۆرداری ئەنجامێکی لۆژیکییە بۆ بەدەستهێنانی ئەو مافانەی کە مرۆڤ و هاوڵاتی کەڵکی لێ وەردەگرن.

# پێناسەی سیکۆلاریزم

سیکۆلاریزم واتە دورخستنەوەی ئایین لە ژیانی کرداری.

وشەی سیکۆلاریزم بۆ "عەلمانیەت" وەرگێڕدراوە کەچی لە بنەڕەتدا بە واتــای " کاروبــاری دنیــایی " دێــت، تــا ئێــستاش نــازانرێ کــە بۆچــی وشــەی ســیکۆلاریزم بــە "عەلمانیــەت" لێکدراوەتەوە کە گوایە پەیوەندی بە زانستەوە هەیە... ئەمەش لەوەدەچــێ کــە بــە ئەنقەســت وشەی سیکۆلاریزم بە زانستەوە لێکبدرێتــەوە بۆئــەوەی وا پیــشانبدرێ وەك بڵێــی ئــایین هــیچ پەیوەندیەکی بە زانستەوە نەبێت یان ڕەتی بکاتەوە.

ئەگەر بێت و مانای سیکۆلاریزم بە زانستەوە بلکێندرێ، ئەوا ئــایینی پاپــایی لــە ئــەوروپا بەرهەڵستی دەکرد لەوەی کە خەڵکی پابەند بن بە بنەما زانستیەکانەوە، وە هەروەها مێــژووی ئەوروپای کۆن و ناوەڕاست گەواهی چەندین کارەسات دەدات کە ڕوبەڕووی ئەوکەســانە بویــەوە کە ئەو کاتە کاریان لەنێو زانستدا دەکــرد، بــە جۆرێــك کــە کڵێــسا فــەرمانی کوشــتن یــاخود سوتاندنی هەرکەسێکی دەردەکرد کە بە زانستەوە پەیوەســت بوایــە، لــەم پێناوەشــدا چــەندین گەورەپیاوی هەڵکەوتەی تێدا ڕۆیشت کە هیچ تاوانێکیــان نــەبوو جگــە لــە ســەرقاڵبونیان بــە زانست و ئەو بەهرەیەی کە خوا پێی بەخشیبوون لە کــارکردن لــە بــواری زانــست دا، ئەوکاتــە کڵێسا خەڵکی بەرەو نەزانی و تاریکایی ڕاپێچ دەکرد و ناچاری دەکــردن کــە هــەر بــە نــەزانی بمێننەوە.

هاوکات لەگەڵ ئەو سەردەمەی کە لە جیهــانی ئیــسلامی دا بوژانــەوەی زانــستی و هــزری لەوپەڕی گەشەسەندن دا بوو کڵێسای کاسۆلیکی لە لایەن خودی پاپاوە بڕیــاری کوشــتنی ئــەو زانایانەی دەردەکرد.

ئەگەر بێت و بەراوردێك له نێوان هەردوو جیهانی ئیسلامی لـه ئاسـیا و بـاکوری ئـەفریقا بکەین لەگەڵ خاچپەرستی ئەوروپا ئەوا بۆمان دەردەکەوێ کە مسوڵمانان فەرمانیان بە خەڵکی دەکرد ئەسپی خۆیان لە زانستدا تاو بدەن و ئەوەبوو زانایان لە هەموو بوارەکان دەسـتیان کـرد بە شت نوسین، وە بوونە خاوەنی تاقیگەی زانستی و چەندین ئەزمونی جۆراوجۆر کە ئێـستاشی لەگەڵدابێ کتێبخانەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی شـانازیان پێـوە دەکـات..، هـەروەها سـەرجەم کتێبخانەکانی جیهان پڕبوون لە پەرتوکەکانمان، وەئەمەش ئـەوە دەردەخـات کـە ئـەم ئوممەتـە دەستپێشخەری بەردەوامی هەبووە لە بواری زانستیدا، بە تایبەتی ئەگەر سەرنج بدەین ئیـسلام یەکەم ئایینە کە لە کتێبەکەیدا فەرمانی بە شوێنکەوتوانی کردووە کە بە زانستدا قووڵ ببنەوە و یەکەم وشەش کە دابەزی بۆ پێغەمبەری ئیسلام بریتیبوو لە "إقرأ" واتە بخوێنە.

خوای گەورە دەفەرموێ (إقرأ بسم ربك الذي خلق* خلق الإنـسان مـن علـق* إقـرأ وربـك الأكرم الذي علم بالقلم* علم الإنسان مالم يعلم) العلق (١-٥)، واتە: (ئەی موحەممەد) بخوێنـە بەناوی ئـەو پەروەردگارەتـەوە کـە هـەمو شـتێکی دروسـتکردووە، بخوێنـە لەکاتێکـدا هـەر پەروەردگاری تۆ بەخشندەیە، ئەو زاتەیە کە بەهۆی قەڵەمەوە زانـست و زانیـاری فێرکـردووە، ئادەمیزادی فێری ئەوشتانە کردووە کە نەیزانیون.

هەمووشمان دەزانین کە چۆن ئیسلام هانی زانایانی داوە کار بکەن لـە بـواری زانـستدا و بـە هیچ شێوەیەك ڕێگری لە هـیچ یـەکێکیان نـەکردووە ئـەو شـتە بڵـێ یـان ئـەنجام بـدات کـە دەیەوێت..، ئەگەر مسوڵمانێك خاوەنی ئارەزوو یان بەهرەیەکی لەو جۆرەبوو، فەرمانی پێکراوە کە بە کاری بێنێ وە ئەوەش هاوکات لەگەڵ یاسادانان و فەرمانڕەوایی ئیسلامی دا هاوتەریبو پێکەڵپێك بووە.

بەڵام بارودۆخی ئایینی ئەوڕوپی دەتلاوە بە دەستی دژایەتی کردنی زانست و هەر ئەوەش وایکرد کە کارڵ مارکس و لینین بڵێن " ئایین تلیاکی گەلانە" وە ئەوەش وەسف کردنێکە کە ڕێك لەگەڵ ئەوروپای ئەوسا دێتەوە، ئایینی مەسیحی و سەرکردایەتی مەسیحی لە ڕۆما خەڵکیان بەنج دەکرد و وایان لێ دەکردن کە بە هەموو شێوەیەك لە هەر پێشکەوتنێکی زانستی دوور بکەونەوە و ئەمەش وایکرد پاڵ بە خەڵکیەوە بنێت تا داوای فەرمانڕەوایی دنیایی سیکۆلار Secular بکەن .

ئەوسات ئوممەتی عەرەبی و ئیسلامی خۆشبەخت بوون بەوەی کە لە ژێر سەرکردایەتی دەوڵەتی عوسمانیدابوون، کە هەرچەندە لە سەدەکانی کۆتاییدا دوچاری تاریکیەکی دوور لە زانست و پێشکەوتن بوو، لەوانەشە ئەمە بە هۆی دەستی ئەوروپاوە بووبێت. لە کاتێکدا کە تازە ڕزگاری بوبوو لە دەستەلاتی پاپایی و هەروەها زوڵم و زۆری ئایینی مەسیحی، هەربۆیەش ئەم شەپۆڵە ڕووی لە هەر ناوچەیەکی جیهان کردبایە داخوازی ئەوەی دەکرد کە لە کۆت و بەندی ئایین ڕزگاری بێت و ئازادبێت لەوەی کە دوای هەر شتێکی نوێ بکەوێت, ئیدی ئەوە بوو جۆرە پێشبڕکێیەکی زانستی نوێ پەیدابوو کە وای لە زانست کرد لە ئەوروپا بەرەو گەشەسەندن بڕوات، ئەمەش شکڵی شۆڕشێکی پیشەسازی وەرگرت کە لە سفرەوە دەستی پێکرد و دواتر چەندین دۆزینەوەی تری لێ پەیدابوو..، هەر ئەمەش وایکرد ئیستیعمار و داگیرکردنی ناوچە جیاجیاکان دەستی پێکرد بۆ ئەوەی ئەو ناوچانە بخەنە ژێر ئەو شەپۆلە هزرییەی کە تینوێتی ئەوروپای شکاند. ڕۆژهەلاتیەکان ترسیان پەیدابوو لە داگیرکاری ڕۆژئاوایی و لەمەشەوە لە دەوری دەوڵەتی عوسمانی کۆبوونەوە کە تا دەهات لاوازتر دەبوو هیچ شوێنەوارێکی زانستیشی پێوە دیار نەمابوو، بەڵام تەنها لە پێناوی مانەوەی دەوڵەتەکەیان دەستیان کرد بە هەڵگیرساندنی جەنگ دژی هەرکەسێك داوای ئازادی و پێشکەوتنی دەکرد هاوکات لەگەڵ ئەم

جه‌نگه‌شدا برسیه‌تی و نه‌خۆشی و نه‌خوێنده‌واری تا ده‌هات زیاتر ده‌بوون. وای لێهات ولاّتانی ئیسلامی ده‌یاننالاّند به‌ ده‌ستی ئه‌م ده‌ردانه‌وه‌و تا ده‌هات زیاتریش له‌ پێشكه‌وتنه‌ زانستیه‌كان دورتر ده‌كه‌وتنه‌وه‌ و به‌ڵكو تاریكایی ته‌واو باڵی كێشابوو به‌سه‌ر فه‌رمانڕه‌وایی عوسمانی له‌ ساته‌وه‌خه‌ته‌كانی كۆتاییدا و زۆرێك له‌ خه‌ڵكی له‌ گێژاوی نه‌زانین دا نقوم بووبوون له‌ كاتێكدا ئه‌وروپا ده‌ستی به‌ پێشكه‌وتنی زانستی كردبوو پیشه‌سازیه‌كانی ڕۆژ له‌ دوای ڕۆژ گه‌شه‌سه‌ندنیان به‌ خۆوه‌ ده‌بینی و تاده‌هات به‌رهه‌مه‌كانی خۆیان ده‌خزانده‌ ڕۆژهه‌لاّتی عه‌ره‌بی‌و ئیسلامیمان و ته‌نانه‌ت وای لێهات سه‌راپای بازاڕه‌كانمانی داگیركرد.

كاتێك ئه‌وروپیه‌كان له‌ شێوه‌ی سوپای داگیركاری له‌ ڕۆژهه‌لاّت نزیك بوونه‌وه‌، بزوتنه‌وه‌ تازه‌دامه‌زراوه‌كان داخوازی ڕزگاربوونیان ده‌كرد له‌ فه‌رمانڕه‌وایی عوسمانی كه‌ وه‌كو پیاوێكی نه‌خۆش و په‌ككه‌وته‌ی لێهاتبوو، گه‌لانی عه‌ره‌بی و ئیسلامی ته‌واو له‌ نه‌زانی دا بوون و هیچی وایان تێدا نه‌بوو ته‌نها چه‌ند سه‌ركرده‌یه‌كی هزری نه‌بێ كه‌ له‌ ئه‌وروپا په‌روه‌رده‌ كرابوون و ئاشنابوون به‌ پێشكه‌وتنی ئه‌وروپا كه‌ به‌راورد به‌ ڕۆژهه‌لاّتی ئیسلامی نه‌ده‌كران.

سوپای عوسمانی كه‌ به‌ چه‌پڵه‌ ڕێزانه‌وه‌ به‌ڕێكرا به‌ دۆڕاویی له‌جه‌نگ گه‌ڕایه‌وه‌، نه‌ك هه‌ر ئه‌مه‌ش به‌ڵكو له‌ولاشه‌وه‌ سوپای سیكۆلاری (بێ دینی) له‌ توركیا چاوه‌ڕوانیان بوون، كه‌ ئه‌وه‌بو له‌كارخرانی فه‌رمانڕه‌وایی ئیسلامی ڕاگه‌یانرا و به‌ڵكو هه‌ر شتێك كه‌ سیمای ئیسلامی پێوه‌بێ له‌ جل و به‌رگ و بانگ و قسه‌كردن به‌ عه‌ره‌بی و هتد.. . قه‌ده‌غه‌كرا، هه‌ر كه‌سێكیش پابه‌ندی ئه‌و بڕیاره‌ نه‌بووبایه‌ ڕووبه‌ڕوی سزای قورس ده‌بووه‌وه‌.

پاشان چه‌ند دامه‌زراوه‌یه‌كی مه‌ده‌نی له‌ جیهانی عه‌ره‌بی هه‌ڵبژێردران ئه‌مه‌ش له‌ دوای پارچه‌ پارچه‌كردنی جیهانی عه‌ره‌بی، ئه‌م جاره‌یان شانشین و میرنشین و مه‌شایه‌خ و كۆماره‌كان دروست بوون كه‌ تێكڕای ئیسلامیان په‌ككخست ته‌نها یاساكانی باری كه‌سێتی (أحوال شخصی)

نەبێت، چونکە هیچ بەدیلێکیان نەبوو بۆی، هەروەها دامەزراوە بێدینیەکان درووست بوون و ڕاگەیێندران و ناویان لێندرا عەلمانیەت کە ئەوەی دواییان "عەلمانیەت" بووە زاراوەیەك بۆ ئەو یاسایانەی کە لە تورکیاو ڕۆژهەلاتی عەرەبی کاریان پێ دەکرا.

یەکێ لەوان سیستمی سیکۆلاری پێناسە دەکات و دەڵێ: بریتیە لە بزوتنەوەیەکی کۆمەلایەتی کە ئامانجی ئەوەیە خەڵك وەربچەرخێنێ لە گرنگیدان بە کاروباری دوارۆژ بۆ گرنگیدان بە دنیا بە تەنها.

ئەمە لە لایەك کە لە چاخەکانی ناوەڕاستدا خەڵکی ئارەزویەکی زۆریان هەبوو لە وازهێنان لە دونیا و ڕامان لە خودا و ڕۆژی دوایی، جا لە پێناو بەرەنگاری کردنی ئەو ئارەزووە سیکۆلاریزم هانای بردەبەر گەشەپێدانی لایەنی مرۆیی کە خەڵکی لە چاخی بوژانەوەدا ئەوپەڕی پەیوەستبوونی خۆیان پیشاندەدا بە دەستکەوتی کەلتوری مرۆیی لە پێناوی وەدیهێنانی ئاواتەکانیان لەم ژیانەی ئێستایان. لە مێژووی نوێدا پێشوازیکرد لە سیکۆلاریزم تا دەهات لە گەشەسەندن دابوو بەو پێیەی کە بزوتنەوەیەکە دژی ئایین و مەسیحیەت دەوەستێ.

کەوابوو ئەو بزوتنەوەیە هیچ پەیوەندیەکی بە زانستەوە نی یە بەڵکو لەسەر بنەمای ڕەتکردنەوەی ئایین و بنەماکانی ئایین لە ژیان سەری هەڵداوە.

جیاوازی نێوان ڕۆژهەلات و ڕۆژئاواش لە وەرگرتنی سیکۆلاریزم لەوەدایە کە ڕۆژئاواییەکان ڕێیان لە خەڵکی نەگرتووە دروشمە ئایینیەکانیان بە جێ بگەیەنن و هەروەها ڕێشیان داوە بە کڵێسا ناقۆسی خۆی لێبدات، بەلام لە ڕۆژهەلات کاتێك ئەم بزوتنەوەیە سەری هەڵدا حکومەتی ئەتاتورك هەڵسا بە ڕێگرتن لە هەموو دیاردەکانی عەرەبی و ئیسلامی تەنانەت ئێستاشی لەگەڵدابێ تورکیا لە ژێر چەتری هەندێك لەو ڕێگرتنانەدا دەژی.

ولاتە عەرەبیەکانیش پێشبڕکێی یەکتر دەکەن لە دژایەتی کردنی ئایین و ڕێگرتن لە دیاردەکانی، هەندێك لە ولاتان کەمێ پابەندیان بە ئایینەوە هەیە بەلام لە بارێکی دژیەك دایە لەگەڵ ئاییندا چونکە چاودێری دەخاتە سەر نوێژخوێنەکان و چاو لە خەڵکی دیندار سوردەکاتەوەو زیندانیانی جیهانی عەرەبی و ئیسلامیش پڕە لە ئەهلی دین.

وای لێهاتووە سیکۆلاریزم بۆتە داوایەکی فەرمی زۆرێك لە دامەزراوەکانی جیهانی ئیسلامی بە تایبەتی پاش ڕوخانی ڕژێمی سەدام حسێن لە بەغدا..

مامۆستا محمد قوتب زۆر بە جوانی باسی ئەوە دەکات کە سیکۆلاریزم بەرهەمی هەڵگەڕانەوەی کڵێسایە لە دینی خوا جگەلە شێواندنی ئایینەکە و پێشاندانی بە خەڵکی لە وێنەیەکی دابڕێنراودا بە بێ ئەوەی خەڵکی هیچ سەرچاوەیەکیان هەبێ کە بگەڕێنەوە بۆی لە پێناوی چاککردنەوەی ئەو بێ سەرو بەریە و گەڕاندنەوەی بۆ بنەڕەتە ڕاستەکەی کە لە لایەن خواوە نێردرابوو، هەروەك چۆن قورئانی پیرۆز پارێزراوە (بە ویستی خوای گەورە) لە هەر دەستتێوەردان و چەواشەکاریەك لە هەر چاخێکدا.

وێنەی ڕاستەقینەی ئاین لە ئەوروپا لە عەقیدەیەکی چەواشەکراودا خۆی دەبینیەوە کە لە ئینجیل وەرگیرابوو کە پاش ماوەیەکی درێژ دوای مەسیح نوسرابۆوە، هەروەها نوێژ و پیرۆزیەکان و ئامۆژگاریەکان و بۆنە ئایینیەکان خۆی دەبینیەوە کە لە کڵێسادا ساز دەکران، وە ئاین بریتیبوو لە زاڵبوونی پیاوانی ئایینی لەسەر پاشاکان و خەڵکی بە گشتی. ئەوەمان بینی کە چۆن پاشاکان نەیاندەتوانی لە سەر تەختی پاشایی دابنیشن مەگەر بە مۆڵەتی پاپا نەبێت و هەرکاتێکیش پاپا لێیان تورە بووبا خەڵکیشی لێ هەڵدەگەڕاندنەوە، خەڵکی ملکەچی تەعمیدی کاهینەکان دەبوون و هەروەها تەنها بە ئامادەبوونی کاهین نوێژەکانیان ئەنجام دەدا، باوەڕیشیان بە هیچ نەدەکرد تەنها ئەوە نەبێ کە ئەنجومەنی کڵێسای دانیشتوان لە کاروباری بیروباوەڕدا پێیانی ڕادەگەیاندن، تەنها بیریان لەو شتانە دەکردەوە کە پیاوانی ئایینی ڕێگای بیرلێ کردنەوەی پێدابوون، فێری هیچ شتێکیش نەدەبوون تەنها ئەوە نەبێت کە کڵێسا ڕێگای پێدەدان کە فێری بن، پیاوانی ئایینی دەستەلاتی تەواویان هەبوو بەسەر ماڵ و لاشەو گیانەکانیان. جا ئایینێك بەم شێوەیەبێ هیچ سەرسوڕمانیەك نابینین ئەگەر شوێنکەوتوانی

پشتی تێ بكەن پاش ناسینی، بەلاَم ئەمە دواتر لەسەر "تێكڕای ئایینەكان" ڕەنگی دایەوە تەنانەت ئەو ئایینەش كە فەرمانیان پێ بكات بە شتێك كە زانستە و پێشكەوتنە هەر وەك ئەوەی كە لە ئایینی ئیسلامدا بەدی دەكرێ .

كاتێكیش مەسیحیەكانی ئەوروپا پشتیان لە دین كرد هیچ جیاوازیەكیان لە نێوان پوچیەكانی كلێسا و ڕاستیەكانی ئاین بەدی نەكرد، هەر بە جارێك ڕەتیانكردەوەو دواتر بە دوای ئایینی ڕاستەقینە و ڕاستیەكاندا نەگەڕان، بەم شێوەیە ڕوو لە ئاین وەرگێڕان و خۆ داماڵین لێی بووە پێویستیەكی هەنوكەیی لە ئەوروپا بۆ پێشكەوتن و شارستانی بوون و ژیان.

دەشتوانین ئەو قۆناغەی كە ئەوروپا پێیدا تێپەڕی لە حاڵەتی وابەستەبوونی بە ئایینی كلێسا لەم خاڵانەدا بە گوشراوی بخەینە ڕوو:

١-ئاین پڕبوو لە خوڕافیات و ئەفسانە.

٢-ئاین دژایەتی زانستی دەكردو هزری تەسك كردبۆوە و ئەوانەشی دەسوتاندن و لەناودەبردن كە پەیوەست بوون بە زانستەوە.

٣- ئاین دنیای بە هەموو شێوەیەك پشتگوێ خستبوو، پشتی تێكردبوو لە پێناو یەكلابوونەوە بۆ ڕۆژی دوایی.

٤- ئاین لاشەی بوغزاندبوو، ئازاری دەدا لە پێناو یەكلابونەوە بۆ گیان .

٥- دەرەبەگەكان بۆیان هەبوو خوێنی جوتیارەكان لە ژێر پەردەی ئاییندا بمژن و سەروەت و سامان كەڵەكە بكەن و هەروەها لە خۆشڕابواردن و گەندەڵی دا بژین.

٦- جوتیارەكان ناچار دەكران ئەو واقیعە لە پێناوی ڕەزامەندی خوا و بەهەشتەكەی كە لە ڕۆژی دوایی دایە قبوڵ بكەن، تا دوایی پاپا بلیتی لێخۆشبوون (سكوك الغفران) ی داهێنا لە پێناوی كڕینی ڕۆژی دوایی.

٧- نەخوێندەواری و نەزانی بە درێژایی چاخەکان لە ناو خەڵکی دا تەشەنەیان کردبوو بڵاوبوبونەوە.

٨- ئەنجومەنەکانی کڵێسا هەڵدەستان بە داڕشتنی ئەو بیروڕایانەی کە کەسێکی مەسیحی دەبوو پێیەوە پابەندبێت بە جۆرێك کە هیچ کام لەو بیر و ڕایانە ئەوە نەبوون کە لە ئینجیل دابەزیبوون و بگرە ئینجیل هەر شوێن بزربوو و شوێنی پڕکرایەوە بە چەند ئینجیلێك کە چەند کەسێك پاش مەسیح بە ماوەیەکی درێژ دایاننابوو.

## ئیسلام و مەسیحیەت:

کاتێك مسوڵمانەکان خۆیان خزاندە نێو ئەوروپا و تێکەڵ بە ژیانیان بوون، جیهانێك بەدی کرا کە نە پاپا و نە پیاوی ئایینی و نە مەتەڵی بیرو ڕای تێدابوو وەکو مەتەڵەکانی کڵێسا کە تەنها چەند کەسێکی کەم لەبارەیانەوە شارەزابوون، وە هەروەها ئەوەیان بەدی کرد کە ئەم ئایینە ئەشراف و دەرەبەگی تێدا نەبوو تا خەڵکی بکەنە کۆیلەو عەقڵ و زانستەکانیان تەسك بکەنەوە، بەڵکو تەواو بە پێچەوانەوە بوو.

ڕۆجەر بیکۆن (کە لە سەدەی ١٣ دا ژیاوە) دەڵێت:" هەرکەسێك دەیەوێت زانست فێر ببێت با خۆی فێری عەرەبی بکات چونکە عەرەبی زمانی زانستە".

کە دیارە مەبەستی لەو زمانە زمانی قورئانی پیرۆزە چونکە ئەوانەی قسەی پێ دەکەن مسوڵمانن و ئیسلامیان کردۆتە بەرنامە و بڕوایان بە قورئان هەیە.

جا بەم شێوەیە ئەوروپا لە تاریکیەکانی سەدەکانی ناوەڕاست ڕزگاری بوو کاتێ لەگەڵ مسوڵمانەکان تێکەڵ بوون لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوای زەوی جا چ بە هۆی جەنگە خاچپەرستیەکان بووبێت یان بە هۆی ئەو قوتابیانە بێ کە بۆ خوێندن دەنێردرانە قوتابخانە

مسوڵمانەکان لە ئەندەلوس و بەغداد و سەقلیە و زۆری تر لەو وڵاتانەی کە ئیسلام ڕوناکی کردنەوە، تەنانەت پیاوانی ئایینی مەسیحیش لەو قوتابخانە ئیسلامیانە ڕۆشنبیری ئیسلامیان دەخوێند، یاخود وەریاندەگێڕان بۆ زمانە ئەوروپیەکان، بەمەش پلەی "ئەکلیروس"یان دەدا هەر کەسێك لە خۆیان کە زۆرترین ڕۆشنبیری ئیسلامی وەرگرتبێت.

مسوڵمانەکان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا نوێنەرایەتی هزری زانستی و ژیانی پیشەسازی زانستی یان دەکرد، خاوەنی زانکۆی ئیسلامی بەربڵاو بوون لە ئیسپانیای ئیسلامی(ئەندەلوس) و قوتابخانەکانی ڕۆژهەڵات (بەغداد، دیمەشق، قاهیرە) وە هەروەها بوونە هۆکارێك بۆ ژیاندنەوەی زانستی یۆنانی کۆن کە بەر لەوان زۆر زەحمەت بوو بۆ ئەوروپیەکان لێی تێبگەن، بە هەمانشێوە ئەوروپیەکان ئەو بنەما ژیاریانە فێربوون کە لای مسوڵمانان دەست دەکەوت و پڕۆگرامی ئەزمونی لە توێژینەوەی زانستی لە عەرەبەکان فێربوون، تا دوایی وای لێهات بووە پڕۆگرامیان و لە بری ئایینەکەیان پەیڕەویان دەکرد. ئیتر بەم شێوەیە ژیان و هەڵسانەوەیان لەسەر بنەمای ئایینی ئێمە بنیاتنرایەوە و شارستانیەتەکەیان لە سەر بنەما مرۆییەکان بنیات نایەوە، لە کاتێکدا بناغەو بنەما ئیسلامیەکان ببونە باکگراوندی ژیار و بوژانەوەمان، کاتێکیش لەوەدا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا ئایینیان کردە خاڵی دواکەوتنی ئەو بوژانەوەیە چونکە پەیوەندی بە دوارۆژەوە هەیە نەك دونیا، بوژانەوەکەشیان دونیاییە. ئینجا دژایەتی هەموو ئایینەکانی جیهانیان کرد لەوانەش ئیسلام بە بێ ئەوەی بە دوای ڕاستیەکاندا بگەڕێن.

ئایینەکەیان هەروەك باسمانکرد تەنها دوارۆژی مەبەست بوو دونیاشی پشتگوێ خستبوو، بەڵام قورئانی پیرۆز دەفەرموێ (وابتَغ فِيمَا اتَاكَ اللهُ الدَّارَ الأخِرَةَ ولاتَنسَ نصِيبَكَ مِنَ الدُّنيا)[١] واتە: هەوڵبدە بەو ماڵ و سامانەی خوا پێی بەخشیوی ماڵی قیامەت و بەهەشتی بەرین بکڕەو

---

١ سورەتی القصص، ئایەتی ٧٧

بەشی خۆیشت له دونیادا بەحەلاڵی فەرامۆش مەکە. هەروەها دەفەرمویٚ ( قُل مَن حَرَّمَ زِينَةَ اللهِ التي أَخرَجَ لِعِبادِهِ وَالطَّيباتِ مِنَ الرِّزق قُل هِي لِلذينَ امَنوا في الحَياةِ الدُّنيا خالِصَة يَومَ القِيَامَة)[٢] واته: (ئەی موحەممەد) پێیان بلێ ئەوه کێیه پۆشاك و زینەت و جوانییەکانی لەبەندەکانی حەڕامکردووه که له بنەڕەتدا خۆی بۆی وەدیهێناون؟ هەروەها ئەوه کێیه ڕزق و ڕۆزیه چاك و پاکەکانی حەڕامکردووه؟ بەوخەڵکه بلێ هەمو ئەوشتانه بۆ ئیماندارانه له ژیانی دونیاو لەکاتێکدا پاڵفتەن لە ڕۆژی قیامەتدا، ئابەو شێوەیه ئایەت و فەرمانەکان ڕوون دەکەینەوه بۆ کەسانێك که بزانن و هۆشیار بن. قورئانی پیرۆز داوا له مسوڵمانان دەکات له دنیادا کار بکەن بۆ ئاوەدانکردنەوەی زەوی و له هەمانکاتدا بۆ دوارۆژیش کار بکەن.

سیکۆلاریزمی ڕۆژئاوا دەستی کرد به ڕزگارکردنی پاشاکان له کۆت و بەندی پاپا له کاتی سەرهەڵدانی کڵێسای پرۆتستانتی دا، ئەمەش ڕێخۆشکەربوو بۆ سەرهەڵدانی شۆڕشی پیشەسازی که ژیانی خەڵکی به توندی هەژاند، ئیدی بیرۆکەی یەکسانی دوو ڕەگەزەکه له کارکردندا هاته ئاراوه، گەندەڵی ڕەوشت و تێکچونی ڕەوشتی کۆمەڵگای ئەوکاتی لێ هاتەکایەوه له ژێر ناوی "پێشکەوتن" که چەندین گۆڕانی تری له بنیاتی ڕەوشتی کۆمەڵگا لێ پەیدابوو.

## بوارەکانی سیکۆلاریزم:

سیکۆلاریزم دوای سەرهەڵدانی ورده ورده بەرەو سیکۆلاریزمی ڕامیاری و سیکۆلاریزمی ئابووری و سیکۆلاریزمی ڕەوشتی دەڕۆیشت، بەم شێوەیه کۆمەڵگا ئاراستەی بەرەو شێوازێکی تری ژیان گۆڕا که هیچ پەیوەندیەکی ئەوتۆی به خواوه نەبوو بەو ئەندازەیەی که پەیوەندی به مرۆڤەوه بوو، تەواو ملی له ئایین وەرگێڕا، پەیوەندی مرۆڤیش به ئایین تەنها له چوارچێوەی

---

[٢] سورەتی الاعراف ئایەتی ٣٢

ئینتیماو ناسنامەی بیرو ڕایەکی دیاریکراو چڕکرایەوە لە ناوچەیەکی دیاریکراو کە پێی دەوترا کڵێسا، نوێژ کردن تێیدا و ئەندام بوون لێی هەمان ئەو ئینتیمایەی هەبوو وەك بڵێی لە کۆمەڵەیەك یان دامەزراوەیەکدا ئەندام بیت.

کاتێکیش ئەو شێوەیەی ژیان لە ئەوروپا سەرکەوتنی بە دەست هێنا بە کەسب کردنی مرۆڤی ئەوروپی، ئەو کەسانەی کە خاوەنی بەرژەوەندی بوون (کە دواتر لە بابەتی سەرمایەداریو شیوعیەتدا دێینە سەریان) وای بۆ چون کە ئەو شێوازەی ژیان بگوازنەوە بۆ ولاّتانی عەرەبی و ئیسلامی، چونکە دەیانزانی دەرهێنانی مرۆڤی مسوڵمان لە شێوازە دینداریەکەیەوە بۆ ئەو شێوە سیکۆلاریزمیە وابەستەبوونی بە ئایینەوە لاواز دەکات، چونکە ئەم ئایینە مەترسی هەبوو لەسەریان بەتایبەت لەو ماوەیەی کە بڕیاریان دا خاکی مسوڵمانان دابەش بکەن و بیخەنە پاڵ ئیستیعمارەکانیانەوە لە کاتێکدا ئایین فەرمان دەکا بە ڕوبەڕوبوونەوە لەدژیان.

لەمەشدا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا کاتێك عەرەب و مسوڵمانەکانیان لە ئینتیمای عوسمانیەوە دەرهێنا بەرەو دامەزراندنی چەند حکومەتێکی "مەدەنی" بۆ هەر هەرێمێك و دابڕینی لە ئیسلام لە ڕێگای دانانی یاسای مەدەنی و بلاّوکردنەوەی گەندەڵی لە ڕێی کەلتور و نێردراوە تەبشیریەکانیان، کە ئەوکات و ئێستاشی لەگەڵدا بێت خزمەتی دەزگا هەواڵگریەکانی ڕۆژئاوا دەکات زیاتر لەوەی کە خزمەتی ئەو ئایینەی خۆیان بکات کە ڕویان لێ وەرگێڕا.

**١- سیکۆلاریزمی ڕامیاری:**

کڵێسا پاپای بە جێنشینی خوا لەسەر زەوی دادەنا چونکە هەر پاپا بوو کە دەیتوانی پاشاکان دابنێ و لایان بدات، هەر کەسێکیش لەسەر هەر پلەو پۆستێك دابنێ کە ئارەزوی لێ بێت، دواتریش بە ئارەزوی خۆی لای ببات. پاپا دەستەلاّت و شکۆمەندی ڕەهای هەبوو بەسەر هەموو مەسیحیەکان چ حاکم بان یان مەحکوم بان، بەلاّم لە کۆتاییدا فەرمانڕەواکان لە پاپا هەڵگەڕانەوەو داوای دەستەلاّتی کاتی یان دەستەلاّتی دنیاییان دەکرد، دواتریش توانیان بەدەستی بێنن و بڕیاریان لەسەردا، پاش چەندین شۆڕش و هەوڵ و کۆشش خەڵکێکی زۆر

شایەتیان بۆ ئەمە داو لەسەر یاسای (ئامانج ڕەوایی دەدات بە هۆکار) تەنانەت ئەگەر ئامانجەکەش ناپاك بوایە. چالاوی سیکۆلاریزم ڕێی خۆی دۆزیەوە هەر لەو ساتەی کە ڕامیاری لە ئایین جیاکرایەوە و پەیوەندی بە ڕەوشتی ئایینیەوە نەما هیچ جێیەك بۆ ڕەوشت نەما لە کایەی ڕامیاری، خراپترین جۆری دیکتاتۆریەت سەری هەڵدا لە شیوعیەت و فاشیەت، دروشمی درۆی ڕامیاری هەڵبژاردن زیادی کرد. لە ڕامیاری دەرەوەدا یاسای دارستان جێبەجێ کرا واتە هێز بەدەست زۆرینەیە، ئەوەبوو دواتر داڕوخانی کۆمەڵایەتی و لێدانی قونبەلەی ناوەکی لە هەندێك لە گەلان سەریان هەڵدا جگە لە بەستنی چەند پەیماننامەیەك کە بەهێزەکان بەهێزتر دەکەن و لاوازەکانیش دەخەنە ژێر پێ، سیاسەتەکانی ئەمریکای سیکۆلاریش لە تێکڕای جیهاندا بەڵگەیەکی زۆر ڕوونە لەو بارەیەوە.

**٢- سیکۆلاریزمی ئابوری:**

سیستمی ئایین لە ئەوروپا دەرەبەگی بوو کە زەڕەیەك دادگەری تیانەبوو، مرۆڤ بێ بایەخ بوبوو، هیچ نرخێکیشی نەمابوو، سیکۆلاریزم تاکە ڕێگابوو کە ئەوروپیەکانی ڕزگارکرد لەو دۆزەخە، بەڵام دواتر خۆیان خستە نێو دۆزەخی جیهانی سەرمایەداری و شیوعیەت. خەڵکی دەستیان کرد بە توێژینەوە لەبارەی سروشت لە جێگای گەڕان بە دوای خوا، ئەو هۆکارە نەگریسانەی کە سەرمایەداری بۆ بەدیهێنانی مەبەستەکانی بەکاری دەهێنان ڕەواییان پێ درا، لەوانە:

١- سو.

٢- قۆرخکردن.

٣- هەوڵدان بۆ وەدەستهێنانی قازانجی بێ سنوور تەنانەت ئەگەر لە ڕێی هۆکارێکی نەگریسیش بێت.

شیوعیەتیش خەڵکی زەلیلی تیکەنانی ژیان کرد بە شێوەیەك کە هیچ گەلێکی تر ئەمەی بە چاوی خۆی نەدیبوو، سیستمی پۆلیسی توند بە ئاگر و ئاسن و هەواڵگری و ئاژاوەو

دوبه‌ره‌كی نانه‌وه له نێوان لایه‌نگران و نه‌یارانی حزب فه‌رمانڕه‌وایی خه‌ڵكی ده‌كرد، له ئه‌نجامدا هه‌موو به‌ها شارستانیه‌كان له‌ده‌ست چوون.

دوای ئه‌وه چه‌ند پارتێكی تری ئیشتیراكی(سۆشیالیستی) هه‌مان ئه‌و ڕێگه‌یه‌ی شیوعیه‌تیان گرته‌به‌ر، خه‌ڵكی تالاّوێكی تریشیی جیا له تالاّوی سیستمی ده‌ره‌به‌گایه‌تی چه‌شت و له‌مه‌شه‌وه له پێناو جێبه‌جێ كردنی سیستمی شیوعیه‌تدا مرۆڤ هه‌موو سه‌ختیه‌كی بینی، لێره‌دا سیكۆلاریزمی ئابووری بووه نه‌فره‌تێك له مرۆڤایه‌تی و بووه بارێك ئه‌گه‌ر قورستر نه‌بووبێ ئه‌وا هیچ سوكتر نه‌بوو له سیستمی ده‌ره‌به‌گایه‌تی.

### ٣- سیكۆلاریزمی كۆمه‌لاّیه‌تی:

هه‌ندێك داب و نه‌ریتی ئایینی كۆمه‌ڵگاكانی ئه‌وروپیان به‌ڕێوه ده‌برد بۆ نمونه پارێزگاری كردن له خێزان و ژنهێنان و شوو كردنی زوو، هه‌روه‌ها قیوامه‌تی پیاو و هه‌ڵسانی به دابین كردنی بژێوی و مانه‌وه‌ی ئافره‌ت له ماڵه‌وه‌ی و نه‌هاتنه ده‌ره‌وه‌ی و سه‌رقاڵبوونی به دایكایه‌تی و كاروباری ماڵه‌وه‌و چاودێریكردنی منداڵ و پارێزگاری كردن له ناموسی پێش هاوسه‌رگیری و دوای هاوسه‌رگیری، ئه‌و بنه‌مایانه له‌سه‌ر ئایین بنیات نرابوون ته‌نانه‌ت له كۆمه‌ڵگا ده‌ره‌به‌گایه‌تیه‌كانیش، له كاتی داماڵینی كۆمه‌ڵگای ئه‌وروپی له ئایین ورده ورده له‌و سیكۆلاریزمه نزیك ده‌بووه‌وه كه چیتر گرنگی به‌و بنه‌مایانه‌ی پێشوو نه‌ده‌دا، شۆڕشی پیشه‌سازی سه‌ری هه‌ڵداو بنیاتی كۆمه‌ڵایه‌تی ئه‌وروپی له‌رزاند و ئه‌و كۆت و به‌نده ئایینیانه نه‌هێڵران كه ئافره‌ت وابه‌سته‌ی كۆمه‌ڵگا ده‌كات و سه‌رقاڵی ده‌كات به په‌روه‌رده‌كردنی منداڵ، ئه‌گه‌ر مرۆڤ ته‌نها چاوێك له كۆمه‌ڵگای ئه‌وروپی و ئه‌مریكی لێكهه‌ڵوه‌شاو بكات ڕاستیی ئازادی ئافره‌تی بۆ ڕوون ده‌بێته‌وه كه چۆن بناغه‌ی خێزانی لێكهه‌ڵوه‌شاندۆته‌وه، ڕێژه‌ی ته‌لاّق زیاتره له هاوسه‌رگیری و، دایه‌نگه‌كان پڕبوون له‌و منداڵانه‌ی كه بێ باوكن و ناشه‌رعین یاخود له ئه‌نجامی لێكجیابوونه‌وه‌ی دایك و باوكیان بێ سه‌رپه‌رشت ماونه‌ته‌وه، زۆرێك له خه‌ڵكی منداڵی دۆزراوه ده‌كه‌ن به منداڵی خۆیان چونكه خێزانه‌كان ئاره‌زووی منداڵ بوونیان نی یه

یاخود دووچاری نەزۆکی بوون لە ئەنجامی بەکارهێنانی دژە سکپڕی و هەڵگرتنی ڕەحمی ئافرەت. بەم شێوەیە سیکۆلاریزم لە ئەوروپا و ئەمریکا بووە هۆکاری داڕوخانی کۆمەڵگاو لێکترازاندنی.

**٤- سیکۆلاریزمی زانستی:**

ململانێی نێوان ئایینی کڵێسا و زانست لەوپەڕی دابوو، زۆرێك لەوانەی کە بە زانستەوە خەریك بوون کوژران و سوتێندران باسیشمان کرد کە ڕای ئیسلام بەرامبەر زانست چۆنە کاتێ کە ئاوەدانکردنەوەی زەوی بە پەرستش داناوە. ئەی چی بەسەر زانست داهات لەو چاخەی کە کۆمەڵگای ئەوڕوپی پشتی لە ئایین کردو بووە کۆمەڵگایەکی سیکۆلاری؟:

زانست بەکارهێنرا بۆ بڵاوکردنەوەی ئیلحاد و گەندەڵی ڕەوشتی ( بۆ نمونە سەیری بەکارهێنانی حەبی دژە سکپڕی بکە کە لە ئەوروپاو ئەمریکا بەکار دەهێنرێ و هەروەها سەیرکە چۆن لاشەولار بەمەبەستی داروخاندنی ڕەوشت و دوور لە واتای مرۆیی بەکاردەهێنرێن و..هتد).

زانست بووە هۆکارێك بۆ بڵاوکردنەوەی داوێنپیسی و داهێنانی چەکی کۆمەڵکوژ و خاپوورکردنی خەڵك و هەموو هەوڵێکیش لەم بارەیەوە خرایە گەڕ، وێنەمان زۆرە لەم بارەیەوە بۆنمونە جەنگە جیهانیەکان و جەنگە لاپەڕەکان کە ڕۆژئاوا دژی وڵاتانی ئیسلامی ڕایگەیاند کە تا ئێستاش بەردەوامە لە عێراق و ئەفغانستان و پێشتریش لە ڤێتنام و لە هەموو ئەو ناوچە ئیسلامیانەی کە لە ژێر داگیرکاری ڕوسیا و چیندا دەتلێنەوە.

**٥- سیکۆلاریزمی ڕەوشت:**

ئایین سەرچاوەی ڕەوشتە.. دەستەڵاتی پاپایی زاڵ بەسەر گەلانی ئەوروپا هەموو مانا ڕەوشتیەکانی ئایینی مەسیحی تێکشکاند، لە کاتێکدا کە مەسیحیەتی پێشوو بە یەکێ لە ئایینە ڕەوشتیەکان دادەنرا... بەڵام سیستمی دەرەبەگایەتی ڕەوشتی لەناوبرد و بەو هۆی ئەوەی کە بنەماکانی ڕەوشت بەرەبەرە دابڕوخێن، هەرچەندە چاخی بوژانەوەی ئەورووپی بە

مەبەستی گێڕانەوەی ڕەوشت و بەهاکان بۆ سەر ڕێڕەوی ڕەسەنی خۆی هاتەکایەوە بەلاّم بە هۆی دووباره دورکەوتنەوەی خێرایان لە بەهاکان، چاخی پیشەسازی دیسانەوە ڕەوشتی داڕوخاند چونکه کۆمەڵگای له ڕەوشت دوورخستەوە، هەر لەگەڵ هاتنی سەدەی بیستەم بەها ڕەوشتیەکان لە ئەمریکا و ئەوروپا لەناوچووون و ماناکانیان گۆڕا، هیچ بەهایەکی ڕەوشتی نەما کە هەماهەنگ بێت لەگەڵ ئەو ناوەی کە لێیان نابوو. بەها سیکۆلاریە ڕەوشتیەکان بوونیان هەیە بەلاّم ئەم بەهایانە تەنها لە پێناو بەرژەوەندیەکانن و بە پێی گۆڕانی بار و دۆخ گۆڕانیان بەسەردا دێت... ئەگەرچی ئێستا بەها ڕەوشتیە ئیسلامیەکان ماون بە هەموو ماناو شێوەکانیان بەلاّم کۆمەڵگای ئیسلامی چووەتە نێو سیکۆلاریزم چ بە خواستی خۆی یان بە زۆربێت... لەگەڵ ئەوەشدا مسوڵمانان هێشتا لەسەر ئەو سیستمە ئایینیەبوون کە لەسەریانی پێویست دەکرد بە بنەماکانی ڕەوشتەوە پابەند بن بەلاّم وردە وردە ڕەوشت لاوازدەبیوو بەرەو نەمان دەچوو، چونکە مسوڵمانان خەریك بوو دەڕوخان، بە ڕوخانیشیان بێ گومان ڕەوشت لە ناودەچێت.

### ٦- سیکۆلاریزمی هونەر:

هونەری ئەوروپی بە هونەری (پەرستراو) دادەنرێت لە هەموو سەدەکان دا، سەرەتا هونەری خواوەندە ئیغریقیەکان بوو دواتریش بووە هونەرێك کە وێنەی کلێسای پاپایی دەکێشا. لە چاخی سیکۆلاریزمدا مرۆڤ بۆتە (پەرستراو) لە کاتێکدا کە مرۆڤ لە بارێکی بێ سەروبەری دا دەژی، هونەریش هەر لە بێ سەروبەری دا دەژی. سیکۆلاریزمی داماڵراو لە ئایین جیهان لە واقیعیەتەوە دەگۆڕێ بۆ سوریالیزم و بۆ وجودیەت و بۆ ناماقوڵیەت و بۆ ئەدەبی سێکسی ئاشکرا، کە ئەمانە هەمووی ڕاکردنە لە (مەعقول) بە شێوەیەك کە وای دەبینن بوونەوەر هیچ ئامانج و مەبەست و دادگەری و ڕاستی نی یە، هەموو شتێك گومڕایی و بێسەروبەرییە لە

کاتێکدا که ئه‌گه‌ر ژیان بێ خاوه‌ن بێت که‌واته بوونی مرۆڤ له هه‌موو بارێکدا بـه فیڕۆچـووه، شـه‌رعیه‌تیان داوه بـه ئـه‌ده‌بی سێکـسی ڕوخێنـه‌ر و ناویـشیان لێ نـاوه هونـه‌ر، شـانازی ڕه‌تکردنه‌وه‌ی ڕه‌خنه‌ش ده‌کات به‌که‌شخه‌و له‌خۆباییبوونه‌وه‌و ده‌روونی گه‌وره‌یه که‌چی لـه بـاری ڕوخان دایه. ئه‌وه‌یه که سیکۆلاریزم کۆمه‌ڵگای ئه‌وروپی توش کردووه، که‌واته ئه‌وروپا هیـچی بۆ نه‌ماوه‌ته‌وه له ئایین (ئه‌گه‌ر ئایینی بوێت) ته‌نها یه‌ك کاتژمێری هه‌فتانه نـه‌بێت لـه کلێـسا که که‌سی وا هه‌یه بۆ ئه‌مه‌ش ناچێ، وای لێ هاتووه که په‌یوه‌ندی یه کۆمه‌ڵایه‌تی‌یه‌کانی نێوان تاکه‌کان و کۆمه‌ڵه‌کان لاوازبووه، ئه‌وشتانه‌ش به شێوه‌یه‌کی سروشتی سه‌یر ده‌کرێت، بـۆ نمونـه په‌یوه‌ندیه سێکسیه له‌ڕێ ده‌رچووه‌کان به شتێکی ئاسایی سه‌یر ده‌کرێن که نه له‌گه‌ڵ ئایین و نـه له‌گه‌ڵ ڕه‌وشتدا ده‌گونجێن.

## سیکۆلاریزم و ئیسلام:

ئه‌گه‌ر بمانه‌وێ به‌راوردێك له نێوان سـیکۆلاریزم و ئیـسلام بکـه‌ین ده‌تـوانین لـه‌م خالانـه‌دا پوختی بکه‌ینه‌وه:

١- ئیسلام مه‌بده‌ئه که‌چی سیکۆلاریزم بێ مه‌بده‌ئی یه.

٢- ئیسلام ئایینه و په‌یوه‌ندی هه‌یه به ڕامیاری و ئـابوری و کۆمـه‌ڵگا و پـه‌روه‌رده‌و.... به‌لاّم سیکۆلاریزم ئه‌م په‌یوه‌ندیه ڕه‌ت ده‌کاته‌وه.

٣- ئیسلام یاسادانانێکی خوایی یه، له کاتێکدا سیکۆلاریزم ئایین ڕه‌ت ده‌کاتـه‌وه‌و مـرۆڤ له هه‌موو یاسا ئایینیه‌کان دوورده‌خاته‌وه.

٤- ئیسلام به به‌رزی ڕه‌وشت جیا ده‌کرێته‌وه له مامه‌ڵه‌کاندا که‌چی ڕه‌وشـتی سـیکۆلاریزم ڕوخاوه له هه‌موو بوارێکدا ... به‌ڵکو هه‌ندێ جار ده‌گاته ئاستی ڕه‌تکردنـه‌وه‌ی هـه‌موو بـه‌ها ڕه‌وشتیه‌کان.

٥- مسوڵمانەکان لە حوکم کردندا پەنا دەبەنە بەریاسا خواییەکان بەلاَم سیکۆلارەکان پەنا دەبەنە بەر یاسا دانراوەکانی مرۆڤ .

٦- بەها و یاسا ئاسمانیەکان بە جێگیری و دادگەری دەناسرێنەوە بەلاَم یاسا دانراوەکانی مرۆڤ بە ناجێگیری و نادادگەری دەناسرێنەوە.

# جیهانگیری

## پێناسەی جیهانگیری: Globalization

بەڕای هەندێ لە لێکۆڵەران جیهانگیری نوێ بەرەنجامێکی حەتمی پێشکەوتنەکانی سەرمایەداری یە کە بەرەو ئاراستەی خاوەنداریێتی و زاڵبوون و هێزی ئابووری ڕۆیشتووە. ئەمەش دروستبوونی کۆمپانیای نێونەتەوەیی لێ کەوتەوە کە دەبێتە هۆی دەستبەرداربوونیان لە دەوڵەتە نەتەوەییەکان کە هەر لەگەڵ سەر هەڵدانی سەرمایەداری سەریان هەڵدا و ڕۆڵێکی گرنگیان گێڕا لە گەشەسەندنی سەرمایەداری و بڵاوکردنەوەی.

جیهانگیری بریتیە لە باڵادەستی ڕۆژئاوا بە تایبەت وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەڕوی ڕامیاری و ئابووری و کەلتوری ئەمە سەرەڕای دەستبەرداگرتنی پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکان.

**چەمکی جیهانگیری دەکرێ لەم خاڵانەدا چڕ بکرێتەوە:**

١- جیهانگیری هزرێکە کە بەرهەمی لێکۆڵینەوەیەو، وەکو بەدیلی ئیستیعمار دۆزرایەوە. لەسەرو بەندی جەنگی جیهانی دووەم دەستی پێکرد و دامەزراوەی کارگێڕی و ئابووری بۆ دروستکرا لەوانە: دەستەی نەتەوە یەکگرتووەکان و سندوقی نەختینەیی نێودەوڵەتی و ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی بەمەش جیهانگیری بووە کرداری داپڵۆسینی گەلانی تر.

٢- فراوانبوونی زۆر گەورە لە بەجیهانیکردن لە لایەن کۆمپانیا نێودەوڵەتیەکانەوە هاوشان لەگەڵ شۆڕشی بەردەوامی پەیوەندیەکان و زانیاریەکان وای لە هەندێ کەس کردووە وا بیربکەنەوە کە جیهان بە تەواوی گۆڕاوە بۆ گوندێکی جیهانیی بچووك.

٣- ڕەواڵەتە سەرەکیەکەی جیهانگیری بریتیە لە گردبوونەوەی ئابوری وڵاتە زلهێزەکان بۆ وەبەرهێنانی سامانی جیهان و کەرەستە خاوەکانی و بازاڕەکانی لە سەر حیسابی وڵاتە هەژارەکان و دەستبەسەراگرتنی ناوەندی ئابووری ئەو وڵاتانەی کە لە پەنجاکان و شەستەکان

ویستیان سەربەخۆیی وەرگرن لە ماوەی بزوتنەوەی رزگاری نەتەوەیی و پاشان بەرەو دروستکردنی دەوڵەتی نیشتیمانی چوون، بەمەش ولاتە زلهێزەکان ویستیان لە نوێوە سامانی ئەو ولاتانە بە میرات بگرنەوە لەڕێگای سەپاندنی بالادەستییان.

٤- لە ناوەڕاستی سەدەی ڕابردووەوە شێوازی بەرهەمی سەرمایەداری لە بەجیهانی بوونی بازنەی دەستاودەست کردن و دابەشکردن و بازاڕ و بازرگانییەوە گۆڕاوە بۆ بەجیهانی بوونی بەرهەم و دووبارە بەرهەمهێنانەوەی. کەواتە ئەو دیاردە جیهانگیرییە بریتییە لە سەرەتاکانی بەجیهانیکردنی بەرهەم و سەرمایەی بەرهەمهێنان و هەروەها هێزەکانی بەرهەمی سەرمایەداری و پەیوەندیەکانی بەرهەمی سەرمایەداری و بلاوکردنەوەی لە هەموو شوێنێکی گونجاو لە دەرەوەی کۆمەڵگاکانی خۆیان.

بەم پێیە بەجیهانیکردن بریتیە لە بەسەرمایەداریکردنی جیهان لەسەر ئاستێکی قووڵ دوای بەسەرمایەداریکردنی لەسەر ئاستی ڕوکەشی شێواز و ڕوخسارەکانی.

٥- ئەم دیاردەیە بەرجەستە دەبێت لە یەکخستنی دەزگا نێودەوڵەتیەکان لە سەر ئاستی جیهان و دروستکردنی دوو دەزگای نوێ:

- یەکەمیان ڕاگەیاندن یان پەیوەندیەکان
- دووەمیان زانیاری تاوەکوو هەموو کۆمەڵگاکان ملکەچی یەك بزوتنەوە بن.

٦- بریتیە لەو دەمامك و فەلسەفە تیۆرییەی کە ڕووی ڕاستەقینەی بازاڕو ئابووری دەوڵەتە پیشەسازیەکان و چەند کۆمپانیایەکی فرەڕەگەز دەشارێتەوە لە پێناوی کردنەوەی بازاڕەکانی جیهان بە ڕووی پیشەسازی ڕۆژئاوا بە بانگەشەی کێبڕکێ و کرانەوەو هاندانی ولاتانی تازە پێگەیشتوو بۆ پێشکەوتن.

٧- ئاماژەیەکە بۆ ئاراستەیەکی مێژووی بچوکبوونەوەی جیهان و زیادکردنی هۆشیاری تاکەکان و کۆمەڵگاکان بەو بچوکبوونەوەیە.

٨- گوشارخستنە سەر جیهان و بچوککردنەوەی لە لایەك، چڕکردنەوەی هۆشیاری لەسەر ئەو بچوککردنەوەیە بەگشتی لە لایەکی تر.

٩- قۆناغێکی نوێیە کە تێیدا پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان لەسەر ئاستی جیهان دەدۆزرێنەوە و ناوەخۆ و دەرەوە بە چەند لینکێك لێکدەئالێنرێن لە ڕووی ڕۆشنبیری و ئابووری و ڕامیاری و مرۆڤایەتی کە لێك جیاکردنەوەیان مەحاڵە.

١٠- جیهانگیری بریتیە لە سەرمایەداری دوای قۆناغی ئیمپریالیزم.

١١- بریتیە لە قۆناغی گشتگیربوونی سەرمایەداری بۆ هەموو مرۆڤایەتی، ئەمەش لە سایەی وڵاتە زلهێزەکان و دەسەڵاتیان بەسەر سیستمی ئاڵوگۆڕی جیهانیی ناهاوسەنگ.

١٢- جیهانگیری تەنها بریتی نیە لە ئامرازێك لە ئامرازەکانی گەشەسەندنی خۆکاری سیستمی سەرمایەداری، بەڵکو بانگەشەیەکیشە بۆ پەیڕەوکردنی نمونەیەکی دیاریکراو لە ئایدۆلۆژیایەك کە ئاماژەیەکی ڕاستەوخۆیە بۆ ویستی زاڵبون بەسەر جیهان و نەهێشتنی ویستی خۆیی بون.

١٣- جیهانگیری بریتیە لە ئەتککردنێکی کەلتوریانە و دوژمنایەتی کردنێکی هێماکارانە بۆ تێکڕای کەلتورەکان یان بە جۆرێکی تر بڵێین زاڵبوونی کەلتوری ڕۆژئاوایە بەسەر هەموو کەلتورەکانی تردا لە ڕێی بەدەستهێنانی دەستکەوتە زانستیەکان و تەکنەلۆژیای مەیدانیی پەیوەندی کردن.

١٤- جیهانگیری سیستمێکی جیهانی نویێ یە کە بە عەقڵی ئەلیکترۆنی و شۆڕشی زانیاری کار دەکات کە لەسەر داتاو داهێنانە تەکنەلۆژیەکان بنیات نراوە بەبێ ڕەچاوکردنی دامەزراوەو شارستانیەتەکان و کلتور و نەریت و سنورە جوگرافی و ڕامیاریەکانی جیهان.

هەندێ لە زانایان وای بۆ دەچن کە تەوژمی جیهانگیری تەواوکەری تەوژمی سیکۆلاریزمە، بەڵکو تەوژمێکە هەموو شتێك لەگەڵ خۆی دەبات و ترسناکترە لە سیکۆلاریزم...لێکۆڵینەوە لەو تەوژمە و پرەنسیپە نێگەتیڤەکانی لەوەدا دەستگیر دەبێ کە پلانێك هەبێ بۆ ڕاوەستان لە ڕووی دا، ئەمەش بە دروستکردنی ئەنتی جیهانگیریەکی ئیسلامی کە سود لە خاڵە پۆزەتیڤەکانی جیهانگیری وەربگرێت و ئەم ئومەتەمان بەرەو دووبارە بنیاتنانەوە هەڵبستێنێتەوە.

پاشان جیهانگیری پرۆگرامێکی نوێی ژیاری ڕۆژئاوایەو وەکو ئەڵقەی کۆتایی وایە بۆ زنجیرەی دوژمنایەتی لەمێژینەی ژیاری ڕۆژئاوا دژ بە ناسنامەی گەلان و کەلتورەکانیان لە پێناوی خۆسەپاندن بەسەریاندا و بالآدەستبونی کەلتوری و ژێردەستەکردنی جیهان بۆ ژێرکۆنترۆڵی ژیاری ڕۆژئاوا.

هەموو ولآتانی ڕۆژئاوا هەوڵی ئەوە دەدەن کە پشکدار بن لەو خۆسەپاندنە، بەلآم ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە کامیان بەهێزترە، بۆیەش بە هەموو توانایەکەوە یارمەتی ئەو بالآدەستبونەی ولآتە زلهێزەکان دەدەن، تاوەکو بەشدار بن تێیدا، خۆ ئەگەر ڕاستیش بڵێین لەڕاستیدا ئەو بالآدەستیە خۆسەپاندنێکی ئەمریکییە و هەموو هەوڵێکی جیهانگیریش بۆ ئەوەیە کە جیهان وەکو (لادێیەکی بچوك) لێبکات، ئەمەش دەستەواژەیەکی ڕاگەیاندنە زیاتر لەوەی لە ڕاستی بچێ، بە جۆرێك کە ئەو ولآتانەی ناکەونە ژێر کاریگەری دەستەلآتی ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوا و کەناڵە ئاسمانیەکانی ئەوان لە دەرەوەی ئەو لادێیەن، بەلآم ئەوەی کە

دەبینرێ ئەوەیە کە وڵاتانی جیهان بە گەورەو بچوکیانەوە پێشبڕکێی دەکەن تاوەکو ببنە بەشێك لەم لادێیەو پشکیان بەرکەوێ لەوەی کە کەناڵە ئاسمانیەکان و دەست و پێوەندەکانیان ئەنجامی دەدەن بە بەکارهێنانی ئامێرەکانی ڕاگەیاندن و کەلتور و کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت و ئامرازەکانی وێنەگرتنی هاوچەرخ..، تەنانەت وای لێهاتووە کە مرۆڤ زۆر بە ئاسانی دەتوانێ لەساتی ڕوودانی هەر ڕوداوێکی جیهان ئاگاداربێ، لە هەر شوێنێکی سەر ئەم زەمینە بێ، جا چ بە گوێ گرتن بێ یان بە بینین، ئەمەیە بەڵگەی ئەوەی کە جیهانی گەورەو فراوان ئەمڕۆ بچوك بۆتەوە لە ژێر دەستەڵاتی ڕاگەیاندن، کە لایەنێکی گرنگی جیهانگیری.

بێگومان جیهانگیری و پێشکەوتنی بەرفراوانی تەکنەلۆژی هۆکاری لەناوچوونی ئەو هێزە گەورانەی جیهان بوون کە بە ئارەزووی خۆیان بڕیارەکانیان پێش دەخست و دوایان دەخست، بەمەش جیهانگیری ڕۆڵێکی جیهانی گرنگی گێڕاوە.. هەندێ جاریش لێرە و لەوێ هەندێکیان لاواز دەبوون و لەناودەچوون، چونکە لەگەڵ پێشکەوتنەکانی بواری تەکنەلۆژی و ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوا نەڕۆیشتوون، یەکێتی سۆڤیەت وەکو زلهێزی دووەم لەناوچوو بە لەناوچوونیشی چەندین حکومەت لە ڕۆژهەلاتی ئەوروپا هەرەسیان هێنا، هەروەها ئەفغانستانی شیوعی و پاشان ئیسلامی و عێراقی سەددام حسێنیش لەناوچوون، بێگومان هەر لە ژێر ئەم بارودۆخە توندەدا وڵاتانی تریش لەناو دەچن.

بیرۆکەی (جیهانی بچوك) کە لە ژێر کۆنترۆڵ و زاڵبگیریەکی دیاریکراودا سەپێنراوە بیرۆکەیەکی نوێ نییە.. بەڵکو لە کۆنەوە بوونی هەیە..هەرچەندە بەشێوازێکی ئەوەندە سەرەتایی بووە کە پێشکەوتنە تەکنەلۆژی و ڕاگەیاندنەکان بوونیان نەبووە.. بەلاّم سەرەڕای ئەمەش جۆرە بالاّدەستیەکی ڕامیاری ئابووری ڕۆشنبیری لەئارادا هەبووە.

له پێش ئەوانی تر بالآدەستی ڕۆمانی و پاشان فارسی و ئینجا مەسیحی.. وای لە زۆر وڵاتی بچوك كرد كه لەناو بچن و بچنه ژێر ڕکێفی ئەم وڵاتانەوە و سیستمی ڕامیاری و ئابووری و ڕۆشنبیری و ئایینیان ببێته هەمان سیستمی وڵاته زلهێزەکە یان تەواو لێی نزیك ببێتەوە، له دوای ئەمانەوە ئیسلامیش به بیرۆکەیەکی جیهانگیری دەرکەوت، هەروەك چۆن خوای گەوره دەفەرموێ (وما أرسلناك إلا رحمة للعالمين) الأنبياء ١٠٧، واته: (ئەی موحەممەد ئێمه تۆمان ڕەوانه نەکردووه تەنها بۆ ئەوه نەبێت که ببیته ڕەحمەت و بەرەکەت بۆ هەموو جیهانەکان (جیهانی ئادەمیزادو گیاندارو ڕووەك و پەری و ..هتد).

هەرچەند دوژمنەکانی ئیسلام دەڵێن ئیسلام دواکەوتوویی و دەربەگایەتی بلاوکردۆتەوە..بەلاّم لەڕاستیدا ئەو دادوەریە کۆمەلاّتیە هەرگیز لەیادناکرێ کە سەراپا زەویەکانی ئیسلامی گرتبۆوە و ئەو گەشەسەندنە ئابوری یەی که سەرچاوەکەی لە (بنیاتنانی زەوی) یەوە گرتبوو و ئیسلام موژدەی ئەم بیرۆکەیەی دەبەخشی، شکۆمەندی و بالاّدەستی ئیسلامی بەجۆرێك بو که له لایەن زۆربەی گەلان ویستراو بوو، چەندین وڵاتی ڕۆژهەلاّت داوایان له مسولّمانان کرد که بچنه ناویەوەو له ژێر سایەی ئیسلامدا بژین، چەندەها گەل بڕوا بوونیان به ئیسلام ڕاگەیاند و چونه ناو ئیسلام و سیستمی ئابوری و ڕۆشنبیری و ڕامیاریان وەك یەك لێهات، تەنانەت ئەگەر چەند وڵاتێکی جیاجیای ئیسلامیش ڕابگەیەنرابان ئەوا هێڵە سەرەکیەکەی ئیسلام هەر یەك دەبوو.

له ڕاستیدا ئەو دواکەوتنە پیشەسازیەی که توشی مسولّمانان بوو لە کاتی گەشەسەندنی شۆڕشی پیشەسازی ئەوروپا وای لە دەولّەتی عوسمانی کرد کە هەرەس بێنێ و جیهانی ئیسلامیش کەوته باری دواکەوتوویی.

**پێشکەوتنی ڕۆژئاوای ئەوسا بە بەراورد لەگەڵ ئومەتی عەرەبی و ئیسلامی لەم خاڵانەدا خۆی دەنوێنێت:**

١- وزەی هەڵمی جێی وزەی دەست و بازوی گرتەوە کە عەرەب و مسوڵمانان پشتیان پێ بەستبوو.

٢- داهێنانی ئامرازەکانی گواستنەوەو بەرەوپێش بردنیان.

٣- دۆزینەوەی بەرهەمهێنانی وزەی کارەبایی.

٤- گەشەسەندنی بەرچاو لە وزەی کارۆموگناتیسی و دەرکەوتنی فیزیای نوێ.

٥- دۆزینەوەی پەینە کشتوکاڵیەکان و بەکارهێنانی ئامێرە کشتوکاڵیەکان.

٦- بەرهەمە کیمیاییە نوێیەکان شوێنی پیشەسازی سروشتی و بەرهەمی سروشتیان گرتەوەو.

٧- زانستی پزیشکی بەرەوپێشچوو[1].

ئەمانە بوونە هۆی زاڵبوونی ڕۆژئاوا بەسەر جیهانی ئیسلامی بەگشتی و جیهانی ئیسلامی پارچە پارچە بوو بۆ چەندین وڵات و یەکخستنەوەیان بە هەموو شێوەیەك ئەستەم بوو، جیهانگیری شیوعیەتیش لە ڕێی ڕێکخستنەکانی شیوعیەتەوە کە لە هەموو جیهان بڵاوبووبونەوە سەریهەڵدا، ڕوسیای شیوعی بەسەر وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات زاڵبوو فەرمانڕەوایی شیوعیەتی تێدا ڕاگەیەنرا، بەڵام لە دوای ناوەڕاستی سەدەی ڕابردوو پێشکەوتنە تەکنەلۆژیەکان بۆ وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا گوێزرانەوە... هەروەها لە دوای ڕوخانی جیهانی شیوعیەت و کۆتایی هاتنی سیستمی فەرمانڕەوایی شیوعیەتی سۆشیالیستی کە خۆی لە کوتلەی سۆڤیەتدا نواندبوو، ئەمریکا دەستی درێژکرد بەڕووی تێکڕای جیهاندا و باوەشی بە جیهاندا گرت و گرتیە خۆی و خستیە نێو هێڵە ڕامیاری و ڕۆشنبیری و ئابووریەکانی خۆی، بەم

١ أ.د.بدری محمد فهد، محاضرات في الفكر والحضارة

شێوەیە سیستمی ئەمریکای سەرمایەداری گەشەی سەند و پەلی بۆ سەرجەم ناوچەکانی جیهان هاوێشت.

سیستمە دیموکراسیەکەی ئەمریکا لە هەموو وڵاتەکان گەشەی سەند چونکە دەستەڵاتی دەدا بە زۆرینەی دانیشتوان، هەروەها سیستمە پەوەردەییەکەی بووە ئەو سیستمەی کە لە هەموو شوێنێك خۆی لە هەموو دامودەزگا پەروەردەییە "ئایینیەکان" ئاڵاند و ئاراستەی دەکردن بەرەو پەروەردەیەکی ئەمریکی. ئینتیمای ڕامیاری بۆ جیهانی ڕۆژئاوا بووە کارتی سەرکەوتن بۆ ئەو وڵاتانەی کە دەیانویست خۆیان لەو ئاریشانە ڕزگار بکەن کە دوچاری دەبوون.

زانکۆکان و خوێندنگاکانمان و ماڵەکانمان بەرنامەڕێژکران بە دانانی کۆمپیوتەر و بەستنەوەیان بە ئینتەرنێتی هاوچەرخ و کەلتوری ڕۆژئاواو شێوازە کرداریەکانی و داواکاریەکانی وردە وردە هاتنە نێو ژیانمان تا بووینە بەشێك لێی.

وا لێهات مۆبایل بە بەردەوامی لە دەستمان دابوو تەنانەت زیاتر لە ڕۆژئاواییەکانیش، گەشەسەندنەکانیش هەر زیادیانکرد تا ئینتەرنێت بووە ئامرازێك بۆ لکاندنی ڕۆژئاوا بە ژیانمانەوە تەنانەت خرایە نێو مۆبایلەکانیش کە مرۆڤ لە ڕێگای تۆڕێکی جاڵجاڵۆکەیی بەهێز بە تەکنەلۆژیای ڕۆژئاوایی دەبەستێتەوە، ئەمەش وامان لێدەکات لە ژێرکۆنترۆڵی ئەو پێشکەوتنەدا بمێنینەوەو هەمیشە پێویستیمان پێی بێت...

**هەروەها بوە شتێکی ئاسایی کە:**

١- ئابوریمان بە ڕۆژئاواوە ببەسترێتەوە.

٢- عەقڵمان بە ڕۆژئاواوە ببەسترێتەوە.

٣- پلانەکانمان بە ڕۆژئاواوە ببەسترێتەوە.

٤- کلتورمان بە ڕۆژئاوا ببەسترێتەوە.

٥- ئایینمان بە جۆرێك پراکتیزە بکەین کە هەمیشە لە ژێر مۆتەکەی ترسی ڕۆژئاوابێ، پەروەردەی ئایینیشمان ملکەچی پلانگەلێك بێ کە کاریگەرە بە ترسان لە ڕۆژئاوا.

## قۆناغەکانی جیهانگیری:

بۆ ئەوەی لە ڕوی مێژوییەوە لە پێشکەوتنەکانی جیهانگیری حاڵی ببین پێویستە ئەم مێژووە دابەش بکەینە سەر پێنج قۆناغ کە جیهان پێیاندا تێپەڕی، ئەوانیش بریتین لە:

١- **قۆناغی زراسکەیی:** کە لە سەدەی پانزە دەستی پێکرد کاتێك هزرە نەتەوەییەکان لە ئەوروپا بلاوبوونەوە، لاوازی دەستەلاتی ئایینی یەخەی پاپای گرت، هزرە تاکەکەسیەکان و مرۆییەکان قووڵبوونەوە. یەکەم دیاردەی دەرکەوتنی جیهانگیری بریتیبوو لە بلاوبوونەوەی ڕۆژژمێری گریگۆری زایینی کە ئێستا لە هەموو وڵاتانی جیهان بەکاردەهێنرێت.

٢- **قۆناغی پێراگەیشتن:** ئەم قۆناغە لەناوەڕاستی سەدەی هەژدەهەمەوە دەست پێدەکات و تا ساڵی ١٨٧٠ز بەردەوام دەبێت، ئەو چەمکانەی تایبەت بوون بە پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکان یەکخران و بارودۆخی تاکەکەسەکان لە قاڵبی یاسادا دارێژران و گرنگیدرا بە بابەتەکانی نەتەوایەتی و جیهانگەرایی.

٣- **قۆناغی هەڵگیرسان:** لە ساڵی ١٨٧٠ز ەوە دەستی پێکرد و تا سەرەتاکانی سەدەی بیست بەردەوام بوو، ئەو چەمکانەی تێدا بلاوبۆوە کە پەیوەندیان بە ناسنامەی نەتەوەیی و تاکەکەسی یەوە هەبوو. گرنگی جیهانی درا بە یاریە ئۆلۆمپییەکان و هەروەها لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم کۆمەڵەی نەتەوەکان دروست بوو.

٤- **قۆناغی ململانێ لە پێناوی زاڵبوون** : ئەمەش ئەو قۆناغەبوو کە ململانێی جیهانی دەستی پێکرد بۆ خۆسەپاندن، ئەوەبوو بینیمان کە چۆن بۆمبی ناوەکی لە یابان دراو، هەروەها دەرکەوتنی نەتەوە یەکگرتوەکان و ئەو ڕۆڵەی کە دەیگێڕا.

٥- **قۆناغی ناجێگیری** : ئەو قۆناغە کۆتایی بەوە هێنا کە پێی دەگوترا شەڕی سارد لە نێوان ڕۆژهەلات و ڕۆژئاواو، سیستمی یەکێتی سۆڤیەت هەرەسی هێنا و جیهانی سێیەم بوە بەشێك لە کۆمەڵگای نێودەوڵەتی دوای ئەوەی کە جیهانی دووەمی لێترازا، لەو قۆناغەدا چەکە ناوەکیەکان لە دەستی زلهێزەکاندا چڕکرایەوە و چەندین هەوڵ درا بۆ زاڵبوون بەسەر بۆشایی ئاسمان لەوانە نیشتنەوەی مرۆڤ لەسەر مانگ و شتی تریش.

## شوێنەوارەکانی جیهانگیری

ئەو کاریگەریە بەرچاوانەی کە جیهانگیری لەسەر جیهان دایدەنێ ئەمانەن :

١- بلاّوبوونەوەی زانیاریەکان و بەربلاّوبوونیان لەنێو خەلّکی دا.

٢- توانەوەی سنورەکانی نێوان ولاّتان، ئەو توانەوەیەش دوو شێوە لە خۆی دەگرێ:

أ- لە نێوان زۆرێك لە ولاّتاندا هەر بە کرداری سنورەکان توانەوە بە لابردنیان و نەهێشتنی مەرجە سنوریەکان وەکو ئەوەی کە لە کیشوەری ئەوروپادا هاتە دی، یاخود لە ڕێگای نەهێشتنی ڤیزا لە نێوان هەندێك لە دەولّەتەکان.

ب- سنورەکان توانەوە لە ڕێگای بلاّوبوونەوەی کەنالّە ئاسمانیەکان کە هۆکارێکی تر بوون بۆ بلاّوبوونەوەی زانیاری.

٣- زیادبوونی ڕێژەی لێکچوون لە نێوان گروپەکان و دام و دەزگاکان و کۆمەلّگاکان، کە هەندێ جار بەرەنجامی پۆزەتیڤ و نێگەتیڤی لێدەکەوێتەوە.

٤- ئاسانیی جولّەی خەلّك و زانیاریەکان و کالاّکان لە نێوان ولاّتە جۆربەجۆرەکان و دابەشبوونی ئەو چالاّکیانەی کەوا کالاّکان و خزمەتگوزاریەکان و تاکەکان و هزرەکان و دراوەکان و پارەکان و دامەزراوەکان و وەهەروەها شێوازەکانی هەلّس و کەوت و جێبەجێ کردن دەگرێتە خۆ.

جیهانگیری کاریگەری نێگەتیڤ و پۆزەتیڤی هەیە کە لەم خالاّنەی خوارەوەدا پوخت دەکرێن:

أ- **کاریگەریە نێگەتیڤەکانی جیهانگیری:** کە دەشتوانین بە **مەترسیەکان** ناوی بێنین، بە گشتی لە سێ بواردا بەرجەستە دەبێت:

١- **بواری رامیاری:**

پێویستی پلاندانان بۆ داهاتووی ولاّتان کالّ دەبێتەوەو پلانێکی ئەوتۆ نابێ بۆ دووبارە دابەشکردنەوەی داهاتی نەتەوەیی یان پشتگیری کردنی کالاّی پێویست، ئەمەش لەلایەك لەبەر

تێکگیرانی لەگەڵ مەبدەئی کێبڕکێ و کارامەیی دا و له لایەکی ترەوه بیرۆکەی وێکهێنانـەوەی سوپاکان و کەمکردنەوەی خەرجیەکانی سەریان هەڵدا، هەروەها بیرۆکه لیبڕاڵیەکان بلاودەبنەوه که گرنگیدان به پرۆگرامی ڕامیاری حزبی و ڕەوتەکانی کەمدەکاتەوه..، چونکه جیهـانگیری وا دەکات جیهان پڕ بـێ لـه دام و دەزگـاو کۆمپانیـا و تاکـه بەرهەمهێنـەرو بەکارهێنـەرەکان، جیهانگیری ڕەنگدانەوەی ئایدیۆلۆژیەتێکه که ئامرازەکانی دیاریکراون و به ئاوازی خۆسەپاندن دەچڕێ.

هەموو ئەمانه مانای ئەوه دەگەیەنن که وڵاته بچوکەکان به تێکڕا یـەك ڕێیـان لـه پێـشه ئەویش ئەوەیه که بچنه باوەشی ڕۆژئاواوه بەتایبەتیش وڵاته یەکگرتوەکانی ئەمریکا که هـیچ خاسیەتێکی ڕامیاری ڕوونی نی‌یه.

جیهانگیری له ڕوانگه ڕامیاریەکەیەوه واته داڕوخانی هەموو بنەما نەتەوەیی و ئایینیـەکان (وەکو دەوڵەته عەرەبیەکان) و جێگرتنەوەیان به هەرێمایـەتی. جیهـانگیری بنـچینەو بنـەمای دەوڵەته بچوکەکان دادەڕوخێنـێ و هەڵدەسـتێ بـه داڕشـتنەوەی چـەند نەخـشەیەك بـۆ یەکـه ڕامیاریه عەرەبی و ئیسلامیەکان و، وا دەکات که وڵاته بچوکەکان ببنه چـەند ئاژانـسێك بـۆ بەرژەوەندیەکانی ڕۆژئاوا و خزمەتکردنیان لەپێناو هێنانەدی ئامانجەکانیان.

هەروەها دەستگرتن به سەر مەڵبەندی بڕیاره ڕامیاریەکان و دەرکردنیان له وڵاتانی جیهـان بۆ حزمەتکردن به بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا که پێی دەوترێ ئاساییـشی نەتـەوەیی ئـەمریکی لەسەر حیسابی بەرژەوەندی و سامانه نیشتیمانیەکانی وڵاتانی تر. هەروەکو چـۆن جیهـانگیری کار دەکات لەسەرئەوەی که ڕیسی چنراوی گەلان له بواری شارستانی و کۆمەڵایەتی بکاتـەوه خوری و، ناسنامه و کـەلتوری نەتـەوەیی و ئاینیـان لـەناوببات. جیهـانگیری هـەلی کۆمەڵـه بەهێزترەکان و کوتله ڕامیاری و ئابووریەکان چـەندانه دەکـات لـه قۆنـاغی زاڵبونیـان بەسـەر میللـەتان لـه پێنـاوی بـەکارهێنانیان و هەڵلوشـینی بەروبومـەکانیان، یـاخود ڕاسـتتر بڵـێین

دەرکەوتنی جۆرێکی نوێ لە ئیستیعمار لە سەدەی بیست و یەك کە ترسناکترە و زیانەکانی زیاترە لە جۆرەکانی تری ئیستیعماری ڕابردوو.

**٢- بواری ئابووری:**

لەژێر کاریگەری جیهانگیری دا وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی هەر لە بیریان چۆتەوە کە ئابوری ئیسلامی چیە و چۆن جێ بە جێ دەکرێ، چونکە ئەو وڵاتانە بونەتە داردەستێك بۆ ڕەنگدانەوەی هزری سەرمایەداری ڕۆژئاوایی و جێ بە جێ کردنی لە خاکەکانیان: لە سەرەنجامدا دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی هەژاری و فراوانبوونی ئەو بۆشاییەی کە لە نێوان چینەکانی کۆمەڵگادا هەیە و چڕکردنەوەی هەموو بەروبوومەکان لە دەستی چینێکی دیاریکراودا، لەمەشەوە دروشمیان دەبێتە بەرهەمهێنانی زۆرترین کاڵا و بەرهەم بە کەمترین کارکردن کە دەبێتە ئەوەی چەندین فەرمانبەر و کرێکار بنێردرێنەوە ماڵەوە.

جیهانگیری ڕێخۆشکەرە بۆ بڵاوبوونەوەی بێکاری و لە ئەنجامی ئەمەشدا هەژاری سەرهەڵدەدات، چونکە جیهانگیری پشت دەبەستێ بە پلانەکانی ئابووری ڕۆژئاوایی کە جیاوازی چینەکانی کۆمەڵگا زیاتر دەکات .

**٣- لە بواری کەلتوری و پەروەردەیی دا:**

ئەوەی کە جیهانگیری بۆی هەوڵدەدات بریتیە لە دزەکردن بۆ نێو کەلتوری میللەتان و پەکخستنیان و بەتاڵانبردنی تایبەتمەندیەکانیان لەڕێی خستنەگەڕی هۆکارەکانی ڕاگەیاندن و هۆکارەکانی پەیوەندی سەردەم کە ڕۆشنبیران لە بازنەیەکی دیاریکراوەوە بە یەکەوە گرێ دەدات و وایان لێ دەکات کە عەقڵیان بەلای هیچ شتێکی تردا نەچێت تەنها ئەوە نەبێت کە بەباڵای دا هەڵبڵێن. لەئەنجامی ئەمەدا بیرۆکەی بەرژەوەندیبازی و پشتبەستن بە هۆکارە تەکنەلۆژی و زانیاریەکان کە عەقڵ و پێشکەوتنی هزر پەکدەخات سەرهەڵدەدەن.

هەروەها ئەو ولاّتانەی كە زلهێزن و بونەتە خاوەنی بڕیاری یەكلاكەرەوە لە ولاّتانی عەرەبی و ئیسلامی هەلّدەستن بە فەرزكردنی جۆرێك لە جۆرەكانی كەلتور و دانانی پلانێكی دیاریكراو بۆ پەروەردەو فێركردن كە جیهانی عەرەبی و ئیسلامی بە ڕۆژئاوا ببەستێتەوە تاوەكو پشتگیری لە چالاكیەكانیان بكات و دژی هەر بەرهەلّستیەك بوەستێتەوە كە بەرەنگاری زایۆنی جیهانی دەبێتەوە ئەمەش لە پێناوی ئەوەی لە بواری كۆمەلاّیەتی و ڕامیاری و تەكنەلۆژی و پەروەردەیی لەگەلّ ئیسرائیلدا هاوشێوە بن. سەبارەت بە نەتەوەی عەرەب ئەوا جیهانگیری هەلّدەستێ بە بانگەشە كردن بۆ كەلتوری ڕۆژئاوا بۆ پەكخستنی زمانی عەرەبی لە ڕێی ئامرازەكانی پەیوەندی و بەكارخستنی ئەو زمانانەی كە سیستمی زانیاری نوێ (كە خۆی بەرهەمی جیهانگیریە) پشتی پێ دەبەستێ لە ڕێگای گەمارۆدانی داهێنانە وێژەییەكان و بەهاییەكانی ئەو ولاّتە پارچە پارچە كراو و بچوككراوانەی كە كەلتور و نیشتیمان پەروەریان پەراوێزخراوە، جگە لەمەش لێهاتوویی و ئەزمونی ئەو ڕۆشنبیرانە كەم دەكرێتەوە كە پەیوەستن بە دەزگاكانی پەیوەندی ڕۆژئاواییی، جیهانگیری وای لێ دەكات ئەزموون هەر بە ئۆتۆماتیكی لە ڕێی تەكنەلۆژیاوە بگاتە ڕۆشنبیرەكان كە بە پلەی یەكەم پشت بە خۆیان نابەستن و ئەزمون بۆتە دۆزێكی ئالی كە تواناكانی ڕۆشنبیری لاواز دەكات.

**٤- لە بواری ئایینی:**

جیهانگیری كار دەكات لەسەر ڕەتكردنەوەی پەیوەندیە ڕۆحی و كەلە پوری و مێژووییەكانی ئەو ولاّتانەی كە ئاین تێیاندا پێكهێنەرێكی سەرەكی تاكەكەسی و ژیاری و كۆمەلاّیەتی و مرۆییی‌یە، هەروەها ڕەتكردنەوەی چارەنووسی مرۆیی سەبارەت بەم نەتەوانە بۆتە دۆزێكی واقیعی.

**٥- بواری ڕاگەیاندن:**

جیهانگیری هۆكارەكانی ڕاگەیاندن و پڕوپاگەندە بە پێی پلانەكانی خۆی بەڕێوە دەبات لەو ولاّتانەی كە دەچنە ژێر ئەو تەوژمەی كە ڕووەو چالاّوی جیهانگیریە، بەمەش كەلەپور و ڕەوشتیان لە ڕەگ و ڕیشالّەوە هەلّدەكەنێ. ڕاگەیاندن ڕۆلّی ناساندنی ناسنامەی نەتەوەكان

دەبینیٚ، لەم سۆنگەیەوە ئەگەر توانرا بەسەر فەزای جیهانی ڕاگەیاندنی هەر ولاَتێکدا زالْبن، هیچ لەوە ئاسانتر نی یە کە دەست بەسەر فەرمانڕەوایی ئەو ولاَتەدا دا بگرن. ڕاگەیاندنی ڕۆژئاواو ئەو پارانەی کە دەچنە پالْیەوە بە ناوی یارمەتی دان و هاوکاری کردنی ولاَتە بچوکەکان ڕۆلْیی بالاَ دەگێڕن لەم بوارەدا و ڕێخۆشکەر دەبن بۆ هێنانەدی هەموو ئەو ئامانجانەی کە سیستمی جیهانگیری مەبەستیەتی و باسمان لێوە کردن.

**٦- لە بواری زانستی یەوە:**

ولاَتە زلهێزەکان ڕێگەیان دەگرت لە پێشکەوتنی بواری زانستی لە ولاَتە بچوکەکان لە پێناوی ئەوەی نوقمیان بکەن لە بەرهەمەکانی ڕۆژئاوا و کاتێکیش جیهانگیری هاتە کایەوە بازاڕەکانیان بە خۆشحالْی یەوە تەواو ئامادەبوون ئەو بەروبومانە وەربگرن، وای لێهات ڕۆژئاوا ئەو ولاَتە بچوکانە هان بدات بۆ بەکارهێنانی تەکنەلۆژیای زانستی بەهەموو جۆرەکانی‌یەوە لە پێناوی دامالْینی ئەو ولاَتانە لە هەر ناسنامەیەك کە دەیانبەستێتەوە بە ڕابردووی پڕشنگدار ولەمەشەوە بەرەنگاریان بکاتەوە لەگەلْ جیهانگیری کە بەزۆر خۆی سەپاندووە بەسەر ڕۆژهەلاَتدا بەبیٚ ئەوەی هیچ توانستێکی تەکنەلۆژی هەبێت تا لەدژی بوەستێت. بەلاَم بەکارهێنانی تەکنەلۆژیای نویٚ لە ولاَتەکانمان بەجۆرێك مەرجدارکراوە کەنەبێتە هۆی بەهێزکردنی بارودۆخی ستراتیژیمان و بەلْکو وامان لێدەکات بەچواردەوری گەردونێکی وێنەکێشراو بخولێینەوە. ئیتر وامان لێدێت ڕابردومان لەکیس دەچێت و سودیش لەئێستامان نابینین، تەنانەت کراوینە بازاڕێکی هەرزانفرۆش بۆ برەو پێدانی کالاَ و بەرهەمەکانی ڕۆژئاوا جا چ پیشەسازی بێت یان زانستی بیٚ. بەلاَم ئەگەر بێت و ئەمە بەبیٚ ناسنامە بێت ئەوا مەترسیەك دێتە گۆڕیٚ لەسەر پەیڕەو و پڕۆگرامی داهاتومان کە پێویستە بۆ جیهانمان بیکێشین، بە جۆرێك کە ئەو پڕۆگرامە لە گەردونێکی پڕۆگرامکراوی جیهانی ڕوتدا دەخولێتەوە بە بیٚ ئەوەی کەلتوری ئێمە خاوەنی ناسنامەیەکی تایبەت بێت. ئەمەش لەسەرمان پێویست دەکات کە بەرەنگاری بوەستینەوەو شێوازی بەرەنگاریەکەش کەلتوری و پەروەردەیی بێت، لەگەلْ ئەوەشدا پێویستە بڕوامان بە پێویستی پێشکەوتنی تەکنەلۆژی هەبێت و پێمان وابێت

که به ئەندازەی ئەوه توانامان هەیه برەو بەو تەکنەلۆژیایه بدەین جا چ به کەلتورمان بێت یان به کەلەپورمان که ناسنامەی ئاینیمان دەپارێزێت. بەم شێوەیه جیهانگیری له ناوەڕۆکدا بریتیه له بزوتنەوەیەك که دەیەوێ هەموو جیهان لەسەر یەك ڕەوت و شێواز ڕێکبخات له بواره جیاجیاکانی ڕامیاری و ئابووری و کۆمەلایەتی و پەروەردەیی، ئەمەش بۆ ئاسانکاری له سەپاندنی دەستەلاتی ڕۆژئاوا (ئەمریکا) بەسەر هەموو جیهاندا.

جیهانگیری له ژێر پەردەی جیهانی بوون دەرکەوت بەلام جیهانگیری زۆر جیایه له بەجیهانی بوون. جیهانی بوون خاسیەتێکی مرۆیی پەسندە، هەروەها ئیسلامیش تایبەتمەندە به پەیامە جیهانیەکەی، بەلام جیهانگیری بریتیه له بەکارهێنانی ئەوپەڕی هۆکارەکانی سەرمایەداری و لیبڕالی ڕۆژئاوایی هەروەها بەکارهێنانی هەموو شێوازەکانی ئیستیعماری گەلان، ئەمەش له پێناوی بەرژەوەندی ولاتە زلهێزەکانی جیهان.

جیهانی بوون بریتیه له کرانەوە به ڕووی جیهان و کەلتورە جیاجیاکان لەگەلّ پاراستنی هەموو ئایدۆلۆژیا جیاجیاکان، ئەمەش ویستی بەرزبوونەوەیه له ئاستی تایبەتەوە بۆ ئاستێکی جیهانی. له کاتێکدا جیهانگیری بریتیه له ڕەتکردنەوەی بەرامبەر. هەروەها جیهانگیری جێی ململانێی ئایدۆلۆژی لەق دەکات به هاککردنی کەلتوری و ئابووری، ئەمەش ویستی دەستبەسەراگرتن و گۆڕین و ڕەتکردنەوەی تایبەتمەندیەکانی ئەوانی ترە.[٢]

**یەکێك له لایەنه نەرێنیەکانی جیهانگیری بریتیه لەوەی که جیهانی ئیسلامی و عەرەبی لەبەرەنگاریەکی ڕۆشنبیری دان:**

١- جیهانگیری نوێنەرایەتی دوژمنانی ئەو ناسنامەیه دەکات که له بیرو باوەڕ و شارستانیەتی ئەو ئوممەتەوە هەلقولاوە. جیهانگیری مرۆڤ بەرەو جیهانی بێ نەتەوە و جیهانی بێ ولات دەبات، که ئەمەش کردارەکانی پاتالکردن ئاسان دەکات، هەروەها زلهێزەکان له ڕێگای فەزای زانیاریەوە دەتوانن ڕۆشنبیری و ڕامیاری ئابووری بەو شێوەیه ئاراسته بکەن که خۆیان دەیانەوێ.

---

- إسحاق الفرحان، الإسلام والعالم. خانەی الفرقان-عمان چاپی ١-٣-٢٠٠٣، لاپەڕە ٢٣٣

٢- ترسناکیەکەی لەوەدایە نوێنەرایەتی ڕۆشنبیریەك دەکات کە نوقومبووە لە ئارەزوو لەزەتبازی، تەنانەت بنەما جێگیرەکانی ڕەوشتیش ڕەت دەکاتەوە بەڵکو پێی وایە کە مەبەست هەمو هۆکارێك ڕەوا دەکات.

٣- جیهانگیری بریتیە لە ونبوون و نابەرپرسیارێتی و کاریگەریەکی نەرێنیش دروست دەکات لەسەر ئەو بەها و ڕەوشتانەی کە لە کۆمەڵگا ئیسلامیەکان پەیڕەو دەکرێن، ئەمەش لەبەرئەوەیە کە کەلتورەکەی بریتیە لە ئارەزووبازی و لەزەتبازی. جیهانگیری لەسەر ئابووری ئازاد دەوەستێت و پشت بە یاسای (خستنەڕو و داواکاری) دەبەستێت. ئەمەش لە کۆتاییدا سەر دەکێشیێ وەلای دروست بوونی دوو چینی تەواو لێك جیای کۆمەڵگا. چینی یەکەم بریتیە لە چینی لاواز، ئەو چینەی کە هیچ هێزێکیان نیە، هەروەها چینی دووەم کە بریتیە لە چینی تاغوت و چەوسێنەرەکان، لەمەشەوە دادگەری کۆمەلآیەتی لاواز دەبێت و کەلتوری بەکاربردن بلاّودەبێتەوە کە یارمەتی بلاّوبوونەوەی بێکاری و ناردنەوەی کرێکارەکان و هەروەها زیادبوونی باج دەدات و هەرەشەیەکە بە ڕووی هەموو کۆمەڵگایەك بەبیێ جیاوازی.

**ب: ئەرێنیەکانی جیهانگیری:**

سەرەڕای نەرێنیەکانی جیهانگیری کە خۆی لە زاڵبوونی ولآتێك یان چەند ولآتێکی دیاریکراو دەبینێتەوە، جیهانگیری هەندیێ خاڵی ئەرێنیشی هەیە، کە زانایان باسیان کردووە، لەوانە:

١- داڕوخانی ئەو دیوارە بەرزانەی کە هەندیێ لە گەلان و هەندیێ کۆمەڵگا خۆیان پیێ دەپاراست، ئەو دیوارانە بە هۆی تەوژمی جیهانگیری داروخان و لەناوچوون.

٢- جیهانگیری کۆتایی بە گۆشەگیری ناوچە گۆشەگیەرەکان هێنا وەکو "ولآتانی شیوعی ڕۆژهەلآت".

٣- پەیدابوونی جۆرەها خزمەتگوزاری و شتومەکی جیاجیا و زۆربوونی هەلی وەبەرهێنان، بە شێوەیەك کە سەرمایەدارەکان دەتوانن ڕوبکەنە وڵاتانی جیاجیا بۆ وەبەرهێنانی سامانەکانیان، و ەهەروەها هاوردەو ناردنە دەرەوە زیادی کردو، جۆرەها پیشەو کار پەیدابوو. جیهانگیری وای کرد شتومەك و بەرهەمەکان بگەنە دەستی زۆربەی تاکەکانی جیهان تەنها کەمێك نەبێت کە لە هەژاریەکی نائاسایی ژیانیان دەگوزەرێنن.

٤- زۆربەی پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکان لەسەر بنەمای زانیاری و بیرۆکە دروست بوون .زۆربەی کۆمپانیاکان بوونە فرەنەتەوە، دوای ئەوەی بەرلە جیهانگیری تەنها لە چوارچێوەی وڵاتەکەیاندابوون.

٥- جیهانگیری یارمەتی بانگاشەی مافەکانی مرۆڤ و دیموکراسی (ئازادی تاك) دەکات هەروەها بانگاشەی ئەوە دەکا کە عەقل و زانست و ڕۆشنبیری دەتوانن هەموو ئەو گرفت و بەربەستانە چارەسەر بکەن کە دوچاری مرۆڤ دێن، هەروەها بانگاشەی دەستبەرداربوونی دەمارگیری ئایینی و نەتەوەیی و ڕەگەزی دەکات، ئەمەش وای کردووە بەرەنگاربوونەوەی جیهانگیری لە هەندێ بواردا بریتیبێ لە وەستان بەڕوی ئازادی و ڕزگاری.

٦- بلاّوکردنەوەی تەکنەلۆژیای نوێ و ئاسانکردنی دەستکەوتنی زانیاری جیهانی گرنگ بە سوودوەرگرتن لە شۆڕشی زانیاری نوێ.

٧- زیادبوونی بەرهەمی ناوخۆیی و بەرهەمی جیهانی و هەروەها زیادبوونی قەبارەی بازرگانی جیهانی کە بووەهۆی بەرزبوونەوەی ئاستی ئابووری جیهانی و ژیانەوەی، هەروەها بووە هۆی کێبڕکێی ئازاد و باشتربوونی چۆنیەتی. ئەمەش هێشتا ڕوون نیە کە ئایا ئاراستەکانی پەرەوپێشچوونی ئابووری و زیادبوونی قەبارەی بازرگانی و زیادبوونی بەرهەم هەر لەدەست وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە یان ئەو وڵاتانەی تر کە دەوریان داوە، وەك وڵاتە ئەوروپیەکان و هەندێ وڵاتی ڕۆژهەلاّتی.

## ئامانجەکانی جیهانگیری

دەکرێ ئامانجەکانی جیهانگیری لەم خالأنەی خوارەوەدا پوخت بکەینەوە کە ئێستا بۆتە ئەمری واقیع:

١- جیهانگیری هەوڵی لێکهەڵوەشاندنی جیهان و داماڵینی تایبەتمەندیەکانی دەدات.

٢- جیهانگیری بریتیە لە وێنەدانەوەی ویستی خۆسەپاندن بەسەر جیهان و بەکارهێنانی نمونەیەکی دیاریکراو (بە ئەمریکایی کردن) لە ڕێگای بازاڕە جیهانیەکان ئەمەش بە مەبەستی ئەوەی ولأتە بچوکەکان هاوسەنگیان لەدەست بدەن و پاشانیش لێکهەڵبوەشێنەوەو لەناو بچن.

٣- هەوڵدەدا لە پێناو لاوازکردنی ولأتە تازە پێشکەوتووەکان و گەشەپێدانی هەستی تەقلیدی وەکو ژیاندنەوەی ئینتیمای هۆز و تیرەو تاقمە و دەمارگیری مەزهەبی، ئەمەش لەپێناوی درزخستنە نێو کۆمەڵگا ناڕۆژئاواییەکان و بەمەبەستی لێکترازاندنی کۆمەڵگا و ڕەشکردنەوەی ناسنامە نەتەوەیی و نیشتیمانی و ئاینیە ناڕۆژئاواییەکان بەهۆی لێشاوی زانیاری لەڕێگای تەکنەلۆژیا پێشکەوتوەکانی ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیریە نوێیەکان.

٤- هەوڵی سەپاندنی نمونەی ڕۆشنبیری ڕۆژئاوایی دەدات بەسەر گەلانی سەر زەوی، ئەمەش دوای لەناوبردنی ڕۆشنبیری هەریەك لەو گەلانە.

٥- جیهانگیری هەمیشە بەرامبەر بە ڕۆژهەلأت وەستاوە، ئەمەش بە مەبەستی ملکەچکردنیان، تاوەکو لە کۆتاییدا لێك هەڵبوەشێنەوەو بەبێ هیچ بەرنامەو پەیرەو و کەسایەتی و بەبێ هیچ بەشداریەکی ئەرێنی لە ڕۆشنبیری سەردەم بژین.

## بەرەنگاربوونەوەی جیهانگیری:

**چەند ڕێگایەك هەن بۆ ئەوەی بتوانین بەرەنگاری جیهانگیری ببینەوە، لەوانە:**

١- دەرنەچوون لەو بنەما نەگۆڕانەی کە لە پەرتوکی خوای گەورە یان لە سونەتی پێغەمبەرەکەی (د.خ) دا ئاماژەیان پێدراوە. ئەو بنەما نەگۆڕانەی کە موسوڵمان بە پێشێل

کردنیان له مسوڵمانیەتی دەکەوێ، نابێ به هیچ شێوەیەك ڕێگا بدرێ ئەم بنەما نەگۆڕانە پێشێل بکرێن چ لەبواری ڕۆشنبیری یان پەروەردە یاخود ئەوەتا له بواری فێرکردن و ڕاگەیاندن.

٢- ڕێککەوتن لەسەر بەها ڕەوشتیە بەرزەکان که له له ئایین و ژیارەکەیەوە سەرچاوەیان گرتووە، ئەمەش بۆ ئەوەی دەستەیەك لە نەوەی وا پەروەردە بکەین کە ببنە ئەستێرەی درەوشاوەی ئەو ئاسمانە تاریکەی ئێستاو جێگای دڵشادی ئومەت بن، ئەمەش پێویستی بە ڕەوشتی خانەدان و بەها بەرزەکان هەیە که تۆو کرابێ بەبەزەیی و میهرەبانی و خۆشەویستی له نێوان تاکەکانی ئومەتدا.

٣- ڕێککەوتن لەسەر دانانی پلانگەلێك بۆ ڕزگاربوون له نەزانی و برسیەتی و نەخۆشی، ئەم پلانانە پلانی دنیایی گەشەپێدەرن تاوەکو ئەم ئوومەتە بگەیەنێتە ئاستی نەتەوە بەهێزەکانی تر.

٤- یەکگرتویی عەرەب و هاریکاری موسوڵمانان له هەموو بوارێکدا و هەبوونی بیری بەرپەرچدانەوەی جیهانگیری له بیرو ڕای ئوومەت و دژوەستانێکی یەکگرتوو بەرامبەر بە سیاسەتەکانی جیهانگیری.

٥- برەودان به ڕۆشنبیریه عەرەبی و ئیسلامیەکان لە هەموو قۆناغەکانی خوێندن کە دەبێتە دڵنیایی سەرەکی عەرەب و موسوڵمانەکان بۆ بەرەنگاربونەوەی جیهانگیری.

# فه‌لسه‌فه‌كانی پێش وجودییه‌ت و كاریگه‌ریان له سه‌ری

**عه‌قلانیه‌ت(هۆشگه‌رایی) و میسالیه‌ت و واقیعیه‌ت:**

**فه‌لسه‌فه‌ی هیگل (١٧٧٠ – ١٨٣١) ز**

هیگل یه‌كه‌م كه‌س بوو كه به شێوه‌یه‌كی بابه‌تیانه‌و لۆژیكیانه په‌رده‌ی له سه‌ر جوڵه‌ی جه‌ده‌لی لادا له بوندا، هه‌م به به‌ڵگه هێنانه‌وه و هه‌م به كرداریش. هه‌روه‌ها هیگل ڕاستی یه‌كبوون و گشتگیری بوونی ده‌رخست، واته عه‌قل و گیان و په‌یوه‌ندیه‌كانیان به سروشت و مرۆڤه‌وه.

هیگل كه‌سێكی میسالی و هۆشگه‌رایی بووه، به‌ڵام له هه‌مان كاتدا بابه‌تی و واقیعی بووه، هه‌ر له به‌ر ئه‌مه‌ش به یه‌كێك له پێشڕه‌وه به‌رچاوه‌كانی هزری هاوچه‌رخ داده‌ندرێ به هۆی ئه‌و شیكاریه بابه‌تیانه‌و واقیعیانه‌ی كه ئه‌نجامی دا له باره‌ی هه‌ڵوێسته هۆشداره مرۆیی و كۆمه‌ڵایه‌تی و مێژووییه‌كان كه وجودیه‌تی وه‌كو ڕێبازێكی سه‌ربه‌خۆ ڕاگه‌یاند.

هیگل گرنگی به زانستی لۆژیك ده‌دا له‌بری پشت به‌ستن به میتافیزیك، هه‌روه‌ها بڕوای به "جه‌ده‌ل" هه‌بووه، وه بڕوای وایه كه بوون خاوه‌نی یه‌كبوونێكی سه‌راپای عه‌قڵییه و ناوی ده‌نێت "گیانه ڕه‌هاكه" كه له یه‌كێ له ساته جیدالیه‌كانیدا دایده‌بڕێنێ له سروشت، ئه‌مه‌ش ئه‌و توانایه ده‌داته لۆژیك كه تاكڕه‌وانه وه‌كو زانستێكی ڕه‌ها په‌رده له‌سه‌ر دیمه‌نه‌كانی سروشت لابدات كه به هه‌ستكردنێكی ڕاسته‌وخۆ ده‌ست پێده‌كات به‌رامبه‌ر واقیع و جوڵه‌و جه‌ده‌لی سروشت به شێوه‌یه‌كی گشتی، ئا به‌م شێوه‌یه هیگل له خودگه‌رایی عه‌قڵ ده‌رده‌چێت بۆ بابه‌تیبوونی دیارده واقیعیه به‌رهه‌سته‌كان، بێگومان ڕۆشنبیری گشتی هیگل یارمه‌تی داوه له پاڵپشتی كردنی له‌م "بابه‌تی" بوونه كه له دیالۆگه عه‌قڵیه‌كانی دا زۆر له‌سه‌ری موكوڕ بووه، هه‌روه‌ك چۆن بڕوابوونی به بیروڕا ئایینیه لاهوتیه‌كانی وای لێكردووه كه پێی وابێ دژیه‌ك له عه‌قڵ دا هه‌یه له لێكۆڵینه‌وه‌و ڕه‌نگدانه‌وه‌و دیالۆگه‌كانیدا.

به پێی هیگل دەستکەوتەکانی زانست بەڵگەن لەسەر دیالۆگی عەقڵی بە شێوەیەك کە لە ژیانی مرۆڤ و ئینسانیەتدا چەند حاڵەتێکی دیاردەییان هەیە بەسەر گیاندا، واتە عەقڵی گشتگیر لە هێنانەدی و ڕەنگدانەوەی گیان دەستی کارای هەیە. وە هەروەها بڕوای وایە کە ڕاسترینی ڕاستیەکان گوفتاری مرۆڤەکانە بەتایبەتی حوکمی عەقڵ لە دۆزەکەیدا، وە هەروەها پێویستە لەپاڵ ئەمەشدا نێوەندە مرۆییەکان لە یەکسان کردنی یاساکان و دۆزەکان بخرێنە ژێرتوێژینەوە، ئەو شتەی کە یارمەتی هزرەکەی هیگل دەدات لە بارەی (زانستی لۆژیکەوە) بریتیە لە جێگرتنەوەی (میتافیزیکا).

عەقڵ یان بابەت ناتوانن هەریەکێکیان بازنەی سەربەخۆ دروست بکەن، بەڵکو تێکئالاون و بەیەکەوە دەبنە چەند حاڵەتێکی جەدەلی و بابەتەکانیان بە تێکئالاوی دەمێننەوە، ئا بەم شێوەیە هیگل ژیانی تاك و کۆمەڵگا و مێژوو و ژیانی یەکە کۆمەڵایەتی و کەلتوریەکان و شارستانیەکان وێنا دەکات، وە تێیدا عەقڵی گشتگیر و ڕەنگدانەوەکانی لە حاڵەتە جەدەلیەکاندا دەدۆزێتەوە. میسالیەتی بابەتیانە لە دەبەرێکڕاچونی هەستی بۆ بوون دەست پێ دەکات، بەو واتایەی کە مرۆڤ بوونەوەرێکی عاقڵی زیندووەو ملکەچی یاسا و ڕێساکانی ژیان بووە، یان پێکهاتەی هەستی و کۆمەلایەتی بەرەوپێش دەچێ و وای لێدێ کە بتوانێ گوزارشت لە خۆی و هەست و عەقلی بکات هەروەها فەلسەفە لێبدات لەم پێگە بابەتیەدا.

کەواتە میسالیەتی بابەتیانە دەبێتە ناواخنی جەدەلی عەقڵی، میسالیەت واقیعێکی بابەتیانەیە هەروەك چۆن دەبێتە بابەتێکی عەقڵی .

مرۆڤیش خاوەنی سروشتێکی خوایی یە لە لای هیگل بەم پێیەش مرۆڤ لە نێوانی "پایانداری" و "بێ پایانی" دایە، لەبەر ئەوە هیگل خۆی سەرقاڵکردووە بە ئەفسانەکان و بیروڕا لاهوتیە ئامانجدارە عەقلیە ڕوونەکان کە تێکەڵەیەکە لە کارایی مرۆڤ و بابەتی بوونی بە ڕێژەیەکە کە تێبینی ئەوە دەکەین چۆن عەقڵ خودی خۆی و دەربڕینەکانی و پێگە ووجودیەکانی دەدۆزێتەوە لە ناخی مرۆڤدا.

دەبەرێکراچوونی مرۆیی سەرەتایەو کۆتاییشە، ئەوە خاڵی دەستپێکردنەو هەروەها خاڵی گەیشتنیشە، ڕەنگدانەوەی ڕاستەوخۆی ڕواڵەتی بە شێوەیەکی گشتی ئاماژەیە بۆ بەیەکگەیشتنی عەقڵ بە خودی خۆی، ئەم ڕەنگدانەوەیەش لە کاتێکدا ڕوودەدات کە پێچەوانەکەی هەبێت، ئەمەش لەکاتێکدا کە لە خودی خۆی دا بوونی هەیەو لە هەمان کاتدا پارێزگاریش لە بوونەکەی دەکات، وە ڕووبەڕووی ڕەهای دوانەهاتوو دەبێتەوە.

"کیر کجارد" لە بارەی هیگل ەوە دەڵێ:

هیگل ئەو فەیلەسوفەیە کە وێرا "فەلسەفە" بخاتە سەرووی "ئایین" بەلاّم خەڵکی تر فەلسەفەکەی ئەویان بەوە لێکداوەتەوە کە " وێنەیەکی قایلکارە لە فەلسەفەی مەسیحیەت".

ئەوانیتر ناکۆکیان تێدا هەیە لە بارەی خاڵە پۆزەتیڤ و نێگەتیڤەکانی فەلسەفەی هیگل و هەندێکیشیان وایان پیشانداوە کە ئەم فەلسەفە یە سەرەتایەو یان ئەو "بنەڕەتەیە کە ڕەوگەی جیاجیای شیوعیەت و خوانەناسی لێ پەیدابوو". ڕای منیش لەبارەیەوە ئەوەیە کە "ئەو تەنها بیریارێکی بۆرژوازی پرۆتستانتی بووە" وە هەروەها لەبارەیەوە دەشڵێن کە " ئەو گەورەترین بیریار بووە کە کاری کردۆتە سەر هزری ڕۆژئاوایی لە هەردوو سەدەکانی نۆزدە و بیست دا".

بەلاّم ڕای کۆتایی لە بارەی هیگلەوە ئەوەیە کە " تێکڕای ڕێبازەکەی ئەو هیچ نەبووە جگە لە (کۆمیدیایەکی هەڕەمەکی هزری) کە بوە هۆی پێشکەوتنی هزری زانستی لە سەدەی بیست دا بە خێرایی"

ڕێبازەکەی هیگل لەسەر ئەوە بنیات نرابوو کە مێژوو هیچ نی یە جگە لە مێژووی هۆش و پێشکەوتنی هۆش کە ئەمەش یەکسانە بە پێشکەوتنی مێژوو و گەلانی بێ هۆش کە ناتوانین بە گەلانی بێ هۆش بڵێین گەلانی ئازاد چونکە ئازادی وە چنگ ناکەوێ تەنها لای ئەو کەسانە نەبێ کە هۆشیان هەیەو هەست بە گرنگیەکەی دەکەن و دەشزانن کە ئەوان گرنگیەکەی دەزانن، هۆشیش لە ڕێگای عەقڵەوە نەبێ دەستگیر نابێ چونکە عەقڵ جەوهەری مێژووە و هەروەها جەوهەری مرۆڤیشە.

هیگل هەوڵی دا کە مەبەستەکەی لە بارەی فەلسەفەی مێژوو شی بکاتەوەو وتی:

یەکەم: فەیلەسوفی میژوو نابێتە ئاستەنگ لەبەردەم مێژوونوسی ئەزمونگەرایی لە لێکۆڵینەوەی ڕوداوە مێژووییەکان و کۆکردنەوەی زانیاریەکان و کەرستە مێژوویەکان، وەکو بەڵگەنامەو شتی تری لەم جۆرە، فەیلەسوف هەر خۆشی بەمانە سەرقاڵ ناکات، بەڵکو مێژوو بەوە لێکدەداتەوە کە بریتیە لە ڕەنگدانەوەی گیانی عاقڵ لە ڕۆژگاردا.

دووەم: تاکە بیرۆکە کە ئاوێزانە لەگەڵ فەلسەفە و لە مێژوو دەکۆڵێتەوە -بە پێی هیگل- بریتیە لەو بیرۆکە سادەیەی لە بارەی عەقڵەوەیەو دەڵێ عەقل زاڵە بەسەر جیهاندا، مێژووی جیهان لە بەرامبەرمان وەکو ڕێڕەوی عەقڵ خۆی دەنوێنێ. هیگل دەڵێ: "سروشت لە ڕێگای ژمارەیەکی دوانەهاتووی دیاردەکان و وێنەکان خۆیان نیشان دەدات و ئێمە هەست بەوە دەکەین کە پێویستیمان بە یەکەیەك هەیە لە نێوان ئەم هەمەڕەنگیە فراوانەدا و ئەم یەکەیە لە شێوەی ڕەگەزی گشتگیری شاراوە لەودیو ئەم هەمەڕەنگیە خۆی دەنوێنێ. جۆرەکان یاخود سەرجەمەکان بریتین لە تێکڕای ئەوەی کە عەقڵ پێکدەهێنن لە سروشتدا و ئەو گشتگیریەش بریتیە لە ڕاستی کە ماهیەتە و هەستەکان ناتوانن پەی پێ ببەن چونکە نابینرێ و نابیسترێ ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە بوونەکەی تەنها لە پێناوی عەقڵەو بەس".

بەم پێیە سروشت جۆرێکە لە هزر بەڵام نەك لە شێوەی هزری مرۆیی بەڵکو بریتیە لە لاڕێبوونێك لە هزری نائاگایی یان بە پێی قسەی (شلنگ) "بریتیە لە عەقلێك کە دوچاری بەرتەسکبوونەوە بووە".

سێیەم: کەواتە عەقڵ جەوهەری مێژووە هەروەك چۆن جەوهەری سروشتیشە لەگەڵ هەبوونی جیاوازیەکی گرنگ کە بریتیە لەوەی ئەو عەقڵەی کە مێژوو دەبات بە ڕێوە بریتیە لە عەقلێکی ئاگا بە خودی خۆی کە مەبەست لێی عەقڵی مرۆییە. هەرچەندە جوڵەی سیستمی خۆر بە پێی چەند ڕێسایەك بەرێوەدەچێ کە بریتیە لە عەقڵی پەنهان لە دیاردە سروشتیەکان، بەڵام نە خۆر و نە ئەو هەسارانەشی کە بەم یاسایانە بە دەوری دا دەسوڕێنەوە ناگونجێ هیچ پشکێکیان لە ئاگایی بەربکەوێت. بەو پێیەی کە ئاگایی خودی تایبەتە بە مرۆڤ و تەنها مرۆڤ هەیەتی.

چوارەم: مەبەست لەوەی کە عەقڵ جەوهەری مێژووە ئەوە نیە کە ئێمە بیرۆکە فەلسەفیەکان لە ژێر چەپۆکی زانستی مێژوودا لەناو ببەین، بەڵکو ئەمە بەرهەمی پوختەکراوی خودی مێژووشە. پێشکەوتنی مێژووی جیهان بریتیە لە ڕێڕەوی عەقڵ و مێژووش ڕێڕەوی عەقڵی پێویست بۆ گیانی جیهان دروست دەکات. هیگل خۆی لە بیرۆکە سەرەتاییەکان پاراستووە و لە دوتوێی بەڵگەنامەکانی ڕابردوودا کۆی کردونەتەوە لەبەر ئەمەشە کە هیگل ڕەخنەی لە جولەکەکان گرتووە کە خۆیان بە "گەلی هەڵبژێردراوی خوا" دادەنێن و پێیان وایە ڕاستەوخۆ لەو فێربوون و ڕێڕوونی و دانایی کامڵیان وەرگرتووە و زانیاری گشتگیریان هەیە بە هەموو یاساکانی سروشت و گیان.

(ئەنکساگۆراسی یۆنانی) بەر لە هیگل باسی لەوە کردووە کە ئەوەی گەردوون بەڕێوە دەبات (عەقڵ یان تێگەیشتن)ە سۆکراتیش ئەمەی باسکردووە.

هیگل پێی وایە کە عەقڵ گەردوون هەڵدەسوڕێنێ بە جۆرێك کە گەردوون نە لە ئەنجامی ڕێکەوتەوەو نە بە هۆکارە ئاسۆییە دەرەکیەکان بەڕێوە دەچێ، بەڵکو هەڵسوڕاندنی گەردوون لە ژێر چاودێری خوایی دایەو، لە ڕاستیدا چاودێری خوایی بریتیە لەو داناییەی کە یەکسانە بە توانستی بێ پایان کە مەبەستە دواهاتووەکانی گەردوون (عەقڵ) دێنێتە دی، عەقڵ بریتیە لەو بیرکردنەوەیەی کە لە خودی خۆی دا بە هەموو ئازادیەك دێتە دی.

هیگل "وێنەی پێکهاتەیی" کە بۆ مێژوو بەکاری هێناوە بە سێ خاڵ لێکدەداتەوە:

سروشتی عەقل کە ناوی دەنێت (گیان) و سروشتەکەی بە پێی ئەو پێچەوانەی سروشتی مادەیە چونکە ئەگەر ماهیەتی مادە بریتی بێ لە "قورسایی" ئەوا ماهیەتی عەقل یان ڕۆح بریتیە لە "ئازادی". هی یەکەمیان بە کێشکردن کاریگەرە لە کاتێکدا گیان هەموو خاسیەتەکانی تەنها لە ڕێگای ئازادیەوە دەستگیر دەبێت. بە پێی ئەو ئازادی بریتیە لەو چەسپاویە خودیە یان سەربەخۆیی (تۆ ئازادی بەو ئەندازەیەی کە سەربەخۆی)، هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی ڕەوتی مێژوو نوێنەرایەتی نمرەیەکی دیاریکراوی ئازادی دەکات و ئازادی ماهیەتی گیان پێکدەهێنێ.

دووەم: چۆنیەتی وەدیهاتنی عەقل لە مێـژوودا: هیگـل پێـی وایـە کـە هەڵـسوکەوتەکانی خەڵکی بریتیە لە بەرهەمی پێویستیەکانیان و کاردانەوەکانیان و بەرژەوەندیـە تایبەتیـەکانیان بەم پێیەش دەگەینە ئەو ڕایەی کە هەڵسوڕێنەری مێژوو بریتیە لە غەریزەی تێرکردنی ئارەزووە تاکڕەوەکان کە گەورەترین سەرچاوەی ڕەفتارەکانە و گومـان لـەوەدا نیـە کـە پێویـستیە تاکـە کەسیەکان و بەرژەوەندیەکانی بۆتـە پاڵنـەرێك بـۆ تێکـڕای ڕەفتـاری مێـژوویی و هێنانـەدی پێویستیە تاکە کەسیەکان بریتیە لەوەی کە هەر دەبێ لە مێژوو دا ڕوویدا. هیگل گەورە پیاوان بەوە پێناسە دەکا کە ئەوان بریتین لەو کەسانەی کە داخوازیـەکان لـە کـاتی خۆیـدا دەزانـن و دەناسنەو یاخود پێویستە چی بکەن لەو کاتانەدا.

بەم پێیەش بێـت میـسالیەت دوور نیـە لـە واقیـع یـان لـە مێـژوو چـونکە میـسالیەت دروستکراوو داهێنراوێکی تاکە کەسی نیە و هەروەها سروشێکیش نیە لە ئاسمانێکەوە هـاتبێ، بەڵکو پەی بردنە بەوەی کە هەیە و داخوازی ئـەوە دەکـات چـی بکرێـت، واتـە پیـاوی مـەزن نوێنەرایەتی عەقلانیەتی ناواخنی مێژوو دەکات.

سێیەم: ئەو شکڵەی گیان (عەقل) ی تێدا بەرجەستە دەبێ: ئـەم شـکڵە کاتێـك بەرجەسـتە دەبێت کە ویستی خودی و بابەتیانە یان لایەنی خودی یەکدەگرێ لەگەڵ لایەنی بابەتیـدا، ئـەم یەکگرتنە لە سەراپای ڕەوشتدا (دەوڵەت) ڕەنگدەداتەوە. چونکە ئەم یەکگرتنـە تاکـە ڕاسـتی واقیعیە کە تاك ئازادیە تایبەتی یەکانی خۆی تێدا دەدۆزێتەوە بـە مـەرجێك کـە بزانـێ چـی هاوبەشـە بـۆ هـەموان. لێـرەوە دەولـەت دەبێتـە یەکـەی ڕەوشـتی خـودی بابەتیانـە یـان بەرجەستەبوونێکی کرداریە بۆ ئازادی کە تێیدا ئازادی دەگاتە ئاسـتی بابـەتی بـوون، عـەقڵی مرۆڤیش بە سێ شێوازەوە ئاگاداری ئەو ئەو یەکگرتنە دەبێت.

یەکەم: ئایین: کە لە ڕێیەوە دەگەینە شکلێك لەم یەکگرتنە ئاگاییەوە کاتێك مرۆڤی بڕوادار دەگاتە ئاگایی بە گیانی ڕەها.

دووەم: هونەر، کە تێیدا لایەنی خودی و لایەنی بابەتیانە یەکدەگرن.

سێیەم: ئەو فەلسەفەیەی کە وێنەیەکی ئەم یەکگرتنەمان نیشاندەدات (لە نێوان لایەنی خودی و لایەنی بابەتیانە واتە لە نێوان خود و بابەت ).

لە ڕاستی دا مێژوو دەبێ بە ئێستا کۆتایی پێ بێت، بەو واتایەی کە ئێستا حەقیقەتەو واقیعە و ئەوەشی کە لە مێژوودا ڕویداوە بە ئێستا کۆتایی پێ دێ و لە ئێستادا ڕادەوەستێ (واتە داهاتوو ناگرێتە خۆ) چونکە تێڕوانین بۆ داهاتوو دەچێتە خانەی هەواڵپێدان و هیوایەتەکان بەلاّم مێژوو ئەوەیە کە هەر بە ڕاستی لە ڕوداوەکان و فەلسەفە ڕودەدەن.

وجودیەت تەوژمێکی فەلسەفیە کە نرخی مرۆڤ بەرز دادەنێ و جەخت لە سەر شازبوونی دەکاتەوە بەو واتایەی کە مرۆڤ خاوەنی بیرکردنەوەو ئازادی و ویست و هەڵبژاردنەو پێویستی بە ئاراستەکارێك نی یە.

هەندێك لە بیریاران وای بۆ دەچن کە ئەو تەوژمە لە ئاراستەکان و هزرە لێکجیاکاندا خۆی دەنوێنێ، بریتی نیە لە تیۆرێکی فەلسەفی ڕوون و خاوەن شکڵێکی دیاریکراو نییە، بە پێی ئەم تێکەڵ و پێکەڵی و ناجێگیریە تا ئێستا ئەم یەکگرتنە نەیتوانیوە شوێنی خۆی لە نێوان هزرو بیروڕاکان بکاتەوە.

وجودیەتیش فەلسەفەیەکە بریتیە لە پەرچەکردارێك بۆ نیگەرانی مرۆڤ، نیگەرانی لەوەی کە ئایا تاك چۆن ژیانی دەباتە سەر، چ وەکو تاکێکی سەربەخۆ یان وەکو بەشێك لە دەوڵەت، ئەمەش بە پێی چەمکی زۆرینە بارودۆخێکی یاخیبوونی کەسیە لە هەموو شتێك.... ئەم بارودۆخە لە چوارچێوەی شکڵێکی فەلسەفی و دواتریش ژیانیدا بۆ زۆرێك لە خەڵکی خۆی ڕێکخستووە.

وجودیەت بەشێوەیەك بەسەر مرۆڤی سەدەی بیستەمدا تێپەڕی کرد کە نەیتوانی بەردەوام بێ چونکە هەر لەگەڵ تەشەنە کردنی وجودیەت چەندین بیرۆکەی تر تەشەنەیان کرد بە شێوەیەك تاقمەی وادروست بوو کە دوور لە کۆمەڵگا مرۆییە ئاساییەکان دەژیان بەڵکو بە شێوەی تاك تاك ژیانیان دەبردە سەر یاخود بە شێوەیەکی کۆمەڵی لە چوارچێوەی هزرەکەیدا، پاشان لە ڕێی ئەم هزرەوە چەندین تاقم و مۆدێلی جل و بەرگ و هەیکەلی مرۆڤ و

درێژکردنەوەی قژ و هێشتنەوەی ڕیش و شتی تریش سەریان هەڵدا و بڵاوبوونەوە ئیدی وای لێهات هزرەکانی وجودیەت بوونە هزری وتوێژە فەلسەفیەکان لە هەموو کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا، ماددیەکان زیاتر لەوانی تر پەیڕەویانکرد بەجۆرێك کە تێبینی ئەوە دەکرێ کە زۆرێك لە ماددیە شیوعیەکان یان مارکسیەکان بەرەو پیری ڕۆیشتن و کردیان بە هزری خۆیان و ئەم هزرە لە ڕواڵەت و جل و بەرگیاندا ڕەنگی دایەوە، لەوەش زیاتر ڕۆژنامە و گۆڤار و تەمسیل و شانۆکان ئەم هزرەیان پەیڕەو دەکرد و ئەمەش بە شێوەیەك لە واقیعی ژیان ڕەنگی دایەوە کە پلانی بۆ داڕێژرابێ.

ئیرهاب و هەرەشەی ئیسلام لەسەر ڕۆژئاواو سەرقاڵبوونی خەڵك بە دۆزی فەلەستین و دواتریش تەقاندنەوە خۆکوژیەکان و هەڵوێستە توندەکانی ئیسرائیل و سەرهەڵدانی صدام حسین لە گۆڕەپانی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی بە هزرەکانی و بەرەنگاریەکانی وە پاشان دەرکەوتنی گۆرباچۆڤ و پەرەپێدانی بیرۆسترۆیکا (یان شۆڕش و گۆڕانی کارگێڕی) لە جیهانی شیوعیەتداو سەرهەڵدانی بزوتنەوە ئیسلامیەکان لە چیچان و ولاّتانی تر وایکرد کە باڵی ڕاست و چەپی سیاسەت سەرقاڵبن و زۆرترین گەنجیش لە جیهاندا بەخۆیانەوە سەرقاڵ بکەن لەو نێوەندەشدا هزری وجودیەت و بیرۆکەو مومارەسەکردنی لە بەین چوو، وەك ئەوەی کە بڵێی جل و بەرگێك بووەو مۆدێلەکەی بەسەرچووە، هەرچەندە کە هێشتا هزرەکانی وجودیەت لە پەروەردەو ئاراستەکانی و لە فەلسەفەی مرۆیی دا ڕەگی داکوتاوە و دەکرێ جارێکی تریش بگەڕێتەوە بە مەرجێك ئەگەر بێت و بارودۆخی ڕامیاری جێگیر بێت و هێزێکی دووەم لە جیهاندا سەر هەڵبدات کە ئێستا ئەمریکا تاکڕەوانە پێشڕەوایەتی و ئاراستەی جیهان دەکات.

نیگەرانی مرۆیی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی پاڵی بە تاکەکان و گروپەکانەوە نا بۆ ئەوەی ڕێبازی وجودیەت بگرنە بەر لە هزر و ئاکاریاندا، هەروەها ئەمەش کاریگەری خۆی هەبوو لە هزری ڕامیاری جیهانی لە لایەك و هەروەها بزوتنەوە ڕزگاریخوازە جیهانیەکان لە لایەکی ترەوە کە دوایی دێینە سەری پاش ئەوەی کە کرۆکی هزری وجودیەت باس دەکەین، هزری وجودی لەپاش جەنگی جیهانی یەکەمدا زیاتر بەرەو خەست بوونەوە چوو هەرچەندە کە کرۆکی هزری

وجودیەت درێژ دەبێتەوە بۆ مرۆڤی کۆمەڵگا سەرەتاییەکان کە مرۆڤی ئەم ڕۆژگـارە دەیـەوێت لەژێرسایەی شیوعیەت و مادیەتدا بگەڕێتەوە بۆی.

پاشان لەسەرەتای جەنگی جیهانی دووەمدا کاتێك مرۆڤ توشی ناڵەو هاوار بووبوەوە لە بـێ ئومێدی و ئازاری مرۆیی قوڵدا، هزرەکانی وجودیەت دوبارە سەریان هەڵدایەوە.

وجودیەت لە باوەشی لیبراڵیەتی ڕۆژئاوایی دا گەشەی سـەندو کەسـانێکی زۆر پێـشەنگیان دەکرد لەوانە سورین کیرکیجارد و هیدگر و جان پۆل سارتەر، تەنها ئەمەی دواییان یەکێ بـووە لە پێشەنگە گەورەکانی هـزری وجودیـەت کـە لـە سـەراپای جیهانـدا ناوبـانگی دەرکـردووەو سیمۆندی بۆفوار (خێزانە ناشەرعیەکەی) هاوڕێیەتی کـردووە لـە ڕێـڕەوی هزریـدا تـا کۆتـایی ژیانی[١]، ئەو عەقلانیەتەی کە بانگەشەی ئاراستەکردنی عەقڵی دەکرد دژیەکە لەگەڵ فەلسەفەی وجودیەت، چونکە فەلسەفەی وجودیەت وەکو پەرچەکردارێك وایـە لـە بەرامبـەر ئـەو ڕێبـازە عەقلانیەتەی کە لە چەرخی ڕەوشنگەریدا زاڵبوو بەسەر ئەوروپاو بانگەشەی گـشتاندنی هـزری "نەبوون" ی دەکرد لە گەڵ نکوڵی کردن لە "بوونی بەدیهێنەرو دورخستنەوەی ڕۆڵی عـەقڵ".

وای لێهات فەلسەفەی "من" ی تاکەکەسی کە لەسـە لایـەنگیری و نامـاقوڵی بنیـات نرابـوو (منێتی بریتیە لە فەلسەفەی خۆپەرستی "ئەنانیەت") بێ ئاگابوو لەو ڕاسـتیەی کـەوا مـرۆڤ نـاتوانی بگاتـە چـڵەپۆپەی ئازادیـەکانی بـە بەرزکردنـەوەی بـاری "مـن" لەسـەر حیـسابی بەرژەوەندیەکانی کۆمەڵگا و فەلسەفەکەی کەلە یەکێتی خود و بابەت سەرچاوە دەگرێت.

---

[١] سارتەر پێی وابووە کە هاوسەرگیری جۆرێکە لە کۆیلایەتی کردنـی مـرۆڤ بـۆ یـەکێکی تـر هـر بۆیـەش هاوسەرگیری ڕەت کردۆتەوە، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا ژیانی لەگەڵ سیمۆندی بۆفوار دا بردۆتە سەر، واتـە ئـەو هاوسەری بووە بەلاّم بەبێ هیچ گرێبەستێکی شەرعی لە نێوانیاندا کەواتە شۆڕشەکەی لەسـەر گرێبەسـتەکە بووە نەك لەسەر هاوسەرگیری.

(بەو واتایەی کە سارتەر نەیتوانیوە گرنگترین یاسای سروشت ڕەت بکاتەوە کە بریتە لـە هـەبوونی هاوسـەر بەلاّم تەنها لە ڕێگای نەهێشتنی ئەم گرێبەستەوە وای پیشانداوە کە شۆڕشـی کـردووە لـە دژی کۆیلایـەتی کۆمەلاّیەتی مرۆڤەوە کە ئەمەش پێچەوانەی فیترەتی مرۆڤە کە داخـوازی هـەبوونی ژن و مێـرد و دایـك و باوك منداڵ دەکات )، وەرگێڕ

بەڵام وجودیەت هەر خۆی دابەش دەبێت بۆ دوو جۆرە وجودیەت:

١- بریتە لە وجودیەتی بێ دینی یان ئیلحادی کە هیدگر و سارتەر پەیڕەویان دەکرد.

٢- وجودیەتێك کە بڕوای بە ئایین هەیە و لە باوەشی کاسۆلیکدا دروست بووەو گەشەی سەندووە لە پێشڕەوانی ئەم جۆرەی وجودیەت گابرێل مارسیل و کارل پاسبرزن.

هیچ کام لە جۆرەکانی وجودیەت گرنگیان نەداوە بە بونێکی دابڕاو لە خودی ئینسان بەمەش خودی و بابەتی بوونیان لێکداوە و یەکێتی خود و بابەتیان لێ پێکهێناوە. هەردوو جۆرەکەی وجودیەت وەکو باسمانکرد جۆرێك بوون لە کاردانەوە بەرامبەر عەقلانیەت (تەوژمەکانی عەقلی کۆن و نوێ) کە پێی وایە "ماهیەت" وەپێش "بوون" دەکەوێتەوە بەلاّم وجودیەت "بوون" وەپێش "ماهیەت" دەخات.

ئەم بیروڕایە ڕەفزێکی تەواو دەداتە فەلسەفە کلاسیکیەکان بەوەی کە ماهیەت پێش بوون دەکەوێتەوە، بەو واتایەی کە ئەم بیرو ڕایە پێی وایە مرۆڤ لە جیهان لەدایك دەبێ و فڕێ دەدرێتە نێو ژیان بێ ئەوەی هیچ ویستێکی لەسەر بێت.

مەبەست لەوەی کە بوون وەپێش ماهیەت دەکەوێ ئەوەیە کە پێویستە "خود" ببێتە خاڵی سەرەتا چونکە مرۆڤ هیچ نیە جگە لەوەی کە بە خۆی دروستی دەکات، هەر مرۆڤە خۆی ئاڕاستە دەکا بەرەو داهاتویەکی دیاریکراو و هەر تەنها خۆی تواناداره بەوەی ئەندێشە بکات کە لە داهاتودا چی بەسەر دێت، لەم فەلسەفەیەدا مرۆڤ بەشێك نی یە لە سیستمی گەردوونی بەڵکو ئازادە بۆیەش بەرپرسە لە هەموو هەڵس و کەوتەکانی.

وجودیەت جەخت لەسەر ئاگایی دەکاتەوە بەوەی کە ئاگایی بریتیە لە مەزهەری گیانی لە مرۆڤدا لە کاتێکدا وجودیەت لایەنی جەستەیی مرۆڤ پشت گوێ دەخات، مرۆڤ جەستەی خۆی لە پێناوی بەرەنگاربوونەوەی ژیان بەکادێنێ و مرۆڤیش ئازادە چونکە ئازادی بنەڕەتی داهێنان و دروستکردنە، مرۆڤ لە خودی خۆیدا چاکەکارو خراپەکار نیە بەڵکو مرۆڤ ئەڵقەی کۆتایی زنجیرەیەك هەڵوێستە جا بە ئەندازەی سەرکەوتنی لە هەڵبژاردنی هەرکام لەم هەڵوێستانە بە باشی ئەوا دەبێتە چاکەکار، بەلاّم بە ئەندازەی ئەوەی کە بەربەستی بۆ دروست دەبێت لە

هێنانەدی ئەو زنجیرە هەڵوێستانە ئەوا دەبێتە خراپەکار، بەم پێیەش پەروەردەی وجودی لە بنەڕەتدا گرنگی دەدات بە پەروەردەی ئازادی بەرپرس لەوەی کە چۆن خودی خۆی هەڵبژێرێ لە ڕێی ئەو هەڵوێستانەی کە مرۆڤ لە ژیانیدا لەگەڵیاندا دەژی و تێیاندا گیرۆدە بووە.

بابای وجودی هەڵوێستی نێگەتیڤی هەیە بەرامبەر بە پێویستیەکانی بابەتی بوون بە شێوەیەك کە تاکەکانی لێی دادەبڕێن چونکە ئەو پێویستیانە وەکو کۆت و بەند وانە کە بەسەر جوڵەو خودی مرۆیی ئەو کەسەوە داسەپێندراون هەروەکو چۆن بابای وجودی ئەوەندەی بۆی بلوێ تێدەکۆشێ بۆ بەرتەسککردنەوەی ئەو قەید و مەرجانەی کە بەسەر تاکدا داسەپێندراون چونکە پێی وایە مرۆڤ خۆی چارەنوسی خۆی دروست دەکات و کردارەکانی دیاری دەکات بەبێ بوونی کاریگەری عەقڵی و دەرەکی.

پێویستە ئاماژەش بەوە بکەین کە تەوژمی وجودیەت لە بوونی مرۆڤ و ژیانی واقیعی دەکۆڵێتەوە نەك لە بوونی مرۆڤ بە شێوەیەکی گشتی و هەروەها وجودیەکان گرنگی بە زانینی ماهیەت و ڕاستیەکانی مرۆڤ نادەن بەڵکو گرنگی بە بوونی کێشە و ئەزمە و حەز و پێویستیەکانی مرۆڤ لە واقیعدا دەدەن.

بە پێی وجودیەکان ماهیەتی مرۆڤ لە دوتوێی ژیانی واقیعی دا شکڵی خۆی وەردەگرێ کاتێ کە دەژیێ نەوەك پێشتر ئەندازەی بۆ کرابێ و بۆی دیاریکرابێ  لەبەر ئەوەش بیرۆکەی ئازادی تاکەکەسی لە سەری سەرەوەی فەلسەفەی وجودیەت دێت .

وجودیەکان نەیانتوانیوە  نیگەرانی جیهانی وەلا بنێن هەرچەند بابای وجودی لەژێر هزری تاکەکەسی و تەوژمی دابڕانیش دابێت بە جۆرێك کە ئازاریشی چەشتبێ لە ژێر نیگەرانی جیهانی و کاریگەریە دەرونی و کۆمەڵایەتیەکان. شەڕی سارد (کە لە نێوان هەردوو سەربازگەی ڕۆژئاوایی و سەربازگەی ڕۆژهەڵاتی دابوو) ڕوویدا سەرەڕای چەندین هەڕەشەو گوڕەشە و ململانێی سەربازی و دەستاودەستکردنی ناوەکی و گەمارۆ ئابوریەکان و پاڵەپەستۆ هەواڵگریەکان.

پاشان فراوانبوونی بۆشایی ئابووری نێوان هەردوو چینی هەژار و دەوڵەمەندی کۆمەڵگا سەری هەڵدا له ژێر سێبەری ئابووری جیهانی نوێ، بەجۆرێك کە زۆر بواری مرۆیی گەورەی پەراوێزخست، فەلسەفەی وجودیەت هەر بە بەرزی و پتەوی مایەوە لە ڕیزی کۆمەڵێکی دیاریکراوی ڕاگەیاندکار و ڕۆشنبیر. لەسەرەتا وا دەرکەوت کە ڕەگی بڕڕاوە و ئەڵقەیەکی دابڕاوی مێژووە هەرچەندە کە لە ناو بێشکەی لیبرالی ڕۆژئاواییدا سەری هەڵدا و گەشەی سەند بە بێ ئەوەی بە سنووره هزریه بنەڕەتەکان کۆت و بەند بکرێت بە تایبەتیش عەقلانیەت، وجودیەت هیچ وەلامێکی هزری پێ نەبوو بەرامبەر بەو پرسیاره هزریانەی کە ئاراستەی دەکران بە تایبەتیش ئەو پرسیارانەی کە پەیوەندیان بە "نەبوونیەت" و ڕاستی یە بابەتیانەییەکان هەبوو. بەمەش تەنانەت دژی ئاینیش وەستا و بووە هۆی ئەوەی کە ڕووبەڕووی ڕەخنە لێگرتنێکی زۆر توند ببێتەوە لەناوەخۆی کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکاندا.

## له گرنگترین بیرو ڕا و هزرەکانی وجودیەت:

دەتوانین گرنگترین بیر و ڕاو هزرەکانی وجودیەت لەمانەی خوارەوەدا کورت بکەینەوە:

١- وجودیەت بڕوایەکی ڕەهای بە بوونی مرۆڤ هەیەو مرۆڤ دەکاتە خاڵی دەستپێکردنی هەموو بیرۆکەیەك.

٢- مرۆڤ لە لای وجودیەکان کۆنترین شتە لە بووندا، وەلامی ئەوانەش دەدەنەوە کە دەڵێن مرۆڤ نەبووە بەوەی کە بوونی مرۆڤ پێش ماهیەتەکەی کەوتۆتەوە.

٣- ئایینەکان و بیردۆزە فەلسەفیەکان کە لە سەدەکانی ناوەڕاست و نوێ دا هەبوون و کێشەی مرۆڤیان چارەسەر نەکردووە.

٤- مرۆڤ لە سەری پێویستە ڕابردوویەك کە پڕ بووە لە کۆت و بەندی ئایینی و کۆمەلایەتی و لۆژیکی وەلا بنێت و ئاین تەنها بریتییە لە ویژدان کەچی ژیان دەبێ بە ویستێکی ڕەها لە لایەن مرۆڤەوە ئاراستەی خۆی وەرگرێ.

٥- هیچ بەهایەکی جێگیر بوونی نیە کە ئاکاری مرۆڤ ئاراستە بکات و سنوری بۆ دابنێ بەڵکو هەموو مرۆڤێك دەتوانێ هەرچی بیەوێ بیکات، هیچ کەسێکیش بۆی نیە بەها و ڕەوشتی "عەیبە" لەسەر خەڵکی تر دابنێت.

٦- برەو پێدانی سێکس وەکو بەشێك لە ئازادی مرۆڤ.

٧- ئاکاری وجودی بە هەڵاتن لە کۆمەڵگا دەناسرێتەوە.

٨- وجودیەت بە یاخیبوون لە واقیعی مێژوو دادەندرێت، هەرچەندە مێژوو بریتیە لەو کەلەپوورە گەورەیەی کە مرۆڤ لە دوای خۆی جێیهێشتووە.

٩- وجودیەت پەیدابوو وەکو پەرچەکردارێك لە دژی دەستەلاتی کلێسا (ئایین) بەسەر مرۆڤ.

١٠- وجودیەت کاریگەری عەلمانیەتی لەسەر بووەو تەنانەت بە بەشێك لە بەشەکانی عەلمانیەت دادەندرێ.

١١- لە وجودیەتدا مرۆڤ جەمسەری بانگەشەکردنەو بەلای ئەوان مرۆڤ وەپێش ماهیەتەکەی خۆی کەوتۆتەوە.

## کەسایەتیە وجودیەکان:

١- سورێن کیرکیجارد: ئەو کەسەیە کەوا بە یەکێك لە پێشەنگە کردەییەکانی وجودیەت دادەنرێت بە مانای ڕاستەقینەی چەمکی وجودیەت، واتە لێکۆڵینەوەی فەلسەفی لە واقیعی مرۆیی وەکو بوونەوەرێك لە جیهان پرسیار لە بوونەکەی دەکات. کیرکجاد بەدوای ئەزمونی تاکەکەسی خۆی دا دەگەڕا ئەمەش وەلامدانەوەی یەکلاکەرەوەبوو بۆ لۆژیکی عەقلی **کە بە هۆیەوە ئەزمونگەرایی زیندەگی بۆ وتەی بابەتیانەی عەقلی داتاشرا.**

کیرکجارد هۆگری نوسینی خودی و شیکردنەوەی ناواخنی ئەزمونی کەسی خۆی بوو، و لە ڕێی گۆشەنیگا تایبەتمەندیەکانی و لاوەکیەکانی ژیانی تایبەتی خۆی و ژیان بە گشتی گەیشتە

ئەوەی کە ناوی لێ نا "وتە وجودیەکان" وەکو (خودگەرایی)و(دڵەڕاوکێ) و (بێ ئومێدی) و (هەڵبژاردن).

ئەو لە باوکی فێری پشتگوێ خستنی ئایین بوو و هەروەها هەروەها فێری ئەوەبو کە دان بنێ بەو هەڵەیەی کە توشی بێزاری کردو گومان و سەرسامی و دودڵی و دڵتەنگی تێدا ڕواند بە ڕێژەیەك کەوا کیرکجارد خەڵکی تری وا دەهاتە بەرچاو کە بارگرانی ئەو هەڵەیە بن کە لە خوێن و گۆشتی کیرکجارددا هەیە، هەر لەبەر ئەوەش چوە پاڵ قوتابخانەیەکی لاهووتی بەلاَم نەبووە ئەو کاهینەی کە خۆی وێنەی بۆ کێشابوو، بۆیە دەستی کرد بە گۆشەگیری و بڕیاری دا درێژە بەوە بدات کە هیگل دەستی پێکردبوو لە سەرگەرمبوون بە عەقڵی ژیان یاخود گرنگیدانە عەقڵیەکان. بەم شێوەیە ئاراستەی بەرەو مرۆڤ وەرچەرخاند بۆ ئەوەی مرۆڤ ببێتە تەوەری نوسینەکانی و لێکۆڵینەوەکانی و دواتریش فەلسەفەکەی.

دواتر کیرکجارد گەیشتە ئەو رایەی کە مرۆڤ پێویستە "بوون و ئاگایی و بوونگەرایی خۆی لە ژیانی تایبەتی لە جیهاندا بدۆزێتەوە" یان بە واتایەکی تر مرۆڤ پێویستە ئەو زانیاریەی کە هەیەتی لە ژیان و بیرو ڕاکانی دا ڕەنگ بداتەوە تاوەکو بە ڕاستی ببنە مرۆڤ و خودی خۆیان بدۆزنەوە. لە ڕاستی دا وەلاخستنی وێژی [٢] بۆ چارەسەرکردنی لایەنی زیندوی واقیعی ژیانی مرۆڤ بریتیە لەو ڕێگایەی کە پێی دەگەنە بوون، وە (خودگەرایی ) بریتیە لە وتەی وتەکان و ئاگایی دێنێتە دی.

بە پێی ئەو ڕاستی بریتیە لە خودی ژیان و سۆزیش گەورەترین گوزارشتە لە بوون، هزریاری میسالیش ئەو هزریارە خودیەیە کە شتە لاوەکیەکانی عەقڵ وەلا دەنێ تاوەکو هەستەکانی خۆی شی بکاتەوەو پەردەیان لەسەر ڕامالێ.

هزریاری خودی هەر تاکێك خۆی لە خۆیدا کەسێکی وجودی یە، (بوون) لە ئەسڵدا شتێکی تاکەکەسی یە و بوون بە پێی کات و بارو دۆخ و مردن دیاری دەکرێت. ئا لێرەدا بوون دەبێتە بەرپرسیارێتی.

---

٢ مجرد (وەرگێر)

هزریاری خودگەرایی بیریارێکی ئەخلاقی یە و پێویستە لەسەری کە خودی خۆی هەڵبژێرێ بۆ ڕاگەیاندنی خودی ڕاستەقینەی خۆی، مرۆیی بوونی بیریاری ئـەخلاقی بـە بڕیـاردان یـاخود هەڵبژاردن دێتە دی.

بانگەشەکەی بە جەدەلی تاکەکەسی نـاوبرد.. کـە بریتیـە لـەو جولەیـەی (تـاك) دەبێتـە (هەموو) بە جۆرێك کە تاکێك دەبێت تاك بۆ هەموان نەك تەنها بۆ خودی خۆی.

بە پێی کیرکجـارد ڕاسـتی بریتیـە لـە جەدەلیـەت بـەو بیـانوەی کـە ڕاستی بریتیـە لـە گفتوگۆکردن لەگەڵ نەفس و، هەروەها ڕاستی ئەو ناجێگیریەیە کە دەبێتـە هـۆی دروسـتبوونی بیرۆکەو باپەندی.

بەڕای ئـەو هەڵبـژاردن بـە بـێ بـوونی بیرۆکـە و نیگـەرانی هـەر نایەتـەی دی ئەمـەش خاسیەتێکی بوونە بە جۆرێك کە بوون خۆی لە خۆیدا دەبێتە هەڵبژاردن و بوون خۆی کردارێکـە کە فیکر دەرکی پێدەکا لە حاڵەتی کرداری دا و دەبێتە بابەتێك بۆ هزر، هـەروەها تاکەکەسـی یەو هیچ ڕێگا و شێوازێکی نییە بۆ گوزارشت کردن لە خۆی.

**٢- هیدگر:** ئەمەیان لە ڕێگای ئەزمونی تاکەکەسـی خودگـەرایی لێکۆڵینـەوەی لـە بـوون نەکردووە بەڵکو لە ڕێگای شیکاریەکانی خۆی گەیـشتووە بـە حاڵەتـەکانی بـوون و ماناکـانی هەروەکو چۆن کیرکیجارد لە سەرەتاکانی نوسینی لە ڕێگای بوونی تاکەکەسـی یـان(منـی بـە ئاگا) بە لای فەلسەفەی بووندا دەچوو لە ژیانی ڕۆژانەیدا ئەمەش لەبەر ئەوەی کە ئەو کەسـەی کە بەدوای بووندا دەگـەڕێ خۆیـشی هـەر بونەوەرێکـە و خۆیـشی دەبێتـە بابـەتێك بـۆ ئـەو لێکۆڵینەوەیە یاخود بڵێین ئەو کەسەی کە لە بارەی بوونەوە پرسیار دەکات بوونێکەو پرسیار لە بوونەکەی دەکات.

بوونی سەرتاسەری (ئەنتۆلۆژی) بە پێی هیدگر لەگەڵ ئەو بونەی کـە تاکەکەسـی یـەو سەرەتاییە یەکناگرێتەوە، واتە (منی خودی) یەکناگرێتەوە لەگەڵ (مـن) ی ژیـانی ڕۆژانـە لـە جیهاندا.

دواتر هیدگر گەیشتە ئەو ڕایەی کە (بوونی ڕەسەن) و (بوونی نارەسەن) دوو بوونی تەواو لێکجیاوازی سیفەتجیاوازن وە (منێتی) بریتیە لە بوون و گفتوگۆ و هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی تردا (ڕەسەنایەتی) بریتیە لە هەڵبژاردنی خود بۆ خودی خۆی و (نارەسەنایەتی) بریتیە لە هەلاتنی خوود لە خودی خۆی.

(لە دەست چوون) و (نامۆبوون) لە لای هیدگر بریتی نییە لە شکست چونکە شکست بریتیە لە (منێتی) یەك لە جیهاندا کە ناچارە بە بێ بوونی خۆی بژی لە شوێنێکی دیاریکراودا کە بەرپرسە لە بوونی خۆی لە کاتێکدا کە لەدەستچوون بریتیە لە ونکردنی منێتی بۆ توانستی خودی.

(نامۆیی بوون) جوڵەیەکە لە خودەوە بۆ خود هەروەها جوڵەیەکە ڕەسەنایەتیەکەی خۆی دەگۆڕێ.

(بەها بەرزی) لە لای ئەو (کاتی)یە بەو واتایەی کە (نەبوون) تێیدا بوونی هەیە و (داهاتوو) لە لای ئەو واتای (مردن) دەگەیەنێ و هیچ ڕێگایەك نییە بۆ ڕزگاربوون لێی کە واتای "نەبوون" دەگەیەنێ. وجودیەتی مرۆیی بەرپرسیار گوزارشت لە هەڵبژاردن دەکات، (منێتی) پێویستە لەسەری خودی خۆی هەڵبژێرێ بەلاّم نەك ئازادیەکی ڕەها چونکە بوونی هەڵبژاردن سنوردارە. لە دیاردە جەدەلیەکانی بوون لە لای هیدگر بریتیە لە (بەرزی) کە بریتیە لە سەربەستبوون و گەمارۆدان و شکست پێ هێنان و دەرچوون لە خوود کە ئەمەش بوونێکی بێ سیستمە. (بەرزی) بریتیە لە (سەربەستبوون) واتا توانا داری کارا بەسەر بووندا و (ڕەتکردنەوەی) هەر ڕەتکردنەوەیەك بۆ خود و ئەگەری هەبوونی خود هەروەها (گەمارۆدانی) واتە شکستپێهێنانێکی نوێی بوون. هیدگر بە یەکێك لە پایەکانی قوتابخانەی فەلسەفەی وجودی دادەندرێ.

٣- ژان پۆل سارتەر: سارتەر دەگونجێ بخرێتە نێو پۆلی کۆمەڵە ئازادیخوازەکانی سەردەمی بانگەشەکارانی گۆڕانی کۆمەلاّیەتی و ڕامیاری، ئەو بانگەشەکارێك بوو بۆ بەرەنگاربوونەوەی چەرخی بۆرژوازی چونکە چەرخی بۆرژوازی چەرخی لێکهەڵوەشان و داڕوخان و داڕمان بوو،

سارتەر یەکێك بوو لە بانگەشەکارانی نەهێشتنی ئایدۆلۆژیای زاڵبگیر و کۆت و بەندکاری نەریتی، بە پێی سارتەر رۆشنبیری بە ئاگا بە دوو ڕێگا بەرەنگاری ئایدۆلۆژیا دەبێتەوە:

١- مومارەسەکردنی ڕەخنە ی خودی بە بەردەوامی.

٢- بەژداری کردنی چینە بێ بەشکراوەکان لە داواکردنی.

ڕوناکبیر مرۆڤێکە کە لە خودی خۆی و کۆمەڵگاکەیدا دەرك بە هۆشیاری ئەو دژیەکە دەکا لە نێوان لێکۆڵینەوە لە ڕاستی کرداری کە (دەگونجێ جێ بەجێ بکرێ) یان بە شێوەیەکی تر بڵێین ڕەتکردنەوەیەك بە وێنەی نوسەرێك کە بانگەشەی دەستبەرداربوون لە بێدەنگی و هەلاّتن دەکا.

سارتەر نوێنەرایەتی ئیلحاد دەکات لە ڕەوتی وجودیەتدا، وە جارێکیش پرسیاریان لێ کرد لە بارەی ڕای ئەو لەبارەی بوونی خواو وەلاّمی دایەوە بەوەی: ئەگەر خودا بوونی هەبێت هیچ کێشەیەکم نی یە بەلاّم پێم وانی یە خودا دستوەربداتە کاروباری مرۆڤەکانەوە (خوا پەنامان بدا).

هەروەها سارتەر هەموو پەیوەندیەکی کۆمەلاّیەتی ڕەت دەکاتەوە بە هاوسەرگیریشەوە، ئەگەرچی لەگەڵ فەیلەسوفی وجودی سیمون دی بۆفوار لە یەك ماڵدا دەژیان وەکو دوو هاوسەر بەلاّم ئەو بڕوای بە هاوسەرگیری نەبووە، لە هەڵسوکەوتەکانی دا ئەوە دەردەکەوێ کە ئەو ڕقی لە (بەڵێننامە) بۆتەوە نەك هەڵبژاردنی ئافرەتێك بۆ خۆی، ئەم دیاردەیە ئێستا لە ناو زۆربەی میلەتانی ئەوروپا و ئەمریکا پەیڕەو دەکرێت بەڵکو بابای ئەوروپی و ئەمریکی واقی ورماوە لە تێڕوانینی موسوڵمانان کە پابەندن بە داوێنپاکی و ئەمە هیچ مانایەکی نی یە لای ئەوان. جا بەکورتی دەتوانین بڵێین سارتەر نوێنەرایەتی قوتابخانەی ئیلحادیی فەلسەفەی وجودیەت دەکات .

ماناکانی ژیانی ئاسایی و ئایین لە لای فەیلەسوفە وجودیەکانی تر لە ناودەچن وەکو (فرانس کافکا) و (کۆڵن ویلسۆن) بەجۆرێك کە لە ڕۆمانەکانیان مرۆڤ بە جروجانەوەر دەشوبهێنن، بەلایانەوە زۆر ئاساییە وێنەی مرۆڤ سوك بکەن. ئەمە لە لایەك و، لەلایەکی

ترەوە هیچ واتایەك بۆ ژیانیان ناهێڵنەوە چونکە ئەو فەیلەسوفانە خۆیان هیچ کاریگەریەك لە پاش ژیانی خۆیان جێنایەڵن تاوەکو مانایەك بداتە ژیانیان یان بڵێن زۆربەی هەرەزۆریان بوونی خۆیان نەهێناوەتە دی.

زۆربەی فەیلەسوفە وجودیەکان بەرەو ئاراستەی ئەوە دەڕۆن کە فەلسەفەکەیان لە شێوەی چەند ڕۆمانێك وێنا بکەن و بڵاوی بکەنەوە تاوەکو ئەو هزرانەی کە هەیانە لە کەسایەتی زیندو و هەڵسوکەوتیاندا بەرجەستەی بکەن، ئەمەش لە پێناوی ئەوەی فەلسەفەکەیان لە پەرتوکی وشك و بیردۆزانێکەوە بگۆڕن بۆ قالبێکی زیندوی بەرجەستە کراو کە ڕەنگبداتەوە لە چەند کەسایەتیەك کە بە هەڵس و کەوتێکی مرۆیی ئاسایی ڕەفتار دەکەن، جا هەندێك لەو فەیلەسوفانە چەند چەمکێکی نوێ بەکاردێنن لە بری چەمکە وجودیەکان وەکو (ناماقول) بە شێوازێك کە لە دوو توێی بەکارهێنانی ئەو چەمکەدا واتای دوو جیهان دەگەیەنێ:

١- (ماقول) کە جیهانێکی مەنگی ڕۆتینیە کە هەر لە ساتی مرۆڤی یەکەمەوە تا ئەمڕۆ نەگۆڕاوە.

٢- (ناماقول) کە بریتیە لە فەلسەفەی ڕەتکردنەوەو گۆڕان و نویگەری و تاکەکەسی و خودگەرایی.

## فەلسەفەکانی دوای وجودیەت و ئەوانەی پێیەوە گاریگەرن:

(بنیادی) وەکو وەلامێك پەیدابوو لە دژی وجودیەتی سارتەر کە خۆی لە چەمکی زمانەوانی سیستمی پەیوەندیەکانی نێوان مرۆڤەکان چڕ کردەوە، چونکە بەو پێیەی کە بونیادگەرایی بانگەشەی بۆ دەکات مرۆڤ تەنها بەشێکە لە سیستم و بوونەکەشی سنورداره.

بونیادگەرایی ئلیدۆلۆژیا و شیکردنەوەی ئایدۆلۆژی ڕەت کردەوە لە ڕوی پەیوەندیە کۆمەلایەتی و ڕامیاریەکانەوەو، تەنانەت لەمیانەی دۆزینەوەی ڕاستی خودی خۆشی لە پرەنسیپەکانی هێز و زۆرلێکردن پەکی کەوت، لەڕێی ئەو ڕەتکردنەوەوە ویستی زۆرێك لە

مەبەستەکانی بێنێتە دی. وەکو ڕەتکردنەوەی ئەو مەرکەزیەتەی کە بە هێز و زۆرلێکردنەوە لکێندرابو.

**فەلسەفەی بنیاتگەرایی لە ئەنجامی شکستخواردنی وجودیەت پەیدابوو ئەمەش لە شەستەکانی سەدەی ڕابردوو. بناغەی ئەو فەلسەفەیە بریتیبوو لەوەی کە چوار نوسەری فەرەنسی دایانڕشتبوو:**

**١- کلۆدلیفیشتراوس**

**٢- ڕۆلان**

**٣- میشێل فۆکۆ**

**٤- جاك لاکان**

شتراوس بە پێشەنگی بونیادگەرایی دادەندرێ و ئەم فەلسەفەیە بۆ ئەو دەگەڕێتەوە، ئەو چوار نوسەرە لە یەك ڕەگی مەنهەجی دا تێکدەکەنەوە کە ئەویش بریتیە لە (وشەکاری زمانەوانی)، پێیان وایە کە "د" (وەکو یەکەیەکی دەنگی) هەروەها "ئەو شکلەی کە ئەم پیتە ئاماژەی بۆ دەکات" کە (پێکهاتەیەکی خەیاڵیە) بوونیان هەیە. وە لە نێوان "د" و "ئەو شتەی ئاماژەی بۆ دەکرێ" تەرکیزکردنێکی خەیاڵی بوونی هەیە کە وەکو پرۆگرامێکی نوێکەرەوە پەیدا دەبێت، نەك پەیدابوونی تیۆرێکی هزری یان ئایدۆلۆژیایەکی دیاریکراو.[٣]

بنیادگەرایی تەنها پرۆگرامێکە نەك ڕەوتێکی هزری یان ڕامیاری جیا لەوانی تر، هزری سەرەکی ئەو ڕەوتە گرێدراوە بە زاراوەی بنیات، بنیات بە مانای بونیاتنانەوە نوساوە کە خاوەنی ڕەگەز و بنەمای خۆیەتی و هەموو ڕەگەز و بنەمایەك هەڵدەستێ بە ئەرکێکی

---

٣لە زانستی زمانناسی دا دیاردەیەك هەیە کە زمانی مرۆڤی پێ جیادەکرێتەوە لە هی ئاژەڵ، پێی دەڵێن هەڕەمەکی (arbitrariness)، ئەمەش بریتیە لەوەی کە هیچ پەیوەندیەك نیە لەنێوان پیت و شکڵی ئەو وشەیەی کە پیتەکە مەبەستیەتی، بۆنمونە مەرج نیە ئەو پیتانەی کە بۆ وشەی (قەڵەو) بەکاردێن لەشکڵیشدا قەڵەو بن، یان ئەو پیتانەی کە بۆ وشەی (فیل) بەکاردێن، لەشکڵیشدا شێوەی فیل لەسەر کاغەز دروست بکەن، ئەم دیاردەیە لە ئاژەڵاندا پێچەوانەیە. بڕوانە George yule, The study of Language P.١٠ (وەرگێڕ).

دیاریكراو لـه‌م بنیاتنانـه‌، بـه‌لاّم ئـه‌م ئه‌ركانـه‌ هـه‌ركامیان له‌سـه‌ر په‌یوه‌نـدی بنـچینه‌ییه‌وه‌ به‌ویتریانه‌وه‌ په‌یوه‌ستن، هـه‌ركام لـه‌م پێكهاتانـه‌ گرنگیه‌كـه‌ی لـه‌ بنیاتنانـدا ده‌رناكـه‌وێت بـه‌ په‌یوه‌ندی خۆی له‌گه‌ڵ بنه‌ماكه‌ی تر.

لالەنـد بونیاتگـه‌رایی بـه‌وه‌ پێناسـه‌ ده‌كـات كـه‌ " بریتیـه‌ لـه‌ هه‌ماهـه‌نگی یـان هـه‌ر پێكهاتوویه‌ك كه‌ له‌ دیارده‌ له‌سه‌ر یه‌ك كه‌ڵه‌كه‌وه‌بووه‌كان به‌ جۆرێـك كـه‌ هـه‌ر دیارده‌یـه‌ك بـه‌ دوای دیارده‌كانی تره‌وه‌ دێت و "دیارده‌" ڕونادات ته‌نها مه‌گه‌ر به‌ په‌یوه‌ندی له‌گه‌ڵ دیارده‌كانی تره‌وه‌ نه‌بێت".

له‌و پێناسه‌یه‌وه‌ ئه‌وه‌مان بۆ ڕوون ده‌بێته‌وه‌ كه‌ بنیاتگه‌رایی ئاماژه‌یه‌ بۆ "كوللی" یان "هه‌ماهه‌نگی" یه‌كی ڕێكخراو كه‌ له‌ نێو خودی خۆیدا ڕه‌گه‌زی بنه‌ڕه‌تی هه‌یه‌ و هه‌ركامێكیان كار له‌وی تر ده‌كه‌ن، ناتوانین له‌ هـیچ كـام لـه‌م ڕه‌گه‌زانـه‌ تێبگـه‌ین بـه‌ تـه‌نها تێڕوانینێكـی سه‌رپێیی به‌بێ تێڕوانین له‌ ڕه‌گه‌زه‌كانی تر، بـه‌ڵكو بـه‌وه‌ لـه‌ ڕه‌گـه‌زه‌كان حـاڵی ده‌بـین كـه‌ لـه‌ په‌یوه‌ندیه‌كانی نێوان خودی خۆشیان بكۆڵینه‌وه‌.

له‌ بواری زمانـه‌وانی یـه‌وه‌ ئـه‌وه‌مان بـۆ ڕوون ده‌بێتـه‌وه‌ كـه‌ شـیكاری ڕێزمـانی زۆر ڕوكه‌شی یه‌ چونكه‌ شیكاری مانایی زۆر قووڵتره‌، به‌لاّم لـه‌ بـواری زانـسته‌ كۆمه‌لاّیه‌تیه‌كانـدا شتراوس پرۆگرامی بنیاتگه‌رایی له‌ زۆرێك له‌ توێژینه‌وه‌كانی خۆیدا بـه‌كاردێنێ كـه‌ "بونیـاتی نه‌ستی یان قووڵی" دانا كه‌ لـه‌ دیـوی دواوه‌ی دیـارده‌ بینراوه‌كانـدا هـه‌ن و هه‌ماهه‌نگیـه‌كی عه‌قلانی لۆژیكی پێكدێنن كه‌ له‌ لایه‌ك په‌یوه‌ندی نێوان سروشت و كـه‌لتور لێكده‌ده‌نـه‌وه‌و لـه‌ لایه‌كی تره‌وه‌ دیارده‌ كۆمه‌لاّیه‌تیه‌كان شی ده‌كه‌نه‌وه‌.

### شتراوس وه‌كو پێشه‌نگی بونیاتگه‌رایی:

شـتراوس لـه‌ "ئه‌نـسرۆپۆلۆژیای بونیاتگـه‌رایی" كۆڵیـه‌وه‌ له‌سـه‌ر ڕێـسای عه‌قلاّنیـه‌ت و شمولیه‌تی خه‌یاڵی به‌واتای سه‌رقاڵبوون به‌و پرۆسانه‌ی كه‌ له‌ نێو خه‌یاڵی مرۆڤدا بـه‌ شـێوه‌یه‌كی گشتی دێ و ده‌چـێ. شـتراوس دیـارده‌ ئه‌نـسرۆپۆلۆژیه‌كان بـه‌ سیـستمێكی دیـاریكراو لێـك ده‌داته‌وه‌: به‌وه‌ی كه‌ سیستمێكی لێكبه‌ستراوه‌ و هه‌روه‌ها سیستمی ئه‌فسانه‌یه‌ له‌سه‌ر بنچینه‌ی

وشەکاری زمانەوانی وە لە ڕێی ئەم پرۆگرامەوە ویستی لە شێوازی بیرکردنەوە حاڵی ببێت کە هەموو ئادەمیزادەکان تێیدا هاوبەشن بەپشتگوێخستنی کارتێکەرە کاتی و شوێنیەکان، واتە بە جۆرێکیتر بڵێین ئیسپاتکردنی یەکێتی هزری مرۆیی لەو ساتەی کە دان بە تایبەتمەندیەکانیان دا دەنێت. شتراوس بۆی دەرکەوت کە زۆربەی دیاردە کەلتوریەکان وەکو تەکنەلۆژیاو ڕێکخستنی ڕامیاری پێویستە بچنە ژێر بایی ڕێککارە کۆمەلآیەتیەکان یان ئایکۆلۆژیەکان لە دوتوێی ژینگەی سروشتیدا.

شتراوس ئاراستە بنیاتگەراییەکەی لە ڕێی جەدەلی نێوان عەقلآنیەت و ئەزمونگەرایی دیاریکرد، پاشان بۆی دەرکەوت کە کلتورەکان ڕێك بە پێی ڕێککارە ناوخۆییەکانی خەیاڵی مرۆیی گەشەدەکەن، نەك تەنها وەکو وەلآمدانەوەیەك بۆ پێویستیە دەرەکیەکان.

**میشێل فۆکۆ:**

فۆکۆ جەختی کردۆتە سەر ڕێککارە دەرەکیەکان کە لە گوتاری گشتی دووردەکەوێتەوە یان وردتریش بڵێین گوتاری ڕامیاری، واتە ئەوەی کە پێویست نی یە بگوترێ یان ئەوە کە دەگونجێ بگوترێ، سەرەڕای ئەوەی کە تیۆرێکی ڕامیاری بۆ دانەنا بەڵکو پێی وابوو کە ئەو ڕێککاریانە دەگونجێ ڕاست و هەڵە لێکجیا بکەنەوە.

وا پێ دەچێ ئەو ڕێسایانەی کە پێیان دەوترێ دورخستنەوەو فۆکۆ باسی لێوەکردون بچنە نێو خانەی سیستمی تۆتالیتاریەوە بە جۆرێك کە زاڵبگیری و زۆرداری کۆمەلآیەتی و ڕامیاری تێدا بەدی دەکرێ، چ جای ئەگەر سەرچاوەکانی دورخستنەوە بچنە ژێردەستی یەك کەسی دیاریکراو یان دەزگایەکی ئەمنی کە بانگەشەی بەرگری کردن لە نیشتیمان یان ولآت یان گەل بکات؟.

ئەگەر فۆکۆ ڕاڤەکردنێکی هەماهەنگ نادۆزێتەوە بە ئەندازەی ئەوەی کە ڕەوانبێژی زمانەوانی پێشکەشمان دەکات، ئەوا ناچارە پەنا بباتە بەر ویستی تاکی ڕۆژئاوا لە مێژووی هاوچەرخدا لە پێناوی گەیشتن بە زانیاری بە بێ گەڕانەوە بۆ مێژووی کۆن.

به ڕای فۆكۆ هێز له ئه‌نجامی ویستی تاكێك یان گروپێك نایه‌ته‌دی به‌ڵكو هێز له ئه‌نجامی زۆرلێكردن دێته‌دی به چه‌ندین شێوازی جیاجیا ته‌نانه‌ت ڕاستیش له ڕێگای زۆرلێكردنه‌وه دێته‌دی. ئه‌م به‌رنامه‌یه به ماركسی بوونی فۆكۆ ده‌رده‌خات، چونكه ئه‌و ڕای خۆی به هیچ بیر و ڕایه‌كی ئایینی یان تایه‌فی نه‌به‌ستۆته‌وه و شێوازی تێڕوانینی ناڕاسته‌وخۆی به‌كارهێناوه.

به ڕای فۆكۆ ژیاری ڕۆژئاوا به‌ره‌و داڕمان ده‌چێ به‌بێ ئه‌وه‌ی هیچ جێگره‌وه‌یه‌كی هه‌بێت، فۆكۆ ڕۆڵێكی گرنگی گێڕا له‌وه‌ی كه په‌رده‌ی لادا له‌سه‌ر دیارده‌ی به‌كارهێنانی ته‌كنه‌لۆژیا بۆ نه‌هێشتنی ئایدۆلۆژیای زاڵ به چاولێسووركردنه‌وه‌ی ده‌سه‌ڵات و ڕووبه‌ڕووبوونه‌وه‌ی مه‌ركه‌زیه‌تی ده‌سته‌ڵات.

**ڕۆلان بارت:**

به پێچه‌وانه‌ی سارته‌ر ڕۆلان بارت بروای به یه‌كبونێكی سه‌راپا نی یه له مرۆڤێكدا، به‌ڵكو ئه‌و بڕوای به یه‌كبوون هه‌یه و پشتگیری له هه‌رشتێك ده‌كا كه لێكدابڕێندراو و چه‌ندانه كراوه و فه‌لسه‌فه‌كه‌ی له‌سه‌ر شیكردنه‌وه دامه‌زراوه به جۆرێك كه تاك شی ده‌بێته‌وه‌و ده‌بێته چه‌ندانه.

**جان لاكان:**

جان لاكان فرۆیدی بووه به پشت به‌ستن به شیكاریه ده‌رونیه‌كانی فرۆید پێی وایه كه حه‌زه تاكه‌كه‌سیه‌كان و ویسته‌كانیان له‌سه‌ر ئاستی "من" و "تێكڕا" دا كارده‌كه‌ن، هه‌روه‌ها ئه‌و ئایدۆلۆژیاو شیكردنه‌وه‌ی ئایدۆلۆژی ڕه‌تكرده‌وه. بنیاتگه‌رایی دووباره گه‌ڕایه‌وه ناو عه‌قلانیه‌ت و بوونی خۆی تێدا دۆزیه‌وه له ده‌ره‌وه‌ی لیبڕالیه‌تی كۆن چونكه بنیاتگه‌راییه‌كان كۆشش ده‌كه‌ن له دژی بۆرژوازیه‌ت. ئه‌و بۆرژوازیه‌ته‌ی كه لایه‌نێكی گه‌وری ئابووری و كۆمه‌ڵایه‌تی ماركسیه‌تی پێكهێنا. بونیاتگه‌راییه‌كان له دژی تاكه‌كه‌سی و فه‌لسه‌فه‌ی "من" ده‌وه‌ستنه‌وه‌و كۆشش ده‌كه‌ن.

بونیاتگه‌راییه‌كان مێژوو به ڕاڤه‌یه‌كی مادی لێكناده‌نه‌وه هه‌روه‌ك چۆن ماركسیه‌كان ده‌یانكرد، چونكه مرۆڤی تاك زیاد له شكڵێكی دیاریكراوی نی یه، واته مرۆڤ به پێی تیۆری

لاهوتی کلاسیکی کائینێکی بەشەری نی یە بە ئەندازەی ئەوەی کە بەشێکە لە سیستەمێکی دیاریکراو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بونیاتگەراییەی کە لە وجودیەتی سارتەرەوە سەری هەڵدا بە نارِوونی مایەوە، لە بەر ئەوە چەرخێکی بە دوای خۆی داهێنا کە بە" سەردەمی دوای بونیاتگەرایی" ناسرا، کە جاك دریدای بونیاتگەرایی پێشڕەوایەتی دەکرد[٤].

---

٤ دکتۆر صباح بەرزنجی لە گۆڤارێکدا خوێندنەوەیەکی کردووە بۆ هزری وجودیەت لەژێر ناونیشانی (سەرنجێك لە وجودیەت Existentialism)، دەڵێ:

وجودیەت لە بنەڕەتدا کاردانەوەیەکی مرۆڤی ئەوروپی بوو لەدژی سەرمایەداری لەلایەك و مارکسیزم لەلایەکی ترەوە.

لە سەرمایەداری دا مرۆڤ مەوجودێکی بەرەڵڵاو لەمارکسیزمدا مرۆڤ مەوجودێکی دەست بەسەر بوو، لەسەرمایەداری دا مرۆڤی درۆینە، لە مارکسیزمدا مرۆڤی قالب گرتوو، ئەم دوو جۆرە مرۆڤە یەك لە یەك ترسناکترن.

وجودیەت لە سەرەتادا یاخی بوونی مرۆڤ بوو لە دژی ئەو دوو کارەساتە.

بیردۆزە مرۆڤ دۆستەکان لە چەرخی هەژدە بەدواوە لەبەرامبەر کارەساتی دژ بە مرۆڤانەی سەرمایەداری و ماشینیزمی خۆرئاواوە هەستیان بە مەترسی کردو بەشێوازی جۆراوجۆر هێرشیان کردە سەرو لەم بوارەدا ئەدەبیاتێکی دەوڵەمەندو زیندویان دەستەبەر کر، کە مارکسیزم دواتر توانی سودێکی زۆری لێ وەربگرێت بۆ مەحکوم کردنی کاپیتالیزم.

(ڕیمۆن ئارۆن) لەم بارەیەوە گوتویەتی: (مارکسیزم تەنها بریتیە لە کۆکردنەوەیەکی زیرەکانەی ئەو وتانەی غەیری خۆیان گوتویانە).

مرۆڤایەتی لە عەزرەتی جەهەننەمی سەرمایەداری، ڕووی لە بەهەشتی مارکسیزم کرد. جاران مرۆڤ لەخزمەتی سەرمایەدا چۆکی دادابوو، ئەمجارەیان خۆی بوو بە ئامرازی بەرهەمهێنان و زاتیەتی خۆی لەپێناوی کۆمەڵگای بەرهەمهێنەردا تواندەوە، بە ئومێدی هاتنەدی خەونەکانی مارکس و یارەکانی لە مەعبەدی کارخانەو کێڵگەکاندا دەستەونەزەر وەستا.

بەڵام ئەمجارەشیان مرۆڤ بەشی ئەسارەت بوو، مرۆڤ لە سیستەمی سەرمایەداری دا گیاندارێکی ئابووری بوو، لە سیستەمی مارکسیزم دا بووە شتێکی مونەززەم کە دەبێت لەژێر کارلێکردنی جەبری مێژووی دا، لەژێر بەرداشی دژایەتی ناوخۆیی چینایەتی دا وردو خاش ببێت.

لە کاردانەوەی ئەو دوو سیستەمە پڕ لە ستەمەدا وجودیەت ملی قوت کردەوەو گوتی مرۆڤ دەبێ خۆی خۆی بخولقێنێ. بەکوردی وجودیەت کاردانەوەی مرۆڤی سەرلێشێواوی سەراب بردووی ئەوروپا بوو لەبەرامبەر سوڵتەی کڵێسا و سیستەمی سەرمایەو کۆت و بەندی ماتریالیزمی دیالکتیك.

دوای جه‌نگی جیهانی دووه‌م گه‌لانی ئاسیاو ئه‌فریقا ڕوویان له ناسیۆنالیزمی دژ به ئیمپریالیزم كردو بۆ ڕه‌سه‌نایه‌تی خۆیان گه‌ڕانه‌وه، به‌لاّم مرۆڤی دابڕاو له دینی ئه‌وروپا، كه له هه‌موو شتێك بێزارو قوتار بوبوو، ون بوونی خۆی له وجودیه‌ت دا بینیه‌وه، به‌لاّم ئه‌م هه‌لّفرینه‌ی وجودیه‌تیش تا سه‌ر نه‌بوو، سه‌ره‌نجامه‌كه‌ی له پوچگه‌راییه‌وه سه‌ری ده‌رهێنا. وجودیه‌تی سارته‌ر جۆرێكی تر بوو له ماتریالیزم.

جیاوازی وجودیه‌ت و ماركسیزم ئه‌وه‌یه كه ماركسیه‌ت ماددیه‌تێكی ڕووته‌و وجودیه‌ت شیركێكی ماددییه. ئه‌گینا هه‌ردوكیان له‌سه‌ر ماتریالیزمی دیالكتیك وه‌كو جیهانبینی ڕێككه‌وتون. وجودیه‌ت ئه‌و ئازادیه ده‌دات به مرۆڤ كه هه‌رچی ده‌یه‌وێت بیكات به‌لاّم كه دێته‌سه‌ر ئه‌وه‌ی مرۆڤ به‌ره‌و كوێ ده‌چێ، بێ وه‌لاّم و ده‌سته‌وه‌ستان ده‌وه‌ستێ. چونكه هه‌ر مه‌به‌ستێك تۆ هه‌لّیبژێریت هیچ جیاوازیه‌كی له‌گه‌لّ مه‌به‌سته‌كانی تر نییه جگه له‌وه‌ی كه تۆ ئه‌مت هه‌لّبژاردووه‌و ئه‌وانی تر خه‌لّكی دیكه هه‌لّیان بژاردوون، واته ئاوه‌دانی له‌هیچ جێیه‌ك نییه‌و ئامانجێك نییه كه مرۆڤ هه‌نگاوی بۆ لابنێ، كه‌واته ئه‌نجامی وجودیه‌ت ده‌بێته ئه‌وه‌ی له‌ده‌ره‌وه‌ی مرۆڤ هیچ پێوه‌رێك نییه كه كرداره‌كانی پێ بپێورێت، مرۆڤ خۆی پێوه‌ری خۆیه‌ت.

به‌لای ئێمه‌شه‌وه وه‌كو ئیسلامی، ئه‌م فه‌لسه‌فه‌یه له كه‌ش وهه‌وایه‌كی ناسروشتی و نائارامدا كه مرۆڤه‌كان هه‌ست به غوربه‌ت و پووچی ده‌كه‌ن خۆی ده‌نوێنێ، كاتێك مرۆڤه‌كان له‌ژێر باری مه‌ینه‌تی و هه‌ل و مه‌رجی ناله‌باری كۆمه‌لاّیه‌تی و گوشاری سیسته‌می سه‌رمایه‌و بێ كاریدا، واته له ئه‌نجامی لاسه‌نگ بوونی ترازووی بایه‌خه‌كان ده‌گه‌نه حالّه‌تی پووچی و بێ مانایی و له‌خۆ بێگانه بوون، پاش داكه‌وتنی زۆر دروشم و شیعاری قه‌ومی و حیزبی گروپیی ناچارن، چونكه له سه‌رچاوه‌ی ڕوون و هه‌ست و شعوری ئیماندارانه دوورن هه‌لّوه‌دای سه‌رابی ئه‌و جۆره فیكره سه‌یرو سه‌مه‌ره‌و بێ ناوه‌ڕۆكانه بن كه زاده‌ی هه‌ل و مه‌رجێكی جیاوازو كاردانه‌وه‌ی بارودۆخێكی تایبه‌ت و له‌دایك بووی قۆناغێكی مێژووی پێش ئێستان، كه‌واته مه‌سه‌له‌كه ته‌نها له‌وه‌دا خۆلاسه نابێته‌وه كه ئه‌زمه‌یه‌كی فیكری له‌ئارادایه، چونكه په‌ره‌سه‌ندنی وجودیه‌ت كاتی خۆی له ئه‌وروپاش ته‌نها له‌به‌ر بوونی ئه‌زمه‌ی فیكر نه‌بووه، وجودیه‌ت كاتێك سه‌ریهه‌لّدا كه باقی فیكره ده‌ستكرده‌كان گه‌یشتنه بن به‌ست و له‌باتی چاره‌سه‌ری كێشه‌كانی مرۆڤ بوونه سه‌به‌بی قولّ بونه‌وه‌ی زامه‌كانی.

وجودیه‌ت له كۆمه‌لّگایه‌كدا سه‌رهه‌لّده‌دات كه جگه له ئه‌زمه‌ی فیكرو ئه‌زمه‌ی عه‌قلّ ئه‌زمه‌یه‌كی ئه‌خلاق و ڕه‌وشت له ئارادابێ. هه‌رچه‌نده هه‌ندێ كه‌س ده‌یانه‌وێت ئه‌م فه‌لسه‌فه‌یه به قۆناغێك له قۆناغه‌كانی په‌ره‌سه‌ندنی فیكری فه‌لسه‌فی ئه‌وروپی له‌قه‌لّه‌م بده‌ن، به‌لاّم له‌ڕاستیدا وجودیه‌ت ته‌وژمێكی یاخی بوون و ڕوبه‌ڕووبونه‌وه‌ی ئه‌و ئاڕاسته تاك گه‌راییه‌ی فه‌لسه‌فه‌ی ئه‌وروپی یه، كه له‌پێناوی تاكدا هه‌مو بایه‌خێكی ئینسانی ژێر پێ ده‌خات.

به‌كورتی وجودیه‌ت هه‌ولّدانێكه بۆ چاره‌سه‌ری كێشه، نه‌ك چاره‌سه‌ری كێشه‌كه.

(له‌م نوسراوه‌دا سود له نوسینێكی د. عه‌لی شه‌ریعه‌تی (أنسان و اسلام) بینراوه).

(وه‌رگێڕ)

# پراگماتیزم[1]

## پێناسه‌ی پراگماتیزم :

چه‌مكی پراگماتیزم یان پراگماتیه‌ت پێكهاتووه له وشه‌یه‌كی یۆنانی كه به مانای "كار" دێت و له‌م وشه‌یه‌ش وشه‌كانی "به‌كرده‌بیكردن" و "كرداری" هاتوون. ئه‌م زاراوه‌یه هه‌وڵ ده‌دا هه‌موو بیرۆكه‌یه‌ك به "به‌دوای یه‌كداچون" و "به‌دوای یه‌كداهاتن" لێكبداته‌وه بۆ زانینی ئه‌نجامی به‌رهه‌مه كرداریه‌كانی هه‌ركامێكیان چونكه تێگه‌یشتن و تێڕوانینی ئێمه به‌رامبه‌ر به مانا گشتگیریه‌كانی ئه‌م به‌رهه‌مانه یه‌كسانن جا چ ڕاسته‌وخۆ بێ یان ناڕاسته‌خۆ. كه‌واته پراگماتیزم بریتیه له بیركردنه‌وه‌مان بۆ هه‌ر بابه‌تێك یان شتێك به تێڕوانینێك كه خاوه‌نی مه‌به‌ست و گرنگیی پۆزه‌تیڤی خۆی بێت.

پراگماتیزم ڕه‌وتێكی ڕامیاری وه‌رگرت له گه‌وره‌ترین وڵاتی جیهاندا، وڵاته یه‌كگرتووه‌كانی ئه‌مریكا ئه‌مڕۆ ده‌یه‌وێت جیهان به‌ره‌و ئاراسته‌ی ئه‌م قوتابخانه‌یه ببات، به‌ڵكو ڕاستتر بڵێین ده‌یه‌وێ ئه‌زمونی ئه‌م بیرۆكه‌یه له وڵاته یه‌كگرتووه‌كانی ئه‌مریكاوه به‌سه‌ر هه‌موو گه‌لانی جیهاندا بسه‌پێنێت، و له ڕاستی دا سروشتی گه‌لی وڵاته یه‌كگرتوه‌كانی ئه‌مریكاو سیستمه ڕامیاریه‌كه‌ی هانده‌رن بۆ قبوڵكردنی فه‌لسه‌فه‌ی پراگماتیزم، به‌ڵام ئه‌م ئه‌زمونه له وڵاتانی تردا به ده‌یان ئاراسته‌ی جیاوازه‌وه بردراوه بۆیه ئه‌م بیرۆكه‌یه ناتوانرێ به سه‌ركه‌وتوو دابنرێت به تایبه‌تی ئه‌گه‌ر ڕه‌چاوی ئه‌وه بكه‌ین كه ئاین و ئایینزاكانی ئه‌و میلله‌تانه به تایبه‌تی (ئیسلام) ڕه‌تی ئه‌وه ده‌كه‌نه‌وه كه ببێته كێڵگه‌ی تاقیكردنه‌وه‌ی هزرێكی دیاریكراو له دیموكراسیه‌ت،

---

[1] له‌وانه‌یه د.عدنان سید حسن سه‌ركه‌وتووترین كه‌س بێ له پوخته‌كردنی بابه‌تی پراگماتیزم، ئه‌و رونیكردۆته‌وه كه ئه‌م چه‌مكه له‌وه ده‌رچوه كه ته‌نها كۆمه‌ڵه هزرێكی دیاریكراو بێ به‌ڵكو پوخته‌یه‌كی فه‌لسه‌فی گشتی یه كه بایه‌خ به كاروباری مرۆڤ و كۆمه‌ڵگا و ده‌وڵه‌ت ده‌دات.

چونکە ئەو میللەتانە بیرۆکەی (ئامانج ڕەوایی دەدات بە هۆکار) بە تەواوی ڕەت دەکەنەوە.
ئەمە لە لایەك، لە لایەکی ترەوە ئەو جیهانە ڕۆحیەی کە ئەو میللەتانەی تێدا دەژین وایان لێ دەکات کە ئەم هزرە ڕەت بکەنەوە، چونکە سەرکەوتنی شتێك یان شکستهێنانی ناتوانێ ببێتە هۆی ڕاگرتنی ئەو ڕێسا شەرعیانەی کە ئەو میللەتانە بڕوایان پێی هەیە و پێیان وایە کە لە ئاسمانەوە نێردراونەتە خوارەوەو ناکرێ مرۆڤ بە ئارەزوی خۆی یاریان پێ بکات.

ئا بەم شێوەیە ناگونجێ ئەزمونی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی لە جیهانی ئیسلامیدا لە سەر فەلسەفەی بەراوردکردنی بەرهەمە وەدیهاتوەکانی ئەرزی واقیع بنیات بنرێ. واتە ئەگەر پراگماتیزم هەوڵدەدا بۆ جێبەجێکردنی ئەو هزرانەی کە لە ئەرزی واقیعدا بە بەرهەمی پۆزەتیڤەوە دێنە دی ئەوا گەلانی ڕۆژهەڵات خاوەنی هزری ئاسمانین و پێشتر لە ئەرزی واقیعدا ئەزمونیان لەو هزرانەدا هەبووە کە دەگونجێ لە هەموو بارودۆخێکدا جێبەجێ بکرێن، ئەوەش بە کرداری ئیسپاتکراوەو سەلمێنراوە بە درێژایی ڕۆژگار لە هەموو بارودۆخێکدا، چونکە ئیسلام ئایینی هەموو کات و شوێن و قۆناغێکە.

پراگماتیزم فەلسەفەیەکە کە پێوەرە بۆ هەموو بیرۆکەیەك و هەڵێدەسەنگێنێ بەوە کە تا چەندە بەرهەمی هەیە لە ئەرزی واقیعدا، ئەم فەلسەفەیە ناوێکی تری هەیە و پێیەوە ناسراوە کە بریتیە لە "**بیانوگەریی**" کە لە سەر بنەمای تێڕامان لە بەرهەمە کرداریەکان کار دەکات کە تاك بە ئاواتە پێی بگات لە ڕێی هزرەکانی و بیرۆکەکانیەوە، ئەمەش فەلسەفەی "چارلس پێرێز" ە C.peirce (١٨٣٩-١٨١٤).

کە پوختەکەی بەم شێوەیەیە:

(هزری ڕاست ئەو هزرە سودبەخشەیە کە شایەنی جێبەجێکردنە لە ئەرزی واقیعدا).
پراگماتیزم تەنها لەسەر پێرێز نەوەستا بەڵکو فەیلەسوفی تری ئابوری و کۆمەڵایەتی و

پەروەردەیی پڕاگماتی پەیدابوون لەوانە: ولیام جەیمس و جۆن دیوی و هی تریش..، ئەمانە ڕاکانیان زۆر لە بیرۆکەکانی پێرێس دەچوون کە ئەمەی خوارەوە پوختەکەیەتی:

(مانای ڕاستەقینەی هەر هزرێك لە بەرهەمەکەی دا دەردەکەوێ و، مومارەسەی کرداریش بەڵگەیە لەسەر ڕاستێتیەکەی)، ئەمەیە ڕاستی کرداری، بەڵام ڕاستیە ڕووتەکان ئەوانەن کە دابڕاون لە واقیع، ئەمەش بەڕای ئەوان جۆرێکە لەئاوات و میسالیەت. لەم سۆنگەیەوە بابای پڕاگماتی ئەوکەسەیە کە حەز بە ڕاستیەکان دەکات بەهەموو جۆرو کەرستە خاوەکانیەوە، ئەمەش هێنانەدی تاڕادەیەك ئەستەمە، ئەزمونێکە کە ڕووداوەکان بڕیاری لەسەر دەدەن، بە تایبەتمەندیکردن و جیاکاری و پێوەلکان...، ڕاستیەکان بەوە تێبینی دەکرێن کە لەبارودۆخی تایبەتی دیاریکراودا کاردەکەن و پاشان گشتگیر دەبن. ڕاستیش لەلای ئەو ناوێکە بۆ پۆلێنکردنی هەموجۆرە بەها کارتێکەرە دیاریکراوەکان لە ئەزموون دا، هزری ڕاستەقینە لە پڕاگماتیزم بریتیە لە دەستکەوتنی بەرهەمی واقیعی لە ژیانماندا. بەڵام "کەسێکی عەقڵی" ئەوکەسەیەکە هۆگرو دەمارگیرە بۆ بنچینە وێژی یەکان و نەمرەکان، و کاراکتەرێکی نیانی هەیە، عەقڵگەراییەو پشت بە بنەماکان دەبەستێ، دووربینە، میسالی یە، گەشبینە، ئایینپەروەرە، باوەڕدارە بە ویستی ڕەها، تاکڕەوەو دڵنیایە.

ڕاستەقینە لەلای کەسێکی عەقڵی بریتیە لە تەنها داتاشینێك کە پێویستە هەر لەگەڵ ناوهێنانی دا ملی بۆ کەچ بکرێ، بەڵام بیرۆکەی ڕاست ئەو بیرۆکەیەیە کە سودە پێویستیە لۆژیکیەکانی یەکلا دەکاتەوە. هەروەها لەپاڵ فەلسەفەی پڕاگماتیزمدا هەندێ هزری کرداری تریش لە کۆمەڵگای ئەمریکیدا پاڵپشتی لێکرا، لەوانە فەلسەفەی (ئەمبریقیە) Empiricism کە لەسەر بنچینەی ( تێبینیکردن و تاقیکردنەوە) گەشەی سەند، واتە هەڵبژاردنی زانستی لەمەیدانی زانستە سروشتیەکان.

هەردوو فەلسەفەی پڕاگماتیزم و ئەمبریقیە لەم شتانەی خوارەوەدا هاوبەشن:

- لە هزری ئەوروپی میسالی یان میتافیزیکی داماڵراون، بەمانایەکی تر پەرچەکرداری میسالییەتن.
- ئەم فەلسەفانە بەیەکەوە هەڵسان بە دانانی پرۆگرامێکی ئەزمونگەرایی و گشتاندنێکی ئەوتۆ کە دەکەوێتە دەرەوەی سنوری زانستی سروشتی (ماددە) و بوارە کۆمەڵایەتی و مرۆییەکان دەگرێتە خۆ.

هەروەکو چۆن پراگماتیزم لەگەڵ ( تیۆری سودگەرایی utilitarianism ) یەکدەگرن لە دورخستنەوەی قوربانی دان لە پێناو ئامانجێکدا کە بەرهەمەکانی لەبەرچاوان نین یاخود بەرهەمە پۆزەتیڤەکان ناگرنە خۆ، ئا لێرەوە ئەم دوو هزرە هەڵسەنگاندنی مرۆیی ڕەتدەکەنەوە، بە بیانووی گەڕانی بەردەوام بەدوای سود و ئەنجامی وەدیهاتوو.

جا لەژێر ڕۆشنایی ئەم دوو تیۆرە ئیمبریقی و سودگەراییەدا زۆر قورس دەبێت کە پراگماتیزم لێکدانەوەیەکی ئاشکرا و پێناسەیەکی ڕوونی بۆ بکرێت.

دکتۆر عدنان سید حسین پێی وایە کە جیاوازیەك لە نێوان پراگماتیزم و ژمارەیەك لە بەها ڕۆحی و ئەخلاقی و ئایینیەکاندا بەدی دەکرێت، هەروەك دەڵێ (ئایینی ئیسلامیشی لێ بەدەر نیە) بەوە کە پراگماتیزم چەند بنەمایەکی گشتی داڕشت بە چاوپۆشی لە کارتێکەرە کاتی و شوێنیەکان، یاخود ئایا سودی بۆ مرۆڤ تێدایە یان نا، بە جۆرێك کە پەیوەندیان بە بوون و مرۆڤ و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیە مرۆییەکانی کۆمەڵگایەك و کۆمەڵگاکانی ترەوە هەبوو، کە سوود نابێتە تاکە پێوەر بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ شتەکان و دیاردەکان، بەڵکو چەندین بیرو ڕا و بەها هەیە کە مادی نین و لە ڕێی مادەوە هەستیان پێ ناکرێت.

دکتۆر عدنان شتێکی پشتگوێخستوەو باسی نەکردووە، ئەویش ئەوەیە کە ئایینەکانی جولەکەو نەسڕانی لەڕوی فەلسەفەی پڕاگماتیزمدا نەوەستان، بەڵکو ئەم تیۆرە لە هەردوو

جیهانی مەسیحیەت و جولەکەدا جێی خۆی کردەوە بە بێ ئەوەی گوێبیستی هیچ دەنگێکی ئایینی بین کە ڕەتی بکاتەوە یان هزرێکی دژ بە ئەو بەرز بکاتەوە، هەروەك چۆن پێویستە ئاماژە بەوەش بکرێت کە ئیسلام خاوەنی سیستەمێکی ئابووریە کە بۆ هەموو کات و شوێنێك گونجاوەو هیچ ڕێیەکی بۆ ئەوە نەهێشتۆتەوە کە ئایا سودی هەیە یان نا، چونکە ئیسلام هەموو خێر و بێرەو تەنها بۆ مرۆڤ داندراوە، جا کاتێك پراگماتیزم ڕەچاوی بەرهەم و مەبەستەکان دەکات ئەوا ئیسلام هەر بۆخۆی ڕەچاوێکی گشتگیرانەی هەموو بەرهەم و پێشهاتەکانی بەیەکەوە کردووە.

هزری ئایینی بە دوای ڕەهایی(موتلەق) دا دەگەڕێ لە کاتێکدا پراگماتیزم بە دوای ئەو بەرهەمانەدا دەگەڕێ کە لە ئەنجامی جێبەجێکردنیان لە ئەرزی واقیعدا دەستدەکەون... یاخود بڵێین ئەو بەرەنجامانەی کە سوودیان هەیە بۆ مرۆڤایەتی. ئەو ڕەهایەی کە پەیامی محمد ی پێ دابەزیوە، بە پێی زانستی هەمیشەیی خوای گەورە سودی هەیە بۆ مرۆڤایەتی. ئیسلام پێویستی بە تاقیکردنەوە نیە بۆ دەرخستنی سوودەکانی. نرخ و بەهاکردارییەکانی ئیسلام بریتین لە بەرەنجامەکانی، چ لە بواری تیۆری بێ یا لە بواری جێبەجێکردن بێت، ئەمەش لە ماوەی حوکمی ئیسلامی دا سەلمێندراوە.

بابەتی ڕەهایی –بە پێی دکتۆر عدنان- لێرەدا جێبەجێ نابێ تەنها لەسەر ئایینی مەسیحیەت نەبێ، ئایینناسەکان ئەم ئایینە بۆ ئایینی ڕەهایی و ئایینی ڕەوشتی پۆلێن دەکەن، هەروەها مەسیحیەت خاڵیە لەو بنەما جیاجیایانەی کە لە ئایینی ئیسلامدا هەیە یان لە ئایینی یەهوودیەتدا بۆنمونە تەلمود بریتیە لە کۆمەڵێك تەشریعاتی یەهوودی کە جیان لەوەی لە تەوراتدا هەیە، ئەگەرچی ئەوەندەی تەشریعاتە ئیسلامیەکە گشتگیر نیە.

کڵێسا لە ماوەی سەدانساڵی حوکم کردنی لە ئەوروپا فەشەلی هێنا لە جێبەجێکردنی هەر تەشریعێکی ئابووری پۆزەتیڤ، ئەمەش لەبەر ئەوەی ڕویان لە بەندایەتی کردن وەرگێڕا بەرەو دەرەبەگایەتی و شەڕی خاچپەرستی (لە ناوخۆ و دەرەوە) و تەنانەت هەڵسان بە بەکارهێنانی پلیتی لێخۆشبوون (صكوك الغفران)، ئەمە بە بێ ئەوەی ڕوانینێکی ڕون و ئاشکرایان بۆ مرۆڤی ئەو سەردەمە (سەردەمی پاپایی) هەبووبێ. لەگەڵ دۆزینەوەی ئەمریکا بارو دۆخەکە گۆڕا، چونکە خەڵکی ئەمریکا دووربوون لە دەسەلآتی کڵێسای کاسۆلیکی و لەسەریان نەبوو هەموو ئامۆژە ئابووری و ڕۆشنبیریەکانی وەرگرن، ئەمە لە لایەك، لە لایەکی ترەوە، کرانەوەیەکی هزری ئابووری و ڕامیاری و هەروەها ڕۆشنبیری سەریهەڵدا کە پەرچەکردارێکی توند بوو بۆ هزری ئایینی مەسیحی کاسۆلیکی پاپایی، لەم ڕوانگەیەوە دەبینین ئەگەر پڕاگماتیزم هزرێکی لاهوتی ئایینی سەلماندبێت ئەوا بێگومان ئەم هزرە نرخێکی هەیە لە ژیانی هەستپێکراوی مرۆڤ و پێیان دەگوترێت هزرە ڕاستەکان واتە تا ئەم ئاستە هزری سودبەخشن بۆ ئادەمیزاد. بەلآم لە هەر ئاستێکی تردا (لە کاتێکی تردا) ڕاستی ئەو هزرە دەکەوێتە سەر پەیوەندی ئەو هزرە لەگەڵ ڕاستیەکانی تر کە ئەوانیش پێویستە دانیان پیا بنرێ ( لێرەوە دەبینین پێویستە بسەلمێندرێت کە هزرەکانی ئایین نرخ و بەهایان هەیە لای پراگماتیزم، "بەها"ش بە مانای "سود" دێت).

بۆیە هیچ بەرەنگاریەکی مەسیحیەکانی ئەمریکا نابینین دژبە سودگەرایی یان ئیمبریقیەت یاخود پراگماتیزم، بەڵکو بە پێچەوانەوە یەکانگیربوونێکی تەواو هەیە لەگەڵ هەموو ئەو هزرانەی کە سەر بە ئەزمونگەرایین چونکە مرۆڤ چووەتە نێو جیهانێکی نوێ.... و ناچارە بیرۆکەو هزری وا وەربگرێت کە دورە لە هزرە پاپاییەکان و دەبێ بیرۆکەی وا تاقیبکاتەوە کە بیگەیەنێتە ئەنجامی نوێ .... ئەنجامیش لە ئەرزی جێبەجێکردن نەبێ دەرناکەوێت واتە لە

واقیعی کرداری... بەم شێوەیە هزرەکانی پراگماتیزم گەشەی سەند و فراوان بوو تا سەری کێشا بۆلای تیۆری "مەبەست ڕەوایی دەدات بە هۆکار".

## دیموکراسیەت لای پراگماتیەکان:

پراگماتییەکان پێیان وایە دیموکراسیەت دەبێ لە بێژینگی موماره‌سەکردن بدرێ پێش ئەوەی نمونەیەك بێت بۆ ئەوەی شوێنی بکەوین، ئەوان بڕوایان بە سیستمێکی ڕامیاری دیموکراسی میسالی نیە و ئایدۆلۆژیە گشتگیر و سەراپاگیرەکان ڕەت دەکەنەوە وەکو "مارکسیەت" کە بۆ مەبەستێکی دیاریکراو هەوڵ دەدات، کە لە باسی مارکسیەت دێینە سەری و باسی دەکەین.

سەرکردەی پەروەردەیی پراگماتیزم "جۆن دۆی" پێی وایە کە دیموکراسیەت بە بەراورد لەگەڵ شێوازەکانی تری ژیان، تاکە شێوازە کە بڕوای بە دڵسۆزی ئەزمون هەیە، هەم وەکو مەبەست و هەم وەکو هۆکار کە پشت بە زانست دەبەستێ، جا لەحاڵی جێبەجێکردنی دیموکراسیەتدا ئەگەر هەر شێوازێکی ژیان سەرنەکەوێت ئەوا بێگومان دەبێتە هۆی تەسککردنەوەی تواناکانی ئاڵوگۆڕ و پەیوەندیەکان و جگەلەمەش توانستی ئەو کاریگەرییانەی لە دەست داوە کە لەڕێیەوە ئەزموون ڕەگەکانی توند دادەچەقێنێ و پتەو دەبێ. (واتە بە لاوازبوونی هەر بوارێکی ژیان ، ئەگەری جێبەجێکردنی دیموکراسیەت وەکو ئەزموون لاوازدەبێ) لەهەمانکاتیشدا بە بەهێزی بوارەکانی ژیان دیموکراسیەت بەرەو فراوانی دەچێ و هەروەها دەوڵەمەندیش دەبێ، لە کاتێکدا کە دیموکراسیەت ئەو هزرەیە کە ناکرێ تەنها لە ڕێی گەیشتن بە ئەزمونی کۆتایی مەبەستەکەی وەدەست بێنین، بێگومان ڕۆڵی دیموکراسیەت بریتی دەبێت لە ئەنجامدانی ئەزمونی ئازاد تر و مرۆیی تر.

**دکتۆر عدنان سەید حسین کۆمەڵێك بنەماو هزرو ڕێسای لەبارەی ناوەڕۆکی پراگماتیزم باسکردوون، وەکو:**

١- پراگماتیزم پرۆگرامی ئەزمونگەریی تاقیکاری بەکاردەهێنێ لە پێوانەکردنی ئاستی ڕاستێتی هزرو تیۆرەکان، بەوپێیەی کە هەموو هزرێك تەنها گریمانەیە هەتا ئەوکاتەی کە ملکەچ دەبێ بۆ تاقیکاری زانستی.

٢- گرنگی هەر بیرۆکەیەك بە پێی ئەو بەرهەمە پێوانە دەکرێ کە بە دەستی دێنێ، ئەمەش بریتیە لە هەبوونی ئەنجامی کرداری پێش ئەوەی ببێتە بیرۆکەیەکی ڕووت.

٣- پێشنیارکردنی چواچێوەیەکی نوێی دیموکراسی کە لەسەر مومارەسەکردن دەوەستێ نەك هزر و بیری میسالی پەیوەست بە دیموکراسی، وە هەروەها هیچ سیستمێکی دیموکراسی میسالی ویژی نیە.

٤- پڕاگماتیزم ئایدۆلۆژیا گشتگیرو شمولیەکان ڕەتدەکاتەوە، ئەمەش لەسەر پرەنسیپی مومارەسەکردنی ئازادی و پێویستی فراوانکردنی سنوری ئەو ئازادیە. لەمەشدا پڕاگماتیزم لەگەڵ مارکسیزم دا تێکدەگیرێن.

٥- ڕاستیەکان دەگۆڕێن بەئەندازەی ئەوەی کە تاقیکردنەوە زانستیەکان لە ئەرزی واقیعدا گۆڕانکاریان بەسەردادێ، کەواتە ڕاستی بەپێی جیاوازی ئامانج و بەرژەوەندی دەگۆڕێت.

٦- پڕاگماتیزم هزرو ئازادی لەیەکتر جیا ناکاتەوە، هەروەها جیاکاری ناخاتە نێوان زانستی تیۆری و زانستی جێبەجێکاری، بەلاّم بیروباوەڕو بەها ڕەهاکان ڕەت دەکاتەوە، لەمەشەوە جیاکاری ناخاتە نێوان بەرژەوەندی گشتی و بەرژەوەندی تایبەتی.

٧- زۆربەی ڕامیاریکارە پڕاگماتیەکان ڕویانکردۆتە جێبەجێکردنی تیۆرە سودگەراییەکان، ئەمەش لەچوارچێوەی ئەوەی کە هەمیشە بەدوای بەرژەوەندی و ئامانجە خوازراوەکاندا دەگەڕێن.

بەم شێوەیە دەبینین کە ئەزمونی دیموکراسی پێویستە بە تاقیکردنەوەکاندا ڕەت بێت تا دەگاتە کۆتاییەکەی، ئەمەش بۆ ناساندنی کۆتاییەکەی کە بریتیە لە ئازادی و مرۆیی بوون بە فراوانترین ماناکانیان... لە کاتێکدا سیستمی ئیسلامی کە چەندین سەدە کاری پێکرا ئەمەی بە تەواوی سەلماند بە بێ ئەوەی پێویستی بە تاقیکاری هەبێت، چونکە ئەم سیستمە پشتی بە چەند دەقێکی خوایی دەبەستێت کە هەندێ ڕۆڵی دەدا بە عەقڵی مرۆڤ (ئیجتیهاد) لەو بارو دۆخە دیاریکراوانەی مرۆڤەکان پێویستیانە.

## پێناسه‌ی ( زۆمبارت ) بۆ سه‌رمایه‌داری:

به ڕای ئه‌و سه‌رمایه‌داری بریتیه له پێكهاته‌یه‌ك كه دان ده‌نێت به گیانی" ڕه‌واپێدانی ڕه‌هاو سه‌ركه‌شی"، ئه‌مه له‌لایه‌ك، له‌لایه‌كی تره‌وه بریتیه له گیانی بۆرژوازیه‌ت كه به ڕه‌چاوكردن و عه‌قلانیه‌ت جیاده‌كرێته‌وه، پاشان زۆمبارت به‌راوردێك ده‌كات له نێوان مرۆڤی ئاسایی به‌ر له‌وه‌ی كه ببێته سه‌رمایه‌دار و پێی وایه كه چالاكیه ئابوریه‌كان هۆكارێكن ته‌نها بۆ تێركردنی پێویستیه سروشتیه‌كان، له‌گه‌ڵ مرۆڤی سه‌رمایه‌دار كه ڕه‌گه‌كانی مرۆڤی ئاسایی له بنه‌وه هه‌ڵكێشاوه و هه‌موو هه‌وڵێكی ته‌نها بۆ كۆكردنه‌وه‌ی پاره و هێنانه‌دی زۆرترین قازانجه بۆ زاڵبوون به‌سه‌ر چالاكیه ئابوریه‌كان و له‌م پێناوه‌شدا هه‌موو شتێك ده‌خاته گه‌ڕ له ژیاندا.

## پێناسه‌ی ماركس بۆ سه‌رمایه‌داری:

سه‌رمایه‌داری سیستمێكه كه كه‌مینه‌یه‌ك تێیدا ده‌ست ده‌گرن به‌سه‌ر ماڵێكی زۆری به‌رهه‌مهێنان به هه‌موو جۆره‌كانیه‌وه له كاتێكدا كه زۆرینه ته‌نها ده‌ستی كاره، تاكه‌كانی چینی یه‌كه‌م (سه‌رمایه‌داره‌كان) به فرۆشتنی ده‌ست و بازوی تاكه‌كانی چینی دووه‌م (پرۆلیتار) ده‌بنه خاوه‌نی پاداشتێكی زۆر و هه‌روه‌كو كالایه‌ك مامه‌ڵه‌یان له‌گه‌ڵ ده‌كه‌ن. ئا لێره‌دا پرۆلیتار ناچاره ده‌ست وبازوی خۆی بفرۆشێ بۆ سه‌رمایه‌داره‌كان چونكه هێزو توانای پرۆلیتار تاكه سه‌رچاوه‌ی بژێوی ژیانیه‌تی و به‌مشێوه‌یه‌ش چالاكی به‌رهه‌مهێنان له سیستمی سه‌رمایه‌داریدا له سه‌ر شانی چینی پرۆلیتار به ڕێوه ده‌چێ.

## پێناسه‌ی هۆپسۆن:

هۆپسۆن سه‌رمایه‌دازی به‌وه پێناسه ده‌كات كه بریتیه له ڕێكخستنی كار له‌سه‌ر ئاستێكی فراوان له لایه‌ن خاوه‌ن كاره‌وه یان كۆمه‌ڵێك له بزنسمانه‌كان كه خاوه‌نی ماڵێكی له‌سه‌ریه‌ك كه‌ڵه‌كه بوون، كه ڕێگای بۆ خۆش ده‌كات بۆ گه‌یشتن به كه‌رسته خاوه‌كان و به‌كرێگرتنی كار به مه‌به‌ستی به‌رهه‌مهێنانی زۆرترین بڕی سامان و له هه‌مان كاتدا ده‌ستكه‌وتنی زۆرترین سوود.

**د.ئەحمەد جامیع** وا پێناسەی دەکات کە سەرمایەداری بریتییە لە ڕێکخستنی چالاکیە ئابوریەکان لە کۆمەڵگادا لەسەر ئەو بنەمایەی کە کەسێکی سەرمایەدار یان کۆمەڵە کەسێك ( کە لە کۆمپانیا سەرمایەداریەکاندا کۆدەبنەوە) هەڵدەستن بە لێکگرێدانی سەرمایەکانی خۆیان و ئەو کەرەستە خاوانەی کە پێشتر کڕیویانە و هەروەها دەستی کاری بەکرێگیراو لە شکڵی پڕۆژەیەکدا کە پێی دەوترێ پرۆژەی پیشەسازی، ئەمەش لەپێناو چنگکەوتنی ڕێژەیەکی سامانی زۆر لەوە زیاتر کە هەریەکێکیان بە تەنها دەستیان دەکەوێت[١].

## پێناسەی ئەبوئەعلای مەودودی بۆ سەرمایەداری:

مەودودی زۆر بە کورتی و بە ڕاشکاوی پێناسەی سەرمایەداری دەکا بەوەی کە : خاوەنداری تاکڕەو و ڕەها لەوەی کە دەستی دەکەوێت و ، هیچ کەسێك مافی تێدا نیە جگە لەو، هەر خۆی مافی ئەوەی هەیە مامەڵەی پێوە بکات بەو جۆرەی کە خۆی دەیەوێت و مەبەستیەتی و هەروەها مافی خۆیەتی کە ئەو ماڵە قۆرخ (احتکار) بکات لە ڕێگای هۆکارەکانی بەرهەمهێنانەوە، هەروەها دەتوانێ خەرجیشی نەکات تەنها لەو ڕێگایە نەبێ کە سودێکی ئێجگار زۆری بۆ بگەڕێنێتەوە[٢].

**پێناسەی سەرمایەداری هەروەکو لە (الموسوعة الميسرة فی الأديان)دا هاتووە:**

سەرمایەداری بریتییە لە سیستمێکی ئابووری کە خاوەنی فەلسەفەیەکی کۆمەڵایەتی و ڕامیاریە، لە سەر بنەمای گەشەپێدانی ماڵی تاکەکەسی و پارێزگاریلێکردنی کار دەکات، بە مانا فراوانەکەی ئازادیەوە[٣].

---

[١] الرأسمالية الناشيئة، د. أحمد جامع لاپەڕە ٥،٦،٧ خانەی المعارف

[٢] أسس الإقتصاد بين الإسلام والنضم المعاصرة، أبو الأعلى المودودی، لاپەڕە ١١

[٣] الموسوعة الميسرة فی الأدين والمذاهب المعاصرة، لاپەڕە ٢٣١، چاپی دووەم

## سەرەتای سیستمی سەرمایەداری:

ئەگەر بمانەوێ ئەو کاتە دەستنیشان بکەین کە پێکهاتەکانی سیستمی سەرمایەداری تێدا دروست بوو ئەوا بۆمان دەردەکەوێ کە سەرمایەداری لە سەرەتای سەدەی شازدەمەوە چەکەرەی کرد، بەلاَم ئەگەر بمانەوێ کاتی پێگەیشتنی سیستمی سەرمایەداری دەستنیشانبکەین، ئەوا بۆ مان ڕوون دەبێتەوە کە دەکەوێتە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەمەوە[٤].

**سەرمایەداری بە سێ قۆناغدا تێپەڕی کرد:**

**قۆناغی یەکەم:** سەرماداری تازەپێگەیشتوو: لە نیوەی سەدەی هەژدەمەوە دەست پێدەکات و بەردەوام دەبێ تا چارەگی کۆتایی سەدەی نۆزدە، لە دەورەبەری ساڵانی ١٨٨٠.

**قۆناغی دووەم:** سەرمایەداری بەرفراوانبوون: لە چارەگی کۆتایی سەدەی نۆزدەمەوە دەستپێدەکات و لە سەرەتای سەدەی بیستەوە کۆتایی پێدێت.

**قۆناغی سێیەم:** سەرمایەداری گەشەسەندوو: لە سەرەتای سیەکانی سەدەی بیستەوە دەست پێ دەکات و تا ئێستاش بەردەوامە[٥].

## کارتێکەرە مێژووییەکانی دواوەی سیستمی سەرمایەداری:

## سیستمی دەرەبەگی:

دوای هەرەسهێنانی ئیمراپۆریەتی ڕۆمانی لەسەدەی پێنجەمی زاینیەوە، وڵاتانی ئەوروپا دابەشبوون بۆ وڵاتانی بچووك و ناوچەی جۆراوجۆری جوگرافی بەلاَم کاریگەری یاسا ڕۆمانیەکان لەسەر عەقڵیەتی پیاوانی ئەوڕوپا هەر مابوو، سەرۆك و دەرەبەگەکان لە هەموو

---

[٤] الرأسمالية الناشئة، لاپەڕە ١٣

[٥] سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١١٣

ناوچەکانی ئەوڕوپا تاکڕەوانە فەرمانڕەوایان گرتەدەست و بەم شێوەیە سیستمی دەرەبەگی لە ئەوڕوپا سەری هەڵدا، کە گرنگترین خاسیەتەکانی بریتی بوون لە:

١- دان بەوەدادەنێت کە خاوەنداریکردنی خاك بنەمای زاڵبوونی مرۆڤە و بەمە مرۆڤ پلەی بەرزدەبێتەوەو هێز و دەستەڵاتی لە دەستدا چڕ دەبێتەوەو دەبێتە خاوەنی مافی ڕەها، ئەمەش بە بیانوی پاراستنی ئاسایشی ئەو خاکە، لێرەوە پەیدابوونی چینایەتی ڕەگی داکوتا.

٢- کڵێسای مەسیحی: کە لە ئەوروپای ئەوسا خاوەنی هێز و دەسەڵاتی سەرەکی خۆی بووە و بەمەش دەستی لە پشتی سیستمی سەرمایەداری دەدا و یارمەتی دەدان و بە بیانوی ئایینیەوە پشتگیری لێدەکردن و، لەمەشەوە سیستمی کۆمەڵایەتی و ئابووری ئەوسا و ئەدەب و فەلسەفە کڵێسایان ناچارکرد کە وا دەربخات خوا ئەوەی هێناوەتەدی.

## بزوتنەوەی ژیانەوە (renaissance):

ئەم بزوتنەوەیە توانی گۆمی وەستاوی ئەوڕوپا بشڵەقێنێ، لەلایەك موسوڵمانان لە ئیسپانیا فەرمانڕەواییان گرتە دەست و لە لایەکی تریشەوە جەنگە خاچپەرستیەکان لە ئارادابوون، ئەم دوو هۆکارەش وایانکرد ڕۆژئاوا پەیوەندی بە وڵاتانی ترەوە بکات. ماوەکانی نێوان هەردوو سەدەی چواردە و شازدە بە ماوەی ئینتیقالی نێوان چەرخی ناوەڕاست بۆ چەرخی هاوچەرخ دادەنرێ لە مێژووی ئەوڕوپا، بە جۆرێك کە هەموو بوارەکانی ژیان لە ڕۆژئاوا بەرەو ژیانەوە چوون، ئەمەش لەژێر کاریگەری هۆکارە دەرەکیەکان، پێشڕەوانی ئەم بزوتنەوەیە بۆرژوازیەکان بوون لە "بازرگانەکان و سوخۆرەکان و پیشەوەر و پیشەسازەکان" چونکە ئەوان لە دانیشتوی شارەکان بوون و پەیوەندیان بە دەرەوە دەکرد، بەڵام بەهۆی کۆت و بەندی هزری و ئایینی و کۆمەڵایەتی کە لە لایەن کڵێساوە بەسەریان سەپێنرابوو، ببوە بەربەست لەبەردەم ڕابوون و بوژانەوەیان، لەمەوە ناچاربوون جەنگێکی سەراپا لە دژی هەردوولا بەرپا بکەن (پیاوانی

ئایینی و ده‌سه‌لاتداران) له‌ هه‌موو بواره‌كان ژیاندا، كار گه‌یشته ئه‌وه‌ی له‌سه‌ده‌ی شازده‌دا ده‌ره‌به‌گه بچوكه‌كان خۆیان خسته پاڵ ویلایه‌ته گه‌وره‌كانه‌وه و به‌مه‌ش ده‌سه‌ڵاتی كلێسا به‌ره‌و لاوازی چوو ترسی له‌ دڵی گه‌لان نه‌ما، نه‌ته‌وه‌كانیش هه‌ڵسان به بنیاتنانی كلێسای خۆماڵی نه‌ته‌وه‌یی سه‌ربه‌خۆ و ته‌نانه‌ت هه‌ڵسان به شكاندنی زاڵبگیری كلێسا و ده‌ره‌به‌گه‌كان به‌سه‌ر خه‌ڵكه‌وه. چینی بۆرژوازی له‌ كۆت و به‌ندی دیلی ڕزگاری بوو هه‌روه‌ها هه‌موو ئه‌و ڕێسا كۆمه‌لایه‌تیانه‌ی شكاند كه سیستمی كۆنی ده‌ره‌به‌گی به‌سه‌ریدا سه‌پاندبوون.

## ڕه‌وتی ئازادی "سروشتگه‌راییه‌كان"

هه‌ندێك كه‌س هه‌ڵسان به‌ به‌رزكردنه‌وه‌ی دروشمی ئازادی به‌ مه‌به‌ستی بانگكردنی خه‌ڵك بۆ ئازادی و لێبورده‌یی و سینگفراوانی له‌ هه‌موو بواره‌كانی ژیاندا، ئه‌مه‌ش له‌به‌ر ئه‌وه‌بوو كه‌كلێسا پێشتر ناوی خوا و ئایین و ڕه‌وشتی به‌كارهێنابوو به‌مه‌ستی پارێزگاریكردن له‌و بیرو ڕا پوچه‌ی كه‌ به‌رزی كردبۆوه و بۆ پارێزگاری كردن له‌و ئیمتیازاته ڕه‌وشت به‌زێنانه‌ی كه كلێسا و پیاوانی ئایینی به‌خۆیان ڕه‌وا ده‌بینی و توندوتیژی و زۆره‌ملێییان له‌ پێناودا ئه‌نجام ده‌دا، له‌ لایه‌كی تره‌وه كلێسا ته‌واو سنوره‌كانی به‌زاندبوو له‌ زیاده‌ڕۆیی و مكوڕی و كه‌لله‌ڕه‌قی، به‌ئه‌ندازه‌یه‌ك كه ناوی ئازادی و لێبورده‌ییشی له‌پێناو چه‌واشه‌كاریه‌كانی زڕاندبوو.

## كوده‌تای پیشه‌سازی:

داهێنانی ئامێره‌كان له‌ سه‌ده‌ی هه‌ژده هۆكاری ڕاسته‌وخۆبوون بۆ ئه‌و كوده‌تا پیشه‌سازیه‌ی كه‌ ڕویدا، چینی بۆرژوازیه‌كان نزیكترین كۆمه‌ڵبوون كه توانیان ئه‌و بارودۆخه‌ی كه كوده‌تا نوێكه له‌ خۆشگوزه‌رانی و ڕه‌فاهیه‌ت و ده‌سه‌ڵات به‌رهه‌می هێنا بقۆزنه‌وه بۆ دامه‌زراندنی سیستمێكی نوێ به‌ ناوی "سیستمی سه‌رمایه‌داری هاوچه‌رخ" كه چه‌ندین كارگه‌و كارخانه له‌

ژێر ئەم سیستمەدا بنیاتنران، نەك هەر ئەمەش بەڵکو پیشە و پیشەسازی کۆن بەرەو نەمان چوون بە ئەندازەیەك کە هیچ بوارێکی بۆ نەمایەوە و خاوەنی ئەم پیشانە ناچاربوون بچنە شارەکانەوە و وەکو کرێکار لە کارخانە زەبەلاحەکاندا کار بکەن.

## ڕەوتی ئازادی و نوێگەری لە چەرخی نوێدا :

پیاوانی ئەم ڕەوتە بە گروتینێکی نوێوە هاتنە ئاراوە و گیانی دیموکراسیان کردە بەری ڕامیاری و بە گیانی تاکەکەسیەوە هەنگاویاننا بەرەو مەدەنیەت و کۆمەڵایەتی و ئەدەب و ڕەوشت و هەروەها گیانی ڕزگارکردن. ئەوانەی کە هەڵگری مەشخەڵی ئەم ڕێبازەبوون، بانگی خەڵکیان دەکرد بۆ ئازادی و لێبوردەیی و سینگفراوانی لە هەموو بوارەکانی ژیاندا بەو پێیەی کە پێشتر کڵێسا ناوی خوا و ئایین و ڕەوشتی بەرکارهێنابوو لە پێناوی پارێزگاری کردن لە بەرژەوەندی و بیروڕا چەوتەکانی و ئەو ئیمتیازاتانەی کە بە زۆرەملێیی و توندو تیژی بەسەر خەڵکیەوە بەدەستی هێنابوون، لە لایەکی ترەوە زیادەڕۆیی و مکوڕبوونی کڵێسا لە سنوری خۆی دەرچوو، لەژێر ناوی ئازادی و لێبوردەیی و ڕەوشتدا هەموو خراپەکاریەکی ئەنجامدەدا[٦]، وە هەروەها ئەو بزوتنەوەیە پێی وابوو کە وڵات نابێت دەستبخاتە نێو کاروباری ئابوریەوەو تاکەکان دەبێ ئازادی خۆیان پڕاکتیزە بکەن لە مامەڵەکردنیان لە کاروباری ئابوری دا، چونکە سیستمی ئابووری دەچێتە ژێرباری یاسا سروشتیەکانەوە کە بەرژەوەندیە گشتیەکانی خەڵك دەپارێزێت[٧]، ئەو فەیلەسوفانەی کە پاڵپشتی ڕێسا سروشتیەکانیان دەکرد ئەمانەبوون، بۆ نمونە "جۆن لۆك" کە مافی موڵکدارێتیشی خستە پاڵ یاسا سروشتیەکانەوە بە وتەی خۆی (هەموو

---

[٦] أسس الإقتصاد بين الإسلام والنضم المعاصر، بە دەستکاری کردنەوە- لاپەڕە- ٣٢-٣٩

[٧] الإتجها الجماعي في التشريع الإقتصادي الإسلامي، د.محمد فاروق النبهان – لاپەڕە ٢٨

تاکێك دەبێ بەروبومی کارەکەی بخوات) پاشان "جانجاك ڕۆسۆ" هات کە ڕایگەیاند خەڵکی دەبێ بە سەرپشککراوی و ئازادیەوە بژین و یەکسان بن لەژێر یاسای سروشتدا، هەروەها هەندێك لە فەیلەسوفەکان هەوڵیاندا تاك ڕزگاربکەن لە ژێر چەپۆکی یاسا. لەوانە، دیکارت کاتێ دانی نا بەوەی کە بناغەی مەعریفەت بریتیە لە تاك و لەم بارەیەشەوە دەڵێ (من بیر دەکەمەوە، کەواتە من هەم[٨]) . هەروەها ڕەوتی ئازادی بە سیاسەتی ئازادی ئابووریەوە دەبەستێتەوە کە گرێنتی ئەوە دەدات هاوسەنگی نێو کۆمەڵگا بپارێزێت و هەموو ئەو کێشانە چارەسەر بکات کە لە ئەنجامی ئەو ئازادیەوە پەیدا دەبن.

## ئەرکی دەوڵەت بە پێی ئەم ڕێبازە:

بە ڕای هەڵگرانی ئەم ڕێبازە کاری دەوڵەت کورتکراوەتەوە لە پاسەوانیکردنی خاوەنداریتی تایبەت و ناشبێ دەست بخاتە نێو چالاکیە ئابووریەکان چونکە بە پێی ڕای ئەوان دەستتێوەردانی دەوڵەت لە کاروباری ئابووریەوە دەبێتە هۆی نانەوەی پشێوی و بێسەروبەری و ناهاوسەنگی لە ئابووریدا[٩].

جا بەکورتی ڕەوتی تاکەکەسی بانگەشەی ئەوەدەکات کە هەر تاکێك ئازادی تەواوی پێ بدرێت بۆ هێنانەدی زۆرترین قازانج، ئەم بیرۆکەیەش لە سەدەی هەژدە لەنێو ئابووریناسان بلاۆ بووەوە و یەکەم کەسیش کە بانگەشەی بۆ کرد "ئادەم سمیس" بوو لە بەریتانیاو هەروەها "فیزیۆکراتین" بوو لە فەرەنسا[١٠].

---

٨هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ٥٥

٩هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە-٦٦

١٠أسس الإقتصاد بين الإسلام والنضم المعاصر لاپەڕە ٣٠

**ڕەوتی تاکەکەسی لەسەر چەند بنەمایەکی ڕەوشتی و زانستی و ئابووری دامەزراوە:**

**بنەما ڕەوشتیەکان:**

زانایانی ئاکار پێیان وایە کە پێویستە تاك بە ئازادی بهێڵرێتەوە بۆ ئەوەی بتوانێ هەموو توانا سروشتیەکانی خۆی بەکاربێنێ، چونکە دەستتێوەردانی دەوڵەت دەبێتە هۆی سنوردارکردنی چالاکیە تاکەکەسیەکان و بەهرەکانی لەنێو دەبات.

**بنەمای ئابووری:**

زانا ئابووریناسەکان پێیان وایە کە تیۆری تاکەکەسی وا لە مرۆڤ دەکات کە زۆرترین قازانج وەدەست بێنێت لە ئەنجامی بەکارهێنانی سەروەت و سامانەکەی لە پڕۆژەی وەبەرهێناندا، ئەوەش وادەکات کە ڕێژەی وەبەرهێنان لە وڵاتدا زیادبکات.

**بنەمای زانستی:**

ئەم بنەمایە پشت بە مەبدەئی (مانەوە بۆ باشترینە) دەبەستێت کە دەگونجێ ببێتە ڕێسایەك بۆ تێکڕای ژیانی کۆمەڵگا، تیۆری تاکەکەسی بە ڕێژەیەکی بەرچاو دەوەستێتە سەر ئەم مەبدەئە[11].

## بنەماکانی ئابووری ئازادی هاوچەرخ:

**١- مافی تاك لە خاوەندارێتی تاکەکەسیدا:**

ئەم چەمکە تەنها لەو کەلوپەلە تاکەکەسیانە کورتهەڵنەهاتووە کە تاکێك بەکاری دەهێنێ، بەڵکو هەموو ئەو کەل و پەلانە دەگرێتەوە کە بابەتی بەکارهاتووی ڕۆژانەن.

**٢- مافی ئازادی و کۆششکردن:**

ئەمەش ئەوەیە کە تاك خاوەنی ئازادی تەواوی خۆیەتی لەبەکارهێنانی هەرشتێك کە لە دەستی دایە لە بەرهەمهێنانی شتومەکەکانی و هەرکاتێك بیەوێ دەتوانێ بیانفرۆشێ بە هەر نرخێك بێ (کەم یان زۆر).

---

[11] الإتجاه الجماعی فی تشریع الإقتصادی — لاپەڕە ٢٨-

**٣- سودی تایبەتی پاڵنەری کارکردنە:**

ئەوشتەی کە پاڵ بە پرۆسەی بەرهەمهێنانەوە دەنێت لەم سیستەمەدا بریتیە لە ئارەزوی تاکەکان بۆ دەستکەوتنی قازانجی تایبەتی هەندێکجاریش دەوترێ کە ناگونجێ پاڵنەرێکی لەوە باشتر هەبێت.

**٤- کێبڕکێ لە نێوان تاکەکان.**

**٥- دەستتێوەرنەدانی دەوڵەت لە چالاکی ئابوری[١٢]:**

## بنەماکانی سەرمایەداری:

بریتیە لە گەڕان بە دوای قازانج بە هەموو جۆر و شێواز و ئامرازە جیاجیاکانیەوە مەگەر ئەوەی کە دەوڵەت قەدەغەی دەکات بۆ لادانی زیانێکی گشتی وەك: مادە هۆشبەرەکان.

هەروەها بریتیە لە بە پیرۆز دانانی موڵکی تاکەکەسی، ئەمەش بە والاکردنی دەرگا لەبەردەم هەر تاکێکدا تاوەکو مرۆڤ بتوانێ توانستەکانی خۆی بخاتەگەڕ بۆ زیادکردنی سامانەکەی و پارێزگاری لێکردنی، هەروەها یاسای گونجاو دابڕێژرێ لە پێناوی گەشەپێدانی ئەو سەروەت و سامانەدا، ئەمە جگە لە دەستتێوەرنەدانی دەوڵەت لە ژیانی ئابوری مەگەر بەو ئەندازەیەی کە بەرژەوەندی گشتی دەیخوازێ یان بۆ ڕاگرتنی ئاساییش.

**کێبڕکێ و هەڵپەکردن لە بازاڕەکاندا:**

بریتیە لە سیستەمێك کە ئازادی دەداتە نرخەکان، وایان لێدەکات کە بە پێی خستنەڕو و داواکاری دیاریبکرێن، هەروەها بریتیە لە پشتبەستن بە ڕێسای نرخی داشکێنراو لە پێناوی ڕەواجپێدانی کالاکان و فرۆشتنیان[١٣].

---

١٢أسس الإقتصاد لاپەڕە – ٣٦ و لاپەڕەکانی دواتر

١٣الموسوعة الميسرة فی الأديا لاپەڕە ٢٣٣

## شێوازه‌كانی سه‌رمایه‌داری:

**سه‌رمایه‌داری بازرگانی:** كـه لـه سـه‌ده‌ی شـازده‌دا سـه‌ریهه‌ڵدا لـه ئـه‌نجامی نه‌هێـشتنی ده‌ره‌به‌گایه‌تی، كاتێك كه بازرگان هه‌ڵده‌ستا بـه گواسـتنه‌وه‌ی به‌روبومـه‌كان لـه شـوێنێك بـۆ شوێنێكی تر به پێی داواكاری بازاڕ، ئا بـه‌م جـۆره‌ش سـه‌رمایه‌داری بـووه ناوه‌نـدێك لـه‌نێوان به‌رهه‌مهێنه‌ر و به‌كارهێنه‌ر.

**سه‌رمایه‌داری پیشه‌سازی:**

پێشكه‌وتنی پیشه‌سازی و په‌یدابوونی ئامێری هه‌ڵمی كه له لایـه‌ن جـه‌یمس وات لـه سـاڵی ١٧٧٠ ز داهێنـرا هـه‌روه‌ها ئـامێری چـنینی ئۆتۆمـاتیكی كـه لـه سـاڵی ١٧٨٥ داهێنـرا ڕێخۆشكه‌ربوون بۆ په‌یدابوونی ئه‌م جـۆره سـه‌رمایه‌داریه، كـه دواتـر بـوه هـۆی هه‌ڵگیرسـانی شۆڕشی پیشه‌سازی ئینگلته‌ڕا و دواتریش له سه‌ده‌ی نۆزده‌دا لـه ئـه‌وروپا سـه‌ری هه‌ڵـدا، ئـه‌م جۆره سه‌رمایه‌دارییه له‌سه‌ر بنه‌مای جیاكردنه‌وه‌ی سه‌رمایه‌دار و كرێكار، واتـه مـرۆ و ئـامێر ده‌وه‌ستێ.

**سیستمی كارتل:** به‌و واتایه دێت كه كۆمپانیا گه‌وره‌كان ڕێكده‌كـه‌ون له‌سـه‌ر دابه‌شـكردنی بازاڕی جیهانی و ئه‌وه‌شی كه تێیدا هه‌یه له نێو خۆیاندا وه‌كو ڕه‌خـساندنی هـه‌لی فۆرخكـاری (إحتكار) له نێو بازاڕه‌كاندا و هه‌روه‌ها یاریكردن به خه‌ڵكی بازاڕ بـه‌و پـه‌ڕی ئازادیـه‌وه. ئـه‌م ڕه‌وته‌ی سه‌رمایه‌داری له ئه‌ڵمانیا و یاباندا بلاَوبۆته‌وه.

**سیستمی تسرست:** به‌و واتایه دێت كه كۆمپانیایه‌ك له كۆمپانیا كێبڕكێكاره‌كان گه‌وره‌ترین توانای وه‌به‌رهێنان په‌یدابكات و ده‌سته‌ڵات به‌سه‌ر بازاردا بگرێت[١٤] .

---

[١٤] هه‌مان سه‌رچاوه‌ی پێشوو، لاپه‌ڕه ٢٣٣

## کێشه ئابوریەکان له ڕوانگەی سەرمایەداریەوە:

سەرمایەداری پێی وایه که سەرەکیترین کێشەی ئابووری بریتیه له کەمی ڕێژەی سامانه سروشتیەکان، چونکه سروشت سنوورداره و ناشتوانرێ زیادبکرێ له چاو ئەو ڕێژەیەی که له زەویدا هەیەتی، ئەو زەویەی که مرۆڤ لەسەری دەژیێ، وەهەروەها ناشتوانرێ ڕێژەی سامانه سروشتیه پەنگخواردووەکان زیادبکرێن، ئەمه لەکاتێکدا که پێویستیه ڕۆژانەییەکانی مرۆڤ لەگەڵ پێشکەوتنی مەدەنیەت و فراوانبوونی بەبێ سنور زیاد دەکا، ئەو شتەش وای له سروشت کردووه که نەتوانێ پێداویستی هەموو تاکەکانی سەر ڕووی زەوی بێنێتەدی، که دەبێته هۆی ئەوەی تاکەکان هەمیشه له هەڵپەدابن بۆ تێرکردنی داخوازیەکانیان، ئالێرەوه کێشه ئابووریەکان سەرهەڵدەدەن[١٥] .

### پێویستی له ڕوانگەی سەرمایەداریەوە:

له کۆمەڵگای سەرمایەداری دا "پێویستی" ئامرازێکی پۆزەتیڤ نییه بۆ دابەشکردن، بەڵکو ڕۆڵێکی دژیەك دەگێڕێ به پێچەوانەی ئەو ڕۆڵه پۆزەتیڤەی که له کۆمەڵگای ئیسلامی دا هەیەتی، هەرچەند پێویستی تاکەکان توندو خەست بێتەوه ئەوا چانسی دەستکەوتنیان کەمدەبێتەوه لەوەی که دابەش دەکرێت، تا وایلێدێت چانسی دەستکەوتن ئەوەنده کەمدەبێتەوه که له کۆتاییەکەیدا خەڵکێکی یەکجار زۆر ناچار دەبن ماڵ و سەروەت و سامانەکەیان بکێشنەوەو، لەمەشەوه "پێویستی" له سیستەمی سەرمایەداری دا واتا دەستکێشانەوه له مەیدانی کارکردندا له ئەنجامی کاریگەری سەرمایەداره گەوەرەکان، واته تاك دەست له بواری دابەشکردن دەکێشێتەوه نەك له کەرەستەکانی دابەشکردن[١٦] .

---

[١٥] أقتصادنا، محمد باقر الصدر، لاپەڕه ٣٠٦ دارالفكر

[١٦] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕه ٣١٧

**تێڕوانینی سەرمایەداری بەرامبەر ئایین و ڕەوشت:**

سەرمایەداری دان بە ئایین نانێت و لە هەمانکاتیشدا ڕەتیی ناکاتەوە، سەرمایەداری خۆی بە بەربەرەکانێکردن و شوێنکەوتنی ئایین یاخود ڕەتکردنەوەی بنەماکانی سەرقاڵ ناکات، وەك ئەوەی کەوا مەبدەئی مارکسیەت ئەنجامی دەدا. لەبەرامبەریشدا دان بە ئایین نانێ و هەوڵی خزمەتکردنی و بلاوکردنەوەی نادات و بانگەشەشی بۆ ناکات، بەڵکو کار لەسەر ئەوە دەکات کە بڕیارە ئایینیەکان لە کاروبارەکانی ژیان جیابکرێنەوەو، لەسەر ئەم بنەمایەش فەلسەفەیەکی مادیگەری دەکاتە بەرنامەی خۆی کە ژیان تەنها بە سوود و قازانج بۆ مرۆڤەکان دێنێتە بەرچاو، هەروەها سەرمایەداری لەسەر ئەو بنەمایە هزریە بەرێوە دەچێ کە پێی وایە: هەموو مرۆڤێك پێویستە چوار ئازادی بۆخۆی دەستەبەر بکات کە بریتین لە ئازادی بیروباوەڕو ئازادی ڕادەربڕین و ئازادی تاکەکەسی و ئازادی خاوەندارێتی[17].

(یەستەرسەرو) لەبارەی تێڕوانینی سەرمایەداری لەبارەی ئایین و ڕەوشت دەڵێ ( ئاکار و ڕەوشتەکان و وردەکاریەکانیان لە سەرمایەداریدا بە (تەنی ڕەش) وەسف دەکرێن و سەرمایەداریش لەپێناوی خزمەتکردنی ئەمانە هاتۆتە دی، بەلاّم هیچ تیۆرێکی سەرمایەداری نیە وردەکاری لەم شێوەیە لەخۆبگرێت، وە هەروەها هیچ تیۆرێکی سەرمایەداریش ڕێنمونی ئەوەمان ناکات کە چۆن بتوانین بەهایەك بگۆڕین یان بەسەریدا زاڵبین) هەروەها بەردەوام دەبێ و دەڵێ: پشتگوێخستنی لایەنە کۆمەلاّیەتیەکانی مرۆڤ وەك ئەوە وایە کە جیهانێك دروست بکەین هیچ ڕەگەزێکی مرۆڤی لەسەر نەبێت.

---

١٧الإسلام والمشكلات العصر، د.مصطفى الرافعي لاپەڕە ١١، خانەی الكتاب اللبناني، چاپی یەکەم.

هەروەها دەشڵێ: بۆمان دەردەکەوێ کە لە بەرزنرخاندنی تاکدا سیاقی کۆمەلایەتی تەواو بزرە و بوونی نیە، ڕێکخستنی کۆمەلایەتی گرنگی خۆی هەیە لە ئاراستەکردنی سروشتی ئاڵۆزی عەقلانیەت و ئەو بەرژەوەندیە تایبەتیانەی کە تاکێك هەیەتی و پارێزگاری لێدەکات، لێرەوە بەبێ ئەوەی کەس ئاگای لێبێ بەرزنرخاندنی کەسێك بەسەر کەسێکی تر و بەرزنرخاندنی کەسێك بەسەر ئەوانیتردا دەبێتە ئامانجی سەرەکی و لاوەکی گەشەکردنی منداڵ و فێربوونی ئاین و ڕاگەیاندنی خزمەتگوزاریە گشتیەکان.. ئەم کاروبارانەش هیچیان لەلایەن سەرمایەداریەوە دانیان پێدا نەنراوە[١٨].

## خاڵە لاوازەکانی سەرمایەداری:

سەرمایەداری سیستمێکی دەستکردە کە دەچێتە پاڵ هەرکام لە سیستمەکانی وەکو شیوعیەت و ئەوانیتر کە مرۆڤ دایتاشیون دوور لە بەرنامەی خوای گەورە کە بۆ مرۆڤایەتی ناردۆتە خوارەوە.

١- **خۆپەرستی:** کە تاکێك یان چەند تاکێکی کەم دەست بەسەر بازاڕدا دەگرن و تێدەکۆشن لە پێناوی هێنانەدی بەرژەوەندیە تایبەتیەکان بەبێ گوێدانە پێویستیەکانی کۆمەڵگا.

٢- **قۆرخکاری:** ئەمەش بریتیە لەوەی کەسێکی سەرمایەدار هەڵدەستێ بە قۆرخکردنی کەل و پەل و خەزنکردنی تا ئەوکاتەی کە لە بازاڕ کەم دەبێتەوە یان نامێنێت، جا ئەوکات دەیانهێنێتەگۆڕێ و نمایشیان دەکات بۆ فرۆشتن بە نرخێك کە چەندین قات زیاترە لە نرخی ئاسایی و لەم ڕێگایەشەوە یاری بە کڕیارە داماوەکان دەکات.

---

[١٨] مستقبل الرأسمالية، لیستر ثرو- وەرگێڕانی عبدالقادر حلمی، لاپەڕەی ٦١٥

**٣- سەرمایەداری زیادەڕۆییەکی زۆری کردووە لە گەورەکردنی خاوەنداریّتی تاکەکەسی هەروەکو چۆن شیوعیەتیش کاتی خۆی زیادەڕەوی کرد لە ڕەتکردنەوەی ئەو خاوەنداریەتە.**

٤- **هەڵپەهەڵپ و کێبڕکێ:** یەکێك لە بنەماکانی سەرمایەداری ئەوەیە کە ژیان دەکاتە مەیدانی پێشبڕکێی نرخ و کاڵاکان، بە ئەندازەیەك کە هەموان لە پێشبڕکێدان لە پێناوی وەچنگکەوتنی زۆرترین، ژیان بۆتە دارستانێك کەتێیدا بەهێز لاواز دەخوات.

٥- **یاریکردن بە دەستی کار:** ئەمە ئەو مانایە دەگەیەنێ کە سەرمایەداری دەستی کارکەرەکان دەکاتە کاڵایەك و لە ژێر چەپۆکی خستنەڕو و داواکاریدا دەیتوێنێتەوە بەم هۆیەش کرێکار هەمیشە لەبەردەم هەڕەشەی دەرکردندایە، نەوەکو کەسێکی تر جێی بگرێتەوە بە کرێیەکی کەمتر.

٦- **بێکاری:** بریتیە لە دیاردەیەك کە لە کۆمەڵگای سەرمایەداری دروست دەبێت، ئەم دیاردەیە لەو کاتانەدا زیاتر دەبێت کە بەرهەم زیاتر دەبێت لە بەکاربەر، بۆیە خاوەنکار ناچاردەبێ کرێکارە زیادەکان بنێرێتەوە ماڵەوە.

٧- **ئیستیعمار:** سەرمایەداری بە مەبەستی پەیداکردنی کەرەستەی خاو و بازاڕ بۆ ساغکردنەوەی کاڵاکانیان دەچێتە خانەی ئیستیعمار و داگیرکاری، لە سەرەتادا داگیرکردنی ئابووری و دواتریش هزری و ڕامیاری و ڕۆشنبیری، ئەمە سەرەڕای لاوازکردنی ئەو گەلانەو بەکارهێنانی دەستی کاریان لە پێناو بەرژەوەندی خۆی.

**٨- سەرمایەدارەکان لە ڕووی ڕامیاری و فەرمانڕەواییەوە پشت بە سیستەمی دیموکراسی دەبەستن.**

**٩- سیستمی سەرمایەداری دەوەستێتە سەر سوو.**

سەرمایەداری وەکو بونەوەرێکی مادی سەیری مرۆڤ دەکات، بەبێ ئەوەی هیچ حیسابێك بۆ ویستە ڕۆحی و ڕەوشتیەکانی بکات.

# مارکسیەت

لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەوە مارکسیەت بالأدەستی خۆی بەسەر هزری ڕامیاری و ئابووری سەپاند، و گۆڕانکاری زۆر گەورەی لەسەر ئاستی دەوڵەت و کۆمەڵگای نێودەوڵەتی بەرپاکرد کە شایەنی لێکۆڵینەوەو توێژینەوەن.

مارکسیەت زۆرێك لە توێژینەوەی جۆراوجۆری بەچەندین زمانی جیاجاوە بەخۆوە بینیوە، هەروەها ڕوبەڕوی ڕەخنەو هەڵسەنگاندن بۆتەوەو تەنانەت خودی مارکسیەکانیش هەڵساون بە توێژینەوە لەم دیاردە جیهانیە، هەر لە سەرهەڵدانی و گەشەسەندنیەوە و تەنانەت هەندێ جار مارکسیەتیان دابەشکردووە بۆ چەندین قوتابخانەو ڕەوتی هزری جیاواز، هەربۆیەش زۆر شتێکی ئاسایی بوو کاتێ مارکسیەت بوو بە هەڵوێستێکی نەگۆڕ بەرامبەر بە لێکۆڵینەوە ڕامیاری و ئابووری و کۆمەلأیەتیەکان، ئەمە بە چاوپۆشین لە شیکردنەوەی ئایدۆلۆژی بۆ خودی مارکسیەت و ئەو شتانەی دەیانگرێتە خۆی لە تیۆر و بیردۆزەکان[١]. کارڵ مارکس (١٨١٨-١٨٨٣) بە دامەزرێنەری یەکەمی مارکسیەت دادەنرێت.

**ڕاڤەی مادی بۆ مێژوو:**

مادیەکان دەڵێن: ڕاڤەی مادی بۆ مێژوو بەشێکی سەرەکی فەلسەفەی مارکسیەتە و لێی جیا نابێتەوە و، لە لێکۆڵینەوەکانیاندا ڕێکخستنە کۆمەلأیەتی و ئابووریەکانی مێژووی مرۆڤایەتی دەگرێتە خۆی، هەروەها هەندێك قۆناغی مێژوو لە هەندێکی تر جیادەکاتەوە، ئەمەش لەژێر ڕۆشنایی بارودۆخی ئەو کۆمەڵگا ئابووریە یان یەکێکی تر، هەروەها مارکسیەت لە ڕوانگەیەکی مادیەوە لە مێژوو دەکۆڵێتەوە بەیاوەری مەرجەکانی ژیانی کۆمەڵگای مادی کە بریتیە لەو سروشتەی یان ئەو ناوندە جوگرافیەی کە ڕێژەی دانیشتوانی زیاد دەکات و کارتێکەرە سەرەکیەکەشی بریتیە لە شێوازی بەرهەمهێنان.

---

١تطور الفكر السياسي/ د.عدنان سيد حسين، لاپەڕە ٤٢

ئەو مەرجانەی کە بۆ ژیانی کۆمەڵگای مادی دانراون، لە کۆتاییدا هەیکەلی کۆمەڵگا بە هزر و بیرو بۆچون و بارودۆخی ڕامیاری و یاسایی و ئایینی و ئاکاری و ... هتد دیاریدەکات.

**ناوەندی جوگرافی:** یەکێکە لەمەرجە پێویستە هەمیشەییەکانی ژیانی کۆمەڵگای مادی، بەلاّم ئەو ناوەندە جوگرافیە نابێتە ئەو هێزە ڕامیاریەی کە لە کۆتاییەکەیدا هەیکەلی کۆمەڵگا و سیستمی بەڕێوەچونی خەڵك دیاریدەکا، بەڵکو ئەرکەکەی ئەوەیە کە ڕەوتی گەشەسەندنی کۆمەڵگا بەرەو ئاقاری خێرایی یان لەسەرخۆیی دەبات، ئەمەش لەبەر ئەوەی کە گەشەسەندنی کۆمەڵگاو گۆڕانکاری کردن تێیدا زۆر لە پێشکەوتنی ناوەندی جوگرافی و گۆڕانکاریەکەی خێراتر بەڕێوە دەچێت.

**گەشەسەندنی ڕێژەی دانیشتوان و چڕیەکەی:** ئەمەش نابێتە ئەو هێزە بنەڕەتیەی کە هەیکەلی کۆمەڵگا دادەڕێژێ و خشتەکانی بناغەی دادەنێت، هەرچەندە کە بوونی دانیشتوان شتێکە کە هەر دەبێ لە ئارادا هەبێت، چونکە لە کۆمەڵگادا لانی کەم بەبێ هەبوونی چەند تاکێك ژیانی مادی وەدی نایەت.

**هێزی ڕامیاری لە گەشەسەندنی کۆمەڵگا بریتیە لە شێوازی بەرهەمهێنان:** شێوازەکانی بەرهەمهێنانیش ( وەکو مادیگەراییە مێژوویەکان پێناسەی دەکەن) " بریتیە لە یەکەی هێزی بەرهەمهێنان و پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان، واتە یەکەی لاوەکی بەرهەمهێنان کە ئاماژەیە بۆ دوو جۆر لە پەیوەندی: پەیوەندی مرۆڤ بە سروشتەوە، و پەیوەندی مرۆڤ بە مرۆڤەوە"[٢] .

شێوازەکانی بەرهەمهێنانە کە سروشتی سیستمی کۆمەڵایەتی دیاریدەکات. هەیکەلی کۆمەڵگا و هێزی بەرهەمهێنان ئاماژەیە بۆ پەیوەندی مرۆڤ بە سروشتەوەو مەودای زاڵبوونی مرۆڤ بەسەر سروشتەوە، لە نێوان خەڵك و کەرەستەکانی بەرهەمهێناندا یەکەیەکی بەهێز هەیە چونکە ناگونجی خەڵکی لە کەرەستەکانی بەرهەمهێنان دووربخرێنەوە، هەر دەبێ شێوازێك هەبێ بۆ بەرهەمهێنانی ئەو کەلوپەلانەی کە مرۆڤ پێویستی پێیان دەبێت وەکو خواردن و جل

---

٢ المادیة اتأریخیة، ف.کیلی م. کوخالزون، وەرگێڕانی أحمد داود، پێداچونەوەی بدرالدین السباعی، لاپەڕەی ٤٩

و به‌رگ و نشینگه‌و سوته‌مه‌نی و كه‌ل و په‌له‌كانی به‌رهـه‌مهێنان. ئـه‌م كه‌لوپه‌لانـه پێویـستیه سه‌ره‌تاییه‌كانی ژیانن و هه‌ر ده‌بێ له ئارادابن، سا بۆ گه‌یـشتن پێیـان و ده‌سـتكه‌وتنیان ده‌بـێ به‌رهه‌مبهێنرێن، هه‌روه‌ها بۆ به‌هه‌مهێنانیشیان ده‌بێ كه‌ره‌سـته و ئامرازه‌كـانی به‌رهـه‌مهێنان له‌ئارادابن و به‌و جۆره‌ش ده‌بێ به‌كاربهێنرێن كه گونجاوه. ئه‌م هه‌موو ڕه‌گه‌زه جۆراوجـۆره یـه‌ك ئاراسته‌ی به‌رهه‌مهێنان وه‌رده‌گرن كه ئاماژه‌یه بۆ چۆنیه‌تی هه‌ڵس و كه‌وتی خه‌ڵكی به‌رامبـه‌ر بـه ئامرازه‌كـانی سروشـت و پێكهێنـه‌ره‌كانی كـه بـۆ به‌رهـه‌مهێنانی پێویـستیه مادیـه‌كان به‌كارده‌هێنرێن.

سـه‌باره‌ت بـه لایـه‌نی دووه‌مـی شـێوازه‌كانی به‌رهـه‌مهێنان بریتیـه لـه په‌یوه‌ندیـه‌كانی به‌رهه‌مهێنان له بواری مرۆیی دا واته له نێوان خودی خه‌ڵكدا، به‌و واتایه‌ی كه‌خه‌ڵكی كۆشـش ده‌كه‌ن له‌گه‌ڵ ئه‌و سروشته‌ی كه وه‌بـه‌رهێنانی پـێ سـاز ده‌كـه‌ن تـاكو ئاتاجـه مادیـه‌كانی لێ به‌رهه‌مبهێنن، لێره‌شه‌وه خه‌ڵكی تاك تاكه ناژین و له یه‌كتر دانابڕێن، به‌ڵكو بۆ ئه‌م مه‌به‌سـته ناچارن به كۆمه‌ڵ بژین و به‌م جۆره‌ش به‌رهـه‌مهێنان ده‌بێتـه پڕۆسـه‌یه‌كی ده‌سـته‌جه‌معی نـه‌ك تاكه‌كه‌سی.

بناغه‌ش لـه په‌یوه‌ندیـه‌كانی به‌هـه‌مهێنان بریتیـه لـه خاوه‌نـدارێتی كردنـی كه‌رسـته‌كانی به‌هـه‌مهێنان، خاوه‌نـدارێتیكردنی كه‌ره‌سـته‌كانی به‌رهـه‌مهێنانیش جـۆری خاوه‌نداریه‌كـه دیاریده‌كات، جا چ تایبه‌تی بێت یان گشتی بێت. ئه‌گه‌ر بێت و ئه‌م كه‌ره‌ستانه له ژێر ده‌سـتی چه‌ند تاكێكی كه‌مدا خڕ ببنه‌وه ئه‌وا خاوه‌نداریه‌كه تاكه‌كه‌سی ده‌بێت، له‌سه‌ر ئـه‌م بنه‌مایـه‌ش فه‌لسه‌فه‌ی مادی ته‌نها بڕوا به مادده دێنێ، چونكه به‌پێی ئه‌وان جیهان تێكڕا بریتیه له مادده و هیچ شتێكی تری تێدا نیه جگه له مادده و جیهانی غه‌یبیش له ئارادانیه چـونكه هـه‌مووی وه‌هم و خورافیاته، ئا لێره‌شدا هیچ بوارێك بۆ ویستی خوای گـه‌وره لـه‌نێو ژیـانی مرۆڤه‌كانـدا نامێنێته‌وه.

جا كه‌واته مادده بنچینه‌كه‌یه‌و هزریش به‌روبومه‌كه‌یه‌تی، بوونه‌كه‌شـی له‌مێـژه بڕاوه‌تـه‌وه‌و ئینكاری لێ ناكرێ، جگه له‌مه‌ش بنـه‌ما ئابووریـه‌كان بنـچینه‌ی هـه‌موو شـتێكن، بـچینه‌ی

هەموو گۆڕانکاریەکن و هەروەها بنچینەی هەموو بیرو ڕا و ئاکار و نەریت و هزرێکن. ئەو بنچینەیەش هەمیشه له پێشکەوتنداية و دۆخێکی جێگیری نیه، به پێی لێکۆڵینەوەی ماددیەکان بۆ کۆمەڵگا بۆ یەکەم جار له مێژوودا ڕاڤەی مادی بۆ مێژوو بریتیه له گۆڕانکاری زانستی ڕاست و دروست. به گوتەی خۆیان لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگای مرۆڤایەتیان به شێوەیەکی زانستی کردووه، هەر ئەمەشه وایکردووه که له لێکۆڵینەوه کۆمەلآیەتیەکانی تر جیابکرێنەوه.

ماددیگەراییه مێژوییەکان دەڵێن " تێکڕای ئەوەی که ماددیگەرایی مێژوویی له دۆزه بنەڕەتیەکەی فەلسەفه و کۆمەڵگا پێشکەشی دەکات تەنها یەکانگیر نیه و بەس، بەڵکو بریتیشه له چارەسەری زانستی ڕاستەقینه که بۆ یەکەمجار له مێژوودا بوونی هەبووه".

ماددیگەرایی مێژویی فەلسەفەیەکی تایبەته که پەیوەندی نێوان هۆشیاری کۆمەلآیەتی و بوونی کۆمەلآیەتی دەردەخات، هۆشیاری کۆمەلآتی بریتیه لەو هزره کۆمەلآیەتیه نوێیانه و دەزگاکانی، ئەو هۆشیاریەش شوێنپێهەڵگری بوونی کۆمەلآیەتیه به جۆرێك که بوونی کۆمەلآیەتی کاریگەری بەسەریەوه هەیه و دەیگۆڕێت. بوونی کۆمەلآیەتی بریتیه له ژیانی کۆمەڵگای ماددی و ئەو پەیوەندیەی که له نێوان خەڵکی و سروشدا هەیه جگه لەو پەیوەندیەی که خەڵکی لەنێو خۆیاندا هەیانه، ماددیگەرایی مێژویی ئەو پەیوەندیه بەهێزه شی دەکاتەوه که له نێوان هۆشیاری کۆمەلآیەتی و کارتێکەره جوڵێنەرەکانی بەرهەمهێناندا هەیە. کارتێکەره جوڵێنەرەکانی بەرهەمهێنان بریتین له تاکەکان و ئەزمونەکانیان لەبارەی بەرهەمهێنانەوه و هەروەها کەرستەکانی کار و کاریگەریشیان لەسەر پێشکەوتنی کۆمەڵگا و گوێزانەوەی له بارێکەوه بۆ بارێکی تر. کەواته ماددیگەرایی مێژویی بەشێکی سەرەکی فەلسەفەی مارکسیەته و لێی جیانابێتەوه، مارکسیەکان یاسا ماددیەکانی دیالێکتیکیان بەسەر ڕوداوەکانی مێژووەوه سەپاندووه.

# پەیوەندی ماددیگەرایی مێژویی بە ماددیگەرایی جەدەلی:

## ماددیگەرایی جەدەلی:

**جەدەل لە زماندا:** جەدەل لە زماندا لە (شدة الفتل)ەوە هاتووە واتە (پێچانەوەیەکی تونـد) بۆ نمونە دەڵێ (جدلت الحبل) واتە (گوریسەکەم بەستەوە) یان دەڵێ (أجدله جدلا) کە بە مانـای بەستنەوەیەکی توند وتۆڵ و قایم دێت[٣].

جا کەواتە جەدەل واتە زاڵبوون بەسەر نەیار و تێکشکاندنی، هەروەکو دەگوترێ لە ئەنجامی گفتوگۆ دوژمنەکەی تێکشکاند و دەمی بەستەوە یاخود دەگـوترێ (ئـەم پیـاوە پیـاوێکی زۆر جیدالیە) واتە کەسی بەرامبەر دەبەستێتەوە، یان دەگوترێ (جادلـت الرجـل) واتـە دەمـەقاڵێم لەگەڵ پیاوەکەدا کرد و بەزاندم.

لە قورئانی پیرۆزیشدا وشەی جەدەل لە چەندین شوێندا هـاتووە، بـۆ نمونـە خـوای گـەورە دەفەرموێ (وَ جَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحسَن) النحل ١٢٥، واتە: گفتوگۆو موجادەلـە بـە جـوانترین شێوە بکە لەگەڵیاندا. بەجۆرێکی تر: ئەگەر پێویست بوو گفتوگۆو قسەیان لەگەڵ بکـەی ئـەوا بە ڕووەکی خۆشەوە بەپیریانەوە بڕۆو بە نەرمیەوە گفتوگۆی بەجێ بکە, وەهەروەها دەفـەرموێ (ولا جِدالَ فِي الحَج) البقره، ١٩٧.

جەدەلیەت واتە گفتوگۆکردنی دوو لایەن لـە پێنـاو گەیـشتن بـە ڕاسـتی، ئەمـەش لـەڕێی دەرخستنی ئەو بەڵگە دژ بەیەکانەی کە هەرکام لەم دوو لایەنە بەرزی دەکەنەوە، ئەم مانایەش زۆر نزیکە لەگەڵ مانا زمانەوانیەکەی، یەکەم کەسیش کە دانی بەوەنا کە لە هـەموو شـتێکی گەردووندا دووشتی دژبەیەك هەن، فەیلەسوف "هیگل" بوو. کاریۆهەنت دەڵێ :

" کەواتە جەدەلیەت بریتیە لە بیرۆکەیەك و دژەکـەی، پاشـان تێکئـاڵانی هـەردوو دژەکـە لەگەڵ یەکتری، لێرەدا بیرۆکە پشتگیری لە بابەتەکە دەکات، بەڵام دژەکەی ئینکاری لێدەکات،

---

[٣] لسان العرب بەرگی ١١ لاپەڕە ١٠٣

یان (بە پێی هیگل) ڕەتی دەکاتەوە. بەلاّم بەیەکەوە ئالاّنی هەردو دژەکە ڕاستیەکە دەردەخات، بەواتایەکی تر بیرۆکەو دژەکەی ڕاستی دەردەخەن، ئالێرەشدا هەنگاوێك لە ڕاستی نزیك دەبینەوە، بەلاّم هەرکاتێك هەردوو دژەکە بخەینە ژێر میکرۆسکۆبێکی ووردبینەوە، ئەوا بۆمان روون دەبێتەوە کە ڕاستی هێشتا ماویەتی، لێرەشەوە پرۆسەکە دووبارە دەستپێدەکاتەوەو بیرۆکەیەکی نوێ سەر هەلّدەدات، کە هەلّدەستێ بە لەدژوەستان و ڕەتکردنەوەی ڕاستیەکە، لەمەوە جۆرە یەکانگیریەکی نوێ لە نێوان هەردوو دژەکەدا دروست دەبێت.

بەم ڕێبازە سێگۆشەییە هزر ئاراستەی خۆی وەردەگرێ تا لە کۆتاییەکەیدا دەگاتە ڕەها، لەوێشەوە هزرمان بەرەو ئاراستەیەکی بێکۆتا دەڕوات بەبێ ئەوەی دوچاری هیچ دژیەکییێك ببێت، ئا ئەمەیە چەمکی جەدەلیەت کە خۆی لە پرۆسەی ململانێ و ئاشتەواییدا دەنوێنێت کە بریتیە لەو چەمکەی کە خودی واقیع پێکدەهێنێ و هەروەها لە هزری مرۆڤیشدا بەم شێوەیە کاری خۆی دەکات"[٤] .

بەلاّم مارکس جەدەلیەتەکەی لە ماددەوە دەست پێکرد و ڕەخنەشی لە هیگل گرت کە دەیوت "واقیع لە ئەنجامی بزوتنەوەی هزرەوە دروست دەبێت و سەرچاوەی یەکەم و کۆتایی هەر شتێکیش بزوتنەوەی هزرە" وە هەروەها کە دەیوت "عەقلّی سەراپا واتە بوونی ڕەها لەدوای مادەوەیە کە دیارە مەبەستی پێ خوایە، لێرەوە مارکس ڕایگەیاند کە پرۆگرامە جەدەلیەکەی هەر لەسفرەوە تا کۆتایی لەگەلّ پرۆگرامە جەدەلیەکەی هیگل دا پێچەوانەیە.

مارکس دەلّێ : "پرۆگرامە جەدەلیەکەی من هەر تەنها لە بنەڕەتدا پێچەوانەی پرۆگرامە جەدەلیەکەی هیگلّ نیە، بەلّکو هەر تەواو لە دژی دەوەستێ، کاتێ هیگلّ پێی وایە ئەو بزوتنەوە هزریەی کە لەژێر ناوی بیرۆکەدا پەیدا دەبێت داهێنەری واقیعە، بە شێوەیەك واقیع تەنها بریتیە لە وێنە ڕوالّەتیەکەی بیرۆکە، بەلاّم من پێم وایە بە پێچەوانەوەیە، بزوتنەوەی هزر تەنها بریتی نیە لە ڕەنگدانەوەی هزری واقیع بەلّکو خۆی خزاندۆتە نێو مێشکی مرۆڤەوە".

---

٤الشيوعية نظريا و عمليا ماريوهانت، لاپەڕە ٢٨

## دیالێكتیك چیه؟

ستالین ده‌ڵێ:

"وشه‌ی دیلێكتیك له وشه‌ی (دیالیفۆ)ی یۆنانیه‌وه وه‌رگیراوه كه به مانای ئاخاوتن و گفتوگۆ دێت" . له چه‌رخه دێرینه‌كاندا دیالێكتیك به مانای هونه‌ری گه‌یشتن به ڕاستی هاتووه هه‌م له ڕێی ده‌رخستنی ئه‌و شتانه‌ی كه دژی یه‌كترینه‌و به‌ڵگه‌ی دژبه‌یه‌كتر ده‌گرنه‌خۆ و هه‌م له ڕێی زاڵبوون به‌سه‌ریدا.

هه‌ندێك له فه‌یله‌سوفه پێشینه‌كان پێیان وابووه كه دژوه‌ستانی دوو هزر و ڕێكنه‌كه‌وتنی ڕاكان باشترین هۆكارن بۆ ده‌رخستنی ڕاستی، ئا به‌مه ده‌وترێ شێوازی دیالێكتیكی بۆ بیركردنه‌وه، كه دواتریش ئه‌م شێوازه له لێكدانه‌وه‌ی دیارده سروشتیه‌كان به‌كارهێندرا و پێشی وترا ڕێگای دیالێكتیكی بۆ ناسینی سروشت.

" به پێی ئه‌م تیۆره ڕوداوه سروشتیه‌كان به‌رده‌وام له‌جوڵه‌دان و هه‌میشه ده‌گۆڕێن، سروشت له ئه‌نجامی گه‌شه‌سه‌ندنی دژیه‌كه‌كانی گه‌شه ده‌كات، دژیه‌كه‌كانی سروشتیش له ئه‌نجامی دژیه‌ك وه‌ستانی كارتێكه‌ره‌كانیه‌وه ده‌بێت"[٥].

ئه‌م فه‌لسه‌فه جه‌ده‌لیه له مادده‌وه ده‌ست پێده‌كات، ئه‌مه‌ش له ئه‌نجامی ئه‌و لێكۆڵینه‌وه‌ی كه پشت به ڕێبازی ئه‌زمونگه‌رایی ده‌به‌ستێت، كه به پێی ئه‌وان ئه‌وه تاكه فه‌لسه‌فه‌ی زانستیه كه له ئارادا هه‌بێت، چونكه ئه‌م فه‌لسه‌فه‌یه توانای ڕاڤه‌كردنی هه‌موو دیارده‌كانی بوونی هه‌یه به ڕاڤه‌یه‌كی حه‌تمی. پاش ئه‌وه‌ی به پوختی چه‌مكی مادیه‌تی جه‌ده‌لیمان به پێی ڕای مادده‌یه‌كان شیكرده‌وه، ئه‌وه‌مان بۆ ده‌رده‌كه‌وێ كه په‌یوه‌ندیه‌ك له نێوان مادده‌یه‌تی مێژوویی و مادده‌یه‌تی جه‌ده‌لی هه‌یه، مادده‌یه‌كان ده‌ڵێن، مادده‌گه‌رایی مێژویی به‌شێكه له فه‌لسه‌فه‌ی ماركسیه‌ت و هه‌رگیز لێی جیا نابێته‌وه، ئه‌و فه‌لسه‌فه‌یه‌ی كه گشتگیر و سه‌راپاگیره و به تێڕوانینێكی ماددی جه‌ده‌لی سه‌یری گه‌ردوون و مرۆڤ و ژیان ده‌كات، ئه‌مه‌ش له‌ڕێی كێشانی

---

٥المادية الدياليكتيكية والمادية التأريخية، لاپه‌ڕه ٤-١٥

وێنەی هەردیاردەیەکی سروشتی بە ئەندێشەیەکی ماددی کە خۆی لە بیردۆزی ماددی بوونی جیهاندا دەدۆزێتەوەو پێی وایە کە جیهان بە سروشتی خۆی ماددیەو بە پێی ڕێساکانی مادده گەشە دەکات، پێشی وایە کە گەردوون و ژیان و مرۆڤ تەنها ماددەن و بەس، هەروەها بە پێشکەوتنێکی خۆکاری گەشەدەکەن، بەم پێیەش هەموو ڕوداوە جیهانیە جۆراوجۆرەکان بریتین لە دیاردە جۆراوجۆرەکانی بزوتنەوەی ماددە.

لەم ڕوانگە ماددیەوە ژیانی مرۆڤ و مێژوەکەی ڕەنگدانەوەی ماددیگەرایی مێژووییە، ماددیگەرایی مێژویی ئەم بیرۆکە ماددیانە بەسەر ڕوداوەکانی ژیانی کۆمەڵگا و ڕەوتی مێژوی مرۆڤایەتی دەسەپێنن.

لینین دەڵێ:

"ئەم فەلسەفە مارکسیە کە لە شێوەی پارچە پۆلایەك دارێژراوە ناگونجێ هیچ بەشێکی تری سەرەکی و جەوهەری لێ جیابکرێتەوە بەبێ دەرچوون لەڕاستی بابەتیانە و بەبێ گەڕانەوە بۆ باوەشی چەواشەکاری بۆرژوازی دواکەوتو"[٦].

بەواتایەکی تر ئەم فەلسەفە گشتگیرە یەکەو هیچ بەشێکی جەوهەری لێ دانابڕێندرێ و ناشگونجێ ماددیگەرایی مێژوویی لەگەڵ مادیگەرایی جەدەلی لێکجیابکرێنەوە.

دانەرانی پەرتوکی المادیە التأریخیە دەڵێن " بێگومان دەسکاریکردنی ماددیگەرایی دیالێکتیکی شێواندنی ماددیگەرایی مێژویی لێدەکەوێتەوە، ماددیگەرایی مێژویی لەگەڵ هیچ فەلسەفەیەکی تر ناگونجێ تەنها لەگەڵ ماددیگەرایی دیالێکتیکی نەبێ. داننان بەماددیگەرایی مێژویی بە نکوڵی کردن لە ماددیگەرایی دیالیکتیکی تەنها هەڵەیەکی ئاشکراو سەفسەتەیەکی قێزەونە"[٧].

---

٦المادیة التأریخیة، لاپەڕە ١٣. لة المؤلفات الكاملة وة وةرطیراوة، لاپەڕە ١٤ و لاپەڕە ١٣٢

٧لینین في الآیدولوجیة والثقافي الاشتراكیة/ وەرگێڕانی ئیلیاس شاهین، لاپەڕە ٣-٦

کەواتە ماددیگەرایی مێژویی لەگەڵ هیچ فەلسەفەیەکی تر ناگونجێ، جگە لە ماددیگەرایی دیالێکتیکی، هەرشتێکیش بەسەر یەکێکیاندا جێبەجێبکرێ ئەوا بەسەر ئەویتریشیاندا جێبەجێدەکرێ ئەمەش لەبەر یەکبوونی بنەڕەتە ماددیەکەیان، هەرچەندە کە ماددیگەرایی دیالێکتیکی لە هزر و فەلسەفەکەیدا دانی ناوە بە میتافیزیك لە ئەنجامی شکستی لێکدانەوەی ماددی بۆ مێژوو چونکە ئەم لێکدانەوەیە لەسەر بنچینەیەکی ماددی بنیاتنراوە، لەبەر ئەمە بەپێی ئەوان دانان بە ماددیگەرایی مێژویی بەبێ ئەو ڕێسایەی کە لەسەری بنیاتنراوە (کە بریتیە لە فەلسەفەی ماددیگەرایی) چەواشەکاریە بۆ تیۆری ماددیگەرایی مێژووی کۆمەڵگا، چونکە بۆ هەموو سیستمێك ڕێسایەك هەیە کە ئاڕاستەکەی دیاریدەکات.

هەروەها دانەرانی پەرتوکی المادیه التأریخیه دەڵێن :

" ماددیگەرایی دیالێکتیکی و ماددیگەرایی مێژویی وەکو یەك زانست و یەك فەلسەفەی یەکترتەواوکەر دەردەکەون، نە ماددیگەرایی مێژوویی بەبێ ماددیگەرایی دیالێکتیکی ماقوڵە و نە ماددیگەرایی دیالێکتیکی بەبێ ماددیگەرایی مێژوویی بوونی هەیە، کەواتە ئەمە چۆن لێکبدەینەوە؟

**یەکەم:** بەوە لێکدەدرێتەوە کە ناگونجێ تیۆرێکی ماددیگەرایی دیالێکتیکی بەسەر هەموو جیهاندا بسەپێنرێت ئەگەر هاتوو ڕاڤەیەکی ماددی بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی نەکرێت و ئەوە دەرنەخرێت کە کۆمەڵگاش بریتیە لە شکڵێك لە جوڵەی ماددە و لە گەشەسەندنیدا ملکەچە بۆ یاسا بابەتیەکان وەکو یاساکانی سروشت، هەروەها ماددیگەرایی دیالێکتیکی بەبێ ماددیگەرایی مێژویی بوونی نیە.

**دووەم:** وەڵامی زانستی ڕاست و دروست نیە لەبارەی بابەتە بنچینەییەکانی فەلسەفەی "سەرەکیبوونی ماددەو لاوەکی بوونی هۆشیاری" بەبێ ڕونکردنەوەی هۆکارێك و ڕونکردنەوەی چۆنیەتی سەرهەڵدانی هۆشیاری مرۆیی، وەهەروەها ئەو وەڵامە لە ڕۆڵی ئەو جێبەجێکردنە

زانستیە کۆمەڵایەتیە مێژوییەش نیە کە لە ژیانی خەڵکیدا دەیگێڕێت، بەو پێیەی کە ماددیگەرایی مێژویی وەپێش وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە کەوتۆتەوە"[٨].

لەم دەقەدا دانەرەکان ئەوەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە کە ماددیگەرایی جەدەلی و ماددیگەرایی مێژوویی هەرگیز لێك جیا ناکرێنەوە چونکە هەریەکەیان ئەویتر تەواو دەکات، ئەمەش لەبەر ئەوەی کە ماددیگەرایی جەدەلی تیۆرێکی گشتگیرە بۆ ماددیبوونی جیهان، بەو پێیەش کە ژیانی کۆمەڵگای مرۆیی بەشێکە لە جیهان، لەبەر ئەوە دەبێ ڕاڤەیەکی ماددی بۆ مرۆڤیش بکرێ تاوەکو تیۆرەکەیان هەموو شتێك بگرێتەوە هەروەکو بانگاشەی بۆ دەکەن، خۆ ئەگەر مێژوی مرۆڤایەتیش ڕاڤەیەکی ماددی بۆ نەکراابایە ئەوا تیۆرەکەیان لە ڕاڤەکردنی ماددی بۆ مێژوو — ی زانستی هەروەك دەڵێن- کەم و کورت دەردەچێت لەپاڵ کەم و کورتبوونەکەشی ناگشتگیر دەبێت و لە کۆتاییشدا ناتەندروست دەبێت.

بەو پێیەی کە ئەوان جەخت لەسەر بنەچەبوونی ماددە دەکەنەوە بەوەی کە ماددە سەرچاوەی هەموو شتێکە و ماددە وەپێش ئاگایی و هزر کەوتۆتەوە، و بەو پێیەی کە هزر و ئاگاییش لە کۆمەڵگای مرۆیی سەر هەڵدەدەن و کۆمەڵگاش بەڕای ئەوان شکڵێکە لە جوڵەی ماددە و لە گەشەسەندنیدا ملکەچی ڕێسا بابەتیەکانی ماددەیە وەکو ڕێساکانی سروشت، کەواتە دەبێ ئەوە بزانین کە ئەو ئاگاییە لە کوێوە هاتووە و ئەو ڕۆڵەشی چیە کە لە پڕاکتیزە زانستیە کۆمەڵایەتیەکەیدا دەیگێڕێ، بەو پێیەش کە لای ئەوان مادە بنچینەی هەموو شتێکە، کەواتە دەبێ بە ڕاڤەیەکی ماددی تەفسیری ئاگایی بکرێ[٩].

لێرەدا وتەکانیان ئەوە دەردەخەن کە پەیوەندیەکی بەهێز هەیە لەنێوان ماددیگەرایی مێژویی و ماددیگەرایی جەدەلی و بەو پێیەش کە هەردوکیان تەواوکەری یەکترین، ئەگەر بێتو هەر بەشێك یان لایەنێك لە یەکێك لەم دوو تیۆرە شکست بهێنێ ئەوا ئەوزانستی بوونە ڕاست و دروستە سەراپاگیرەیان کە بانگەشەی بۆ دەکەن لە سەرەوە تا خوارەوەن

---

٨المدرسة التأريخية، لاثترة ١٢

٩تطور الفكر السياسی، د.عدنان سعد لاپەڕە ٤٨-٥٠

هەڵدەوەشێتەوە، چونکە ناگونجێ ئەم دوو تیۆرە ڕاست و دروست بن ئەگەر بەیەکەوە هەڵنەکەن، هەریەکێکیان ڕاست و دروست نابێت تاکو ئەویتریان ڕاست و دروست نەبێت.

لەمەوە مارکسیەکان گەردوونیان بۆ دوو بوار دابەشکرد، بوارێکی ماددی و بوارێکی هزری کە سۆز و بیرۆکەکان و یادەوەریەکان دەگرنەخۆ.

پرۆگرامی ماددیگەرایش دان بەوەدادەنێ کە چەند شتێکی ماددی سەربەخۆ بوونیان هەیە جیا لەو عەقڵەی کە دەرکیان پێ دەکات و دەیانناسێ، ئەو پرۆگرامە دواتر بەرەو فەلسەفەیەکی ماددیگەرایی ئاراستەی خۆی وەردەگرێ کە چوارچێوەیەکی گشتی بۆ هەستکردن بە مادده دیاریدەکات[10].

ماددیگەرایی جەدەلی گرنگی بە هەموو شکڵ و شێوەکانی جوڵە دەدات، واتە گرنگی دەدا بە گۆڕانی شوێن و گۆڕانی تەنەکان لە حاڵەتی ڕێژەییەوە بۆ حاڵەتی جۆرایەتی و چۆنیەتیبوون.

ماددیگەرایی جەدەلی گرنگی بە جوڵە دەدات بە هەموو شکڵ و شێوەکانیەوە، واتە گرنگی دەدات بە گۆڕانی شوێن، وەهەروەها گۆڕانی شتەکان لە باری ڕێژەییەوە بۆ باری جۆرایەتی و چۆنیەتیی بوون، پشت بە ڕێسای ململانێی دژەکان دەبەستێ کە گرنگترین یاسای جەدەلی "دیالێکتیک"ە، بەو مانایەی کە هەموو دیاردەیەك لەخودی خۆیدا دژەکەشی لەخۆگرتووە کە دەبێتە هۆی لەدایکبونی تەفرەیەکی ماددی نوێ، هەموو دیاردەکان لایەنی نەیاریان تێدا هەن کە بەیەکەوە پەیوەستن و یەکبونێك پێکدەهێنن کە هەرگیز لێك جیا نابنەوە.

ماددیگەرایی جەدەلی هەموو جوڵەو ئاڵوگۆڕێکی لەسەر بنەمای ململانێی دژەکان تەفسیرکردووە، موجەب و سالیب لێك جیانابنەوە هەتاکو پێچەوانەو دژی یەکتری بن، بەهەمان شێوە لە کۆمەڵگاشدا یەکێتی دژەکان هەیەو ململانێکەشیان بەردەوامە لەشێوەی ململانێی چینەکان دا، وە هەروەها ململانێی دژەکان کە ڕێخۆشکەرن بۆ گەشەسەندن دەبنەهۆی جولاندنی هزر. ئەنگلس پێی وایە ئەم چەمکە ماددیگەراییە کە دەبێتەهۆی تێگەیشتن لە

---

[10] الينين فى الأهمية البروليتارية، لاپەڕە ١-١٤

گەردوون لەسەر بنەمایەکی بابەتی، خاوەنی چوارچێوەیەکی فەلسەفی یە و بەرەو ئاراستەی قوربانیدان و نکوڵیکردن لە خود دەچێ، یان بەجۆرێکی تر بڵێین ئەم هەستە لەدەرەوەی شعورو ئاگایی مرۆڤەو جیایە لێی. بەڕای مارکسیەکان جەدەل بریتیە لە گفتوگۆیەکی لۆژیکی و ڕەخنەگرتن لە دژیەکە میتافیزیکیەکان، وەهەروەها بریتیە لە پێشکەشکردنی ڕێگەچارەیەك بۆ ئەم دژیەکانە، لەسەر ئەم بنەمایەش مارکسیەکان دەگەنە ئەو ڕایەی کە سیستمی کۆمەڵایەتی لەنێو خودی خۆیدا هۆکاری ڕوخاندنی خۆی هەڵگرتووە.

**وە بۆ ماددیگەرایی جەدەلی سێ بنەمایان دیاریکردووە:**

١-گواستنەوە لە گۆڕانکارە ڕێژەییە هێواشەکانەوە بۆ چۆنایەتیە سەختەکان، وەکو جەختکردنەوەیەك لەسەر ڕێسای فەلسەفەی "هەموو کەڵەکەبوونێکی ڕێژەیی گۆڕانێکی جۆری دروست دەکات".

٢- یەکبونی دژەکان و ململانێی نێوانیان، هەروەکو لەنێو گەردیلەدا تێبینی دەکرێ، یان لە پەیوەندی نێوان سالب و موجەب.

٣- نەفی کردنی نەفی، واتە گواستنەوەی دەرکپێکردن و زانیاری بۆ قۆناغێکی بەرزترو بالاتر.

**زنجیرەیەك لە گەشەسەندنە ماددی و دواتر هزریەکان:**

لینین پێی وایە کە شێوەی ماددیگەرایی جەدەلی کە بەراورد دەکرێ لەگەڵ ژیاندا بەهەموو لایەنەکانیەوە، بابەتی هەرە سەرەکی هزری مارکسی بووە. هەر لەسەر ئەم بنەڕەتەش لێکدانەوەی ماددیگەرایی بۆ مێژوو سەریهەڵدا کە بە ماددیگەرایی مێژویی ناسراوەو ڕوبەڕووی چەمکە میسالییەکانی فەلسەفەی مێژوو دەبێتەوە. ئەو ماددیگەراییە مێژوییەی کە پەیوەندی ئەندامیی نێوان گەشەسەندنی کارتێکەرە بەرهەمهێنەکان ڕاڤەدەکات، وە هەروەها سەرجەم پەیوەندیەکانی نێوان خەڵکی تێشیاندا پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان ڕاڤەدەکات. ئەو پێی وایە کە جۆرێك لە پەیوەندی هەیە لەنێوان ماددیگەرایی جەدەلی و ماددیگەرایی مێژوویی لە چوارچێوەی فەلسەفەی مارکسی دا. جا لە شیکردنەوەی تیۆری مارکسی —لینینی

که باسمان کرد ئـەوه دەردەکـەوێ کـه پێـشکەوتنی ڕامیـاری هـزری کۆمـەڵگا لەچوارچـێوەی بەرژەوەندیه ماددیەکانەوه خۆی دەدۆزێتەوه که له چـاخێکەوه بـۆ چـاخێکی تـر جیـاوازه، وه چینەکانی کۆمـەڵگا دەبنه کارتێکەره جوڵێنەرەکانی گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا.

## بوونی مادده وەپێش بوونی هزر کەوتۆتەوه:

ئێمه پێمانوایه کـه هـزرو بیرکردنـەوه بەخشـشێکی هەرەگـەورەی خوایـه کـه بـه مرۆڤـی بەخشیوەو بەهۆیەوه له تێکڕای گیانداران جیای کردۆتەوه، وه بـەهای ڕاسـتەقینەی مـرۆڤ لـه بیرکردنەوەی دا دەردەکەوێ، هەروەها لەوەدا دەردەکـەوێ کـه مـرۆڤ توانـای داهێنـانی هەیـه لەچوارچێوەی ئەو سنوورەی که خوای پایەبەرز بۆی کێشاوه.

ئا لێرەدا بیرکردنەوه کاریگەریەکی زۆر گـەورەی لـه هەڵکـەوتنی زانـاو هزریـارو پیـاوانی گەورەو پێشەوایان دا هەبووه، ئەو کەڵەپیاوانەی که ڕۆڵێکی مەزنیان له مێژووی مرۆڤایەتیـدا گێڕاوه، بەڵام ماددیگەراییەکان مادده وەپێش هزر دەخەن و پێیـان وایـه کـه هـزر بەرهـەمی ماددەیەو مادده کاریگەری بەسەریەوه هەیه.

لینین پێناسەی مادده دەکات و دەڵێ: " مادده بریتیه له گوفتەیەکی فەلسەفی که واقیعـی بابەتییانەی مرۆڤ دیاری دەکات، لـەو هەسـت و سـۆزەی کـه دایدەڕێـژێ، لـه تێڕوانینـشی دا ڕەنگدەداتەوەو، وێنەی هزر دەکێشێ و له هەستەکانی جیای دەکاتەوه".[11]

بەپێی ئەم پێناسەیەش مـادده چـەمکێکه بـۆ تێکـڕای شـتەکان و، وەپـێش بـوونی زانـین کەوتۆتەوەو کاریگەریشی بەسەریەوه هەیه.

کەواته بیرکردنەوه ڕەنگدانەوەی ماددەیه لـەنێو مێـشکدا، وه بـیر لەوشـته دەکاتـەوه کـه ڕەنگدانەوەیەتی، بەر له ڕەنگدانەوەی ماددەش لەنێو مێشکدا بیرکردنەوه نەبووه، بۆیه سـتالین ئاماژه بەمه دەکات و دەڵێ:

---

[11] الدفاتر الفلسفية , بەرگی ١ لاپەڕه ٣٢، لینین.

ماددیگەرایی فەلسەفی لەسەر مەبدەئێکی تر دادەمەزرێ، ئەویش ئەوەیە کە ماددەو سروشت و بونەوەر بریتین لە ڕاستیەکی بابەتیانە و دەکەونە دەرەوەی زانین و هەستکردن و سەربەخۆن لێی، وە مادده توخمی یەکەمە چونکە کانگای هەست و تێڕوانین و زانینە ئەمە لەکاتێکدا کە زانین توخمی دووەمەو داڕێژراوە، چونکە زانین ڕەنگدانەوەی ماددەو بونەوەرە، وە بیرکردنەوە بەرهەمی ماددەیەو کاتێك پەیدادەبێ کە مادده دەگاتە پلەیەکی بەرز لە کامڵ بوون، یان بە تەعبیرێکی وردتر، بیرکردنەوە بەرهەمی مێشکەو مێشکیش ئەندامی بیرکردنەوەیە، لەبەرئەوە ناکرێ "بیرکردنەوە" لە "مادده" جیابکرێنەوەو ئەگەر وابکرێ ئەوا دەکەوینە هەڵەیەکی گەورەوە.[١٢]

کەواتە بەپێی ئەوان مادده کانگای هەست و سۆزو تێڕوانین و زانینە، وە بەبێ مادده زانین و دەرکپێکردن بونیان نییە کە زانین خۆی لەخۆیدا ڕەنگدانەوەی ماددەیە. وە بیرکردنەوەش بەرهەمی ماددەی پێشکەوتوە لەبەرئەوە ناکرێ ماددەو بیرکردنەوە(هزر) لێکتر جیابکرێنەوە، جاکاتێك مادده هەیە بیرکردنەوەش هەیە، وە کاتێك مادده نامێنێ بیرکردنەوەش نامێنێ، بۆیە دوبارە ناتوانین مادده و بیرکردنەوە لەیەکتر جیابکەینەوە چونکە بە لێکجیاکردنەوەیان دوچاری هەڵە دەبین.

ئا ئەمەیە مەبدەئی مارکسیەکان کە بەهۆیەوە بەهاو گرنگی بیرکردنەوە دیاریدەکەن!. ئەنگلزیش دەڵێ: ناکرێ بیرکردنەوە لە مادده دابڕین چونکە مادده جەوهەری ئەو گۆڕانکاریانەیە کە ڕوودەدەن.

## مادده ئەزەلی یەو هەمیشە دەمێنێتەوە:

ماددیگەراییەکان لەڕوانگەی تێڕوانینی خۆیانەوە دەڵێن:

هەروەها گەردوون کۆتایی و سنوری نییە، جیهان هەمیشە دەمێنێتەوە، هیچ سەرەتایەکی نەبووەو هەرگیز کۆتایی نابینێ. ئالێرەوە هەر جیهانێکی (غەیبی) نامادی بونی نییە، وە هەرگیز نابێت و مەحاڵە. وە لەواقیعیشدا ئەگەر هیچ شتێك جگە لە مادده لەئارادا نەبێ ئەوا

---

١٢ المادية الديالكتيكية والمادية التأريخية، لاپەرە ٢٩

جگە لە تاكە جیهانێكی ماددی هیچ شتێكی تر بونی نییە. ئەمەش مانای وایـە كـە هـەموو ئەو شتانەی كە لەدەوروبەرماندا هەن و تێكڕای دیاردە جۆراوجۆرەكانی ئەم جیهانەی كە ئێمەی گرتۆتەخۆ خاوەنی خاسیەتێكن و یەكیان دەخات ئەویش بریتییە لە ماددەبوونیان.[13]

كەوابێ بەڕای ئەوان هیچ شتێك لـەئارادا نییـە جگـە لـە جیهـانی مـاددە، وە ناشـگونجێ جیهانێكی ڕۆحی هەبێ، یان ڕۆژێكی تر هەبێ وەكو لەئایینەكاندا هـاتووە، هـەروەها هـەموو ئەو دیاردە جۆراوجۆرانەی كە لە گەردوون دا هەن لەیەك شتدا یەكدەگرنەوە ئەویش بریتیـە لـە ماددەبونیان، واتە هەموو گەردوون مادەیەو هیچی تـر، وەمـرۆڤیش بـەڕای ئـەوان بەرهـەمی ماددەیە.

بـەپێی قـسەی ئـەوان مـاددە خـاوەنی خاسـیەتی ئەزەلییـەت و نـەمری یـە، هەربۆیـەش نەسەرەتای هەیەو نە كۆتایی هەیە، لەكاتێكدا كـە ئەمانـە سـیفەتەكانی خـوای پـەروەردگارن (سبحانە وتعالی). كەواتە بەپێی قسەی ئەوان ماددە وەدیهێنەرەو خاوەنی خاسیەتی وەدیهێنان (خلق)ە، وە هیچ جیهانێكی غەیبی لەئارادا نییە چونكە جیهان لەچوارچێوەی ئـەوەدا قـەتیس ماوە كە هەستەكان دەركی پێدەكەن. هەروەها ئەوان بانگەشە بـۆ ئـەوە دەكـەن كـە زانـست پاڵپشتیان لێ دەكات لەوەی كە دەیڵێن و زانستی ڕاستەقینەش مۆركێ مـاددەی بەسـەرەوەیە، وە زانست بەسروشت و ناوەڕۆكی خۆی ماددیگەرایی یەو میـسالییەتیش نامۆیـە پێـی و دژی دەوەستێ.[14]

لێـرەوە ئـەم دەقـە ئـەوە دەردەخـات كـە میـسالییەت دژی زانـستە و بـەو پێیـەش بـێ ئایینەكانیش دژی زانستن چونكە میسالین، وە زانست تەنها مۆركی ماددیگەریی بەسـەرەوەیەو بە گوتەی خۆیان زانست لەمەدا پاڵپشتیان لێ دەكات و خزمەت بە مەبەستەكانیان دەكات لـە

---

١٣ اسس المادیه الدیالكتیكیه والمادیه التأریخیه ، لاپەڕە ٣٩ ١٣

١٤ المادیة التأریخیة لاپەڕە ١٤٥٠٠

گەڕانیان بەدوای ڕاستی ژیان لەم بوونە ماددییە دا. هەروەها زانست لە گەشەسەندنی دا خودا - کە خوای پەروەردگارە و پاك و دوورە لەوەی کە دەیلێین- لە سروشت دەخاتە دەرەوە و بونی نییە چونکە لە چوارچێوەی ماددە چۆتە دەرەوەو، هەروەها لەبەرئەوەش کە ئەوان دان بەهیچ شتێك لەدەرەوەی ماددە نانێن چونکە ئەوان وای بۆ دەچن کە هیچ شتێك لەدەرەوەی سنووری مادە بونی نییە، ماددەش هەموو شتێك دەگرێتەخۆی و خاوەنی خاسیەتەکانی وەدیهێنان و توانست و داهێنانە، وە ماددەیە ئەو بنەچەی کە لێیەوە هزرو زانست و تەنانەت هەموشتێك پەیدادەبێ وەکو بانگەشەی بۆ دەکەن.[١٥]

مارکسیەکان لەسەر بنەمای ڕەتکردنەوەی بونی خواش هەموو کارو ئامانجێکیان ڕەتکردەوە کە مەبەست لێی وەدەستهاتنی ڕەزامەندی خوای پەروەردگارە، هەوەها کاریگەرییەکانی ئەم مەبەستەشیان ڕەتکردەوەو جگەلەمەش ڕۆڵی ئیسلام و دەوڵەتی ئیسامیشیان لە واقیعی ژیانی مرۆڤایەتی ڕەتکردەوە کە تەنها بۆ بەرزکردنەوەی وشەی الله (سبحانە وتعالى) لەسەر زەوی دا دامەزرا.

مارکس دەڵێ: "شکۆمەندی خوایی و مەبەستی خوایی ئەو وشە گەورەیە کە ئەمڕۆ بەکاردەهێنرێ بۆ ڕاڤەکردنی بزوتنەوەی مێژوو، لەڕاستیشدا ئەو وشەیە هیچ شتێکی پێ ڕاڤەناکرێ".[١٦]

وە هەر تەنها بەوە وازیان نەهێنا کە ئینکاریانکرد لە بونی خوا (سبحانە وتعالى) و فەرمانەکەی کە بریتیە لە بەرزکردنەوەی وشەی الله لەسەر ڕوی زەوی و بلاَوکردنەوەی ئەو دادگەرییەی کە سەربازانی ڕێی ئیسلام ئالاَکەیان هەڵگرتبو، هەروەها بەوەش وازیان نەهێنا کە هەموو ئەو چاخانەیان ڕەتکردەوە کە تێیدا مرۆڤایەتی لە ڕێنمونی و باوەڕ دا دەژیا بەڵکو

---

١٥ موقف الأسلام من نظرية ماركس، د. أحمد العوايشة، لاثةرِة ١٢٥-١٥٠ ١٥

١٦ بؤس الفلسفة ، لاپەڕە ١٢٣-١٢٤ ١٦

بانگەشەی ئەوەیانکرد کە خودا داهێنراوی مرۆڤەو کێشە ئەوە نیە کە ئایا خودا هەیە یـان نـا بەڵکو کێشەکە لەبیرۆکەی بوونی خوداوە سەری هەڵداوە[١٧].

---

١٧ د. علی تنطاوی لە کتێبی (تعریف عام بدین الإسلام) لە بەشی (باوەڕبوون بە خوا) لاپەڕە ٦٥ تـا ٧٧ لە بارەی بوونی خواو ڕەتدانەوەی بانگەشەی مولحیدەکان دەڵێ:

بڕوابوون بە بوونی خوا ئەوەندە بەڵگە نەویستە، پێش ئەوەی عەقڵ لـە ڕێگـەی بەڵگـە عەقڵیەکانـەوە قەبوڵی بکات، خودی دەرون خۆی هەستی پێدەکات، هەرچەندە ئەمە پرسێکە کە پێویستی بە بەڵگـە نیـە، لەگەڵ ئەوەشدا بەڵگەی لەم بارەیەوە ئێجگار زۆرە، زانای دیمەشقی شێخ (جـەمالودینی قـاسمی) لـە کتێبـی (دلائل التوحید) باسی بەڵگەگەلێکی بێشومار دەکات لە کاتێکدا کە ئەم کتێبە چەندین ساڵ بەر لە ئێـستا نوسراوە لە سەردەمانێکدا کە زانست بەم شێوەیە پێش نەکەوتبوو، چونکە لەم پەنجا ساڵەی دواییـدا زانـست چەندین بەڵگەی نوێی سەلماند لە ڕێگەی زانستی نوێوە, ئەگەر سـەیری پـەرتوکێکی وەك (الله یتجلی فـی عصر العلم) بکەین کە سی زانای ڕۆچوو بە زانستدا دایانناوە یاخود پەرتوکێکی وەك (العلم یـدعوا للإیمـان) ئەوا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە زانـای ڕاسـتەقینە نـابێ بێبـاوەڕ بـێ، هـەروەها خـەڵکی ئاسـاییش نـاکرێ بێباوەڕبن، و ئەگەر هەندێ لە زانایانیش بانگەشەی کوفر و ئیلحاد بکەن، ئەوا هۆکارەکەی بریتیە لەوەی کە زانستێکی کەم و کورتیان وەرگرتووە، بەمەش باوەڕداری خۆڕسکیان لەدەسـت داوەو ئەوەنـدەش بـە زانـستا قوڵنەبوونەتەوە تا بگەنە ئەو پلەیەی زانست کە داوای باوەڕبوون بە خوا دەکات. هەر یەك لەو کتێبانەی کـە باسکران چەپکێك وتار دەگرنەخۆ کە بەرهەمی ئەو هزر و بیرکردنەوانەیـە کـە ئـەو زانـا پایەبەرزانـە پێـی گەیشتوون، نمونەی ئەو زانایانە (فرانك ئاڵن) بوو یەکێ لە گەورەترین زانایانی بایۆلۆژی کە سەلماندی هەموو شتێ تەمەنێکی دیاریکراوی هەیە و هەموو شتێ سەرەتایەکی هەیە، بەمەش ڕەتی ئەو ڕایەی کـردەوە کـە دەڵێ "جیهان کۆنە و هەر هەبووەو بـێ سـەرەتاو بـێ وەدیهێنـەرە " ئەمـە ئـەو ڕایـەبوو کـە فەیلەسـوفە پێشینەکانی یۆنان بڕوایان پێی هەبوو، هەروەها نمونەی زانای ترمان هەیە لەوانە (ڕۆبـەرت مـۆریس بـردج) دۆزەرەوەی ڕادار، هەروەها (جۆن کلیفلان کۆسران) زانای کیمیایی و (جۆن هەربەرت بلۆند) ئوستادی فیزیـا، ئەمانەو چەندین زانای تر. من بەڕاستی پێشنیاری خوێندنەوەی ئـەم دوو کتێبـەو نمونـەیان دەکـەم.... کـە بەڕاستی کتێبی لەم جۆرە ئێجگار زۆرن.

من نامەوێ لێرەدا بەڵگە کۆنەکانی زانایینی کـەلام بێنمـەوە هـەروەها ناشمـەوێ ئـەم بەڵگـە نوێیانـە دوبارەبکەمەوە کە ئەم زانایانە باسیانکردووە. یەك بەڵگە دێنمەوە، بەڵگەیەکی قورئانی. بەڵگـەی قورئـان!

کە بەتەواوەیی ماناکەی ئاشکرایەو، ڕاشکاوانەیەو، بنبڕکەرە، بە بەڵگەیەکی مەزنەوە دێ، لـە هەمانکاتـدا بە دەربڕینێکی کورت کە مرۆڤی ئاسایی لێی تێدەگات و مرۆڤی زاناش دەرونی پڕدەبێت لە سەرسوڕمانبوون پێی و سەرسامبوون بە هێز و وردی و ڕوونی و ئاشکراییەکەی. جا هەردوکیان زاناو کابرای ئاسایی هیچیان بۆ نامێنێتەوە تەنها ئەوە نەبێ کە بڵێن: ڕاستە!

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز بە یەك وشە ئاگادارماندەکاتـەوە و بەڵگەکـەش لـە خـودی خۆماندایـە، کەواتە چۆن دەکرێ نکوڵی لە شتێ بکەین کە لە نیوچاوانمان نوسراو"ئەمە ڕاستە"، خوای گەورە دەفـەرموێ (وَ فی أنفُسِکُم أفَلا تُبصِرون) ئێمەی مرۆڤ لە قوڵایی دڵمان هەست بە بوونی دەکەین و لە کـاتی ناخۆشـی و دڵتەنگی هانای بۆ دەبەین ئەمەش بە هۆی سروشتی خۆڕسکمان و غـەریزەی ئایینپەروەریمانەوەیـە. هـەموو ئەو بەڵگانە یان لە خودی خۆماندا یان لە جیهانی دەوروبەرماندا بەدیدەکرێن. عـەقڵی نـاواخن خۆڕسـکانە هەست بە بوونی خوا دەکات بڕوای پێ دێنێ و عەقڵی بە ئاگاش بە بەڵگەو بەڵگەکاریش بڕوای پێ دەکات.

چەند سەیرو سەمەرەیە، کەسێك کە نکوڵی لە بوونی خوا دەکات و خودی نکوڵیکـار بەڵگەیـە لەسـەر بوونی خوا!. ئەمە وەك ئەوەیە پارەکەت لەناو دەستی قەرزارەو، دەڵـێ لێـتم وەرنـەگرتووەو دەستیـشم لێـی نەداوە، هەروەها وەکو ئەو کەسەیە کە جلەکانی ئاوی لێ دەتکێ کەچی بانگەشەی ئەوە دەکات کە جلەکانی تەڕ نین، بەڵکو ئاویشیی لێ نزیك نەبۆتەوە. ئەوە ڕاستی ڕاستیەکانە. بۆچی خـەڵکانێکی زۆر هـەن کـە تـا ئێستا پەی بەمە نابەن؟!.

وەڵام: چونکە ئەوان بیر لە خودی خۆیان ناکەنەوە (نَسُوا اللهَ فَأنسَاهُم أنفُسَهُم) ئەو کەسانە لە دەرونـی خۆیان ڕادەکەن و لە تەنـیایی دەترسن و کەسێکیان تێدا نیە کە بتوانێ ساتێك بە تەنیا لەگەڵ دەرونی خۆیـدا بمێنێتەوە، بۆیە خۆی بە شتی پوچ یان ئەوەتا پەرتوکێکی بێ ئارزش یان هەرکارێکی تـر سـەرقاڵ دەکـات و کات و تەمەنی خۆی پێ بەفیڕۆ دەدات، وەك ئەوەی بڵێی کە دوژمنی دەرونی خۆی بێت و ڕقی لێی ببێتەوەو نەفرەتی لێ بکات.

سەیرکە زۆربەی خەڵکی دەخۆن و دەخۆنەوەو دەخەون و چێژ وەردەگرن و لە ئـازار دوردەکەنـەوە و داوای خۆشگوزەرانی دەکەن لە دونیا بۆ خۆیان و ماڵ و منداڵیان و ئەوانەی کە خۆشیان دەوێـن. کەسـی وا هەیـە بەیانیان سەرەتا خۆیان پاکدەکەنەوەو پاشان جلـەکانیان لەبـەر دەکـەن و نـان دەخـۆن و بـەرەو کارەکانیـان بەڕێدەکەون و کاردەکەن بۆ کۆکردنەوەی پارەو زیادکردنی قازانج، پاشان دەگەڕێنەوە ماڵ و پـشویەك دەدەن. ئینجا دەگەڕێنەوە سەر کارەکانیان یان پەنا دەبەنـە بـەر کـات بەسـەربردن و ڕابـواردن، بـە دوای شـتێ دا

دەگەڕێن تا کاتە بۆشەکانیان بۆ پڕیکاتەوەوە کاتەکانی تەمەنیان پێ بەفیڕۆ بدات تا ئەو کاتەی کە برسێتی زۆریان بۆ دێنێ، ئنجا دەست دەکەن بە خواردن، کاتێکیش هەست بە خەوالوبوون دەکەن، ئەوا دەچن دەخەون. پاشان پێشوازی لە ڕۆژی نوێ دەکەنەوە و هەمان ئەو بەرنامەیە دووبارە دەکەنەوە کە ڕۆژی پێشتر پێیدا ڕۆیشتبوون. ئەوانە کاتێ ڕابردوویان بیردەکەوێتەوە، هیچ ڕابردوویەك نیە تەنها ئەوە نەبێ کە لەم دنیایەدا ژیاون. کاتێکیش بیر لە داهاتوو دەکەنەوە، بە هەمان شێوە هیچ نیە تەنها ئەو ڕۆژانە نەبێ کە پێیان وایە لەم دنیایە دەژیین. بەلام موسولمان تەنها بەوە ناوەستی کە بخواو بخواتەوەو کاربکا و ڕابوێرێ، بەلکو خۆی دەپرسێ: لە کوێ هاتووم؟ ، بۆ کوێ دەڕۆم؟ سەرەتا لە کوێیە؟ ئەی چارەنوسم چیە؟، سەیر دەکا دەبینێ ژیانی بە لەدایك بوون دەستی پێ نەکردووە تا بە مردن کۆتایی بێ. دەبینێ پێش لە دایك بوونی کۆرپەلەیەك بووە لە ناو سکی دایکیدا، پێش ئەوەش تۆوێکی زیندوو بووە لەناو پشتی باوکی، پێش ئەوەش دلۆپە خوێنێك بووە لە ناو دەمارەکانی باوکیدا، ئەو خوێنەش لەو خواردنەوەیە پەیدابووە کە باوکەکە خواردوویەتی، ئەم خواردنەش ڕوەکێك بووە یان لەسەر زەوی ڕواوە یان بەرهەمی ئاژەڵێکە کە لەسەر ئەو ڕوەکە ژیاوە، قۆناغگەلێك کە پێش لە دایکبوونی پێیدا تێپەڕیوە و هیچیش لەبارەیانەوە نازانێ. زنجیرەیەکی درێژەو ئەلقەکانی کەم و ئاشکران، ئەوانەی تریش شاراوەن لەبەردەم چاوە تاریکەکانمان.

هیچ یەکێك لە ێمە خۆی ناناسێ پێش ئەوەی بگاتە چوار سالی، هیچمان لەدایك بوونی خۆی لەبیر نیە، کێمان لەدایکبوونی خۆی لەبیرە؟ کێ ئەو ساتانەی لە بیرە کە لە سکی دایکیدابووە؟ ئەگەر یەکێك هەبووبێ و هەستی بە بوونی نەکردبێت و بە بیری نەبێت، چۆن دەکرێ بگوترێ کە ئەو کەسە خۆی خۆی دروست کردووە، لە کافرە مولحیدەکان بپرسە ئایا تۆ خۆن بە ویست و عەقلی خۆت خۆتت دروست کردووە؟ ئایا خۆت بویت کە خۆتت خستە نێو سکی دایکتەوە ئایا تۆ بویت کە ئەو ژنەت هەلبژارد تا ببێتە دایکت ئایا تۆ بویت کە پالت بە کۆرپەلەکەوە نا تا هاتە دەرەوە؟ ئەی کەواتە هەر لە نەبوونەوە بەبێ دروستکەر پەیدابویت؟ ئەمە بەڕاستی ئەستەمە.

ئەی ئایا ئەو هەموو بونەوەرەی کە پێش مرۆڤ هەبووە لە چیاکان و دەریاکان و خۆر و هەسارەکان، ئایا مرۆڤ دروستی کردوون؟ کاتێ دیکارت ڕێبازی "گومان و تاقیکردنەوە" ی تاقیکردەوە (ئەو ڕێبازەی کە بەهۆیەوە بەناوبانگ بوو). دیکارت گومانی لە هەموو شتێك دەکرد تا کەیشتە خودی خۆی، بەلام نەیتوانی گومان لە خودی خۆی بکات، بۆ؟ چونکە ئەوەی گومانی لێدەکرێ خۆیەتی، بۆ گومانکردنیش پێویستە گومانکار هەبێت، هەر لەمەوەبوو کە وتە بەناوبانگەکەی وت "من بیر دەکەمەوە، کەواتە من هەم" ئێستا بوونی هەیەو هیچ گومان لە بوونی نیە، بەلام ئایا کێ هێنایەدی؟ ئایا ئەو بونەوەرە ماددیانە مرۆڤیان

هێنایەدی؟ کە بێگیانن و عەقڵیان نیە! لە کاتێکدا کە مرۆڤ خاوەنی عەقڵ و ژیریـە، ئایا دەکرێ بێعەقڵ عەقڵ ببەخشێت؟ ئایا گەر شتێکت نەبێ دەتوانی بیبەخشی؟.

هەڵوێستی ئیبراهیمی (د.خ) باوکی پێغەمبەرانیش هەر ئەمە بوو کاتی باوکی بینیی کە پەیکەرتاش بوو، بتەکانی دەتاشی و لە بەرد پەیکەری لێ هەڵدەکۆڵین، ئینجا خۆی و قەومەکەی دەیانکرد بە خوای خۆیان. بەردێك کە خۆیان دروستیان دەکرد و پاشان هەر خۆیان دەیانپەرست. خوایەك کە خۆم دروستی بکەم پاشان داوای ئەوەی لێبکەم کە هەموو شتێکم بۆ بکات، ئەمە بەڕاستی شتێکە عەقڵ قبوڵی ناکات، ئەی کەواتە خوای ڕاستەقینە کێیە؟

پاشان دەستی کرد بە لێکۆڵینەوەو بیرکردنەوە، کە شەوی بەسەرداهات ئەستێرە بریقەدارو بریسکەدارە بەرزەکان دەرکەوتن، ئەوانە وەك ئەو بەردانەی کە دەیانکردنە بت سەرچاوەکەیان زەوی نەبوو، هەروەها بەدەستی مرۆڤ دروستنەکرابوون، بۆیە واتێگەیشت ئەو خوایەی دۆزیوەتەوە کە بەدوایدا دەگەڕا. هەروەها کاتێ مانگ دەرکەوت ڕوناکی ئەستێرەکانی داپۆشی، هەروەها مانگ گەورەتر و ڕوناکترە، ئەو جارەیان بڕوای وابوو کە مانگ خوایە، بەلاّم کاتێ خۆر هەلاّت و ڕوناکی مانگی بزرکرد و لە جێگەی ئەو ڕوناکیەکەی خۆی بە زەویدا پەخشکرد، ئیبراهیم (د.خ) وتی بێگومان ئەوە خودای ڕاستەقینەیە. کەچی بینیی خۆر دەڕواو زەوی لە تاریکیدا جێدێڵێ! ئینجا وتی: نەخێر خۆر ئەو خوایە نیە کە منی دروستکردبێت، هەروەها ئەم بونەوەرەش هەونیە، منیش خوا نیم، من نەخۆمم دروستکردوە نە هیچ شتێکی تر، کەواتە هیچ نامێنیتەوە تەنها یەك گریمانە نەبێت، کە ئەویش ڕاستە و جگە لەو هەمووی بەتاڵ و هەڵەیە، ئەوەی کە لەدوای هەموو ئەو شتانە خوایەکی گەورەو بە تواناهەیەو هەر ئەویشە هەموو ئەو بونەوەرەی وەدیهێناوە.

ئەمە ئەو بەڵگەیەیە کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا پیشانی داوە. لە یەك ڕستەدا، ئەمە موعجیزەیەکە لە موعجیزەکانی بەیانی ڕەببانی کە لێدانێکی یەکلاکەرەوە بوو بۆ هەموو ئەو مولحیدانەی کە ملکەچی عەقڵن و ڕێز لە عەقڵ دەگرن. هەروەك چۆن خوای گەورە دەفەرموێ: (أم خَلَقوا مِن غَيرِ شيءٍ أم هُمُ الخالِقون)!؟ ئەو مولحیدانەی کە خۆیان بە فێرکار دادەنا دەیانوت،سروشت، سروشت مرۆڤی هێناوەتەدی، سروشت عەقڵی داوە بە مرۆڤ، کە ئێمە منداڵ بوین لە ڕۆژانی جەنگی جیهانی یەکەم هەندێ لە مامۆستاکان ئەم شتانەیان پێ دەگوتین و هەروەها هەندێ لە مامۆستایان بۆنی شارستانیەتی نوێیان کردبوو لە (ئەستەمبۆڵ) و هەروەها لە (پاریس) ، ئەوان وایاندەزانی بەمە دەبنە (ڕەوشنگەر)، وشەی ڕەوشنگەری

لەو کاتەدا وەکو وشەی پێشکەوتنخوازەکان بوو. لە هەموو سەردەمێکدا کۆمەڵێك چەمك بەکاردەهێنرێن تاوەکو پێمان پێبکەنن، هەروەکو چۆن کاتی خۆی بە هیندیە سورەکانی ئەمریکا پێدەکەنین بەوەی کە جلی ڕەنگاوڕەنگیان لەبەر دەکرد، تاوەکو ولاتەکەیان داگیر بکەن.

پاشان کە گەورە بوین، پرسیمان ئایا سروشت چیە؟ لە زمانی عەرەبیدا سروشت واتە (طبیعة) کە لەسەر وەزنی (فعیلة) یە و ئەمەش بە مانای (مفعولة) دێت، کەواتە دەبێتە (مطبوعة) کە ئیسمی مفعولة (ناوێکە لە حاڵەتی بەرکاردا و پێویستی بە بکەرێك هەیە) کەواتە لێرەدا کێ بکەرە؟ .

ئەوان وتیان سروشت بەڕێکەوت پەیدابووە ... بەپێی یاسای گریمانەکان.

وتمان نمونەتان چیە بۆ ئەم قسەیە؟

ئەمە وەك ئەو نمونە وایە کە دوو کەس لە بیابانـدا ون بوبـوون، دواتـر بـەلای کۆشـکێکدا تێپـەڕین، کۆشکێکی گەورەو ڕازاوەبوو، دیوارەکانی هەمووی نەقش و زەخرەفە بوو، پڕبیـوو لـە ڕایـەخی گرانبـەها و کاتژمێر و جوانکاری گرانبەها.

کەسی یەکەم: کەسێك ئەم کۆشکەی دروست کردووە ڕایەخی تێدا ڕاخستووە.

کەسی دووەم: تۆ کۆنەپەرست و دواکەوتویت، ئەمە هەموی کاری سروشتە.

کەسی یەکەم: چۆن ئەمە کاری سروشتە؟

کەسی دووەم: کۆمەڵە بەردێك بە هۆی با و بۆران و کارتێکەرە سروشتیەکان بەسەر یەکدا کۆبوونەوەو دوای چەند ساڵێك هەر بە ڕێکەوت گۆڕا بۆ ئەم کۆشك و دیوارە پڕ لە زەخرەفانە.

کەسی یەکەم: ئەی ئەو ڕایەخانە چۆن دروست بوون؟

کەسی دووەم: کۆمەڵە مەڕێك خوریەکانیان لێبووەوە و هەندێ کانزای ڕەنگاو ڕەنگیش هـاتن ڕەنگیـان پێ داو، بەمەش بوون بەم ڕایەخە ڕەنگاوڕەنگانە.

کەسی یەکەم: ئەی ئەو کاتژمێرانە؟

کەسی دووەم: هەندێ ئاسن کەوتنە نزیك یـەکتری و بەسـەر یەکـدا کۆبوونـەوە و بـە هـۆی کارتێکـەرە سروشتیەکان هەر بە ڕێکەوت بە شێوەی بازنەیی پارچـە پارچـە بـوون و چـونە نـاو یـەکتری و پـاش چـەند سەدەیەك بوو بەم کاتژمێرە.

ئایا ئەمە شێتی نیە؟ ئایا ڕێکەوت وای لە خانەیەك لە خانەکانی جـەرگ کـردووە کـە هەڵبـستێ بـە کۆمەڵێك کرداری کیمیایی ئاڵۆز کە ئەگەر ژورێکی پڕ لە ئامرازی بۆ بخەینە گەڕ، نـاتوانێ ئـەم کارانـە بـە تەواوی ئەنجام بدات، لە کاتێکدا کە ئەم خانەیە بە وردبین نەبێ نابیندرێ؟ ئەم خانەیە شەکری زیاد لە خوێن

دەگۆڕێ بۆ (گلایکۆجین) ، ئەمەش بۆ ئەوەی لە کاتی پێویستیدا بەکاریبێنێت دوای ئەوەی دەبێتەوە (گلوکۆز)، هەروەها ڕژێنی زەرداو دەردەدات تاوەکو ڕێژەی کۆلسترۆڵ جێگیر بکات لە خوێندا، ئەمە سەرەڕای دروستکردنی خڕۆکە سورەکان و چەندین کاری تر.

ئایا ڕێکەوت بوو کە (٩٠٠٠) گرێی بچوك لە زمانماندا دروست کرد کە هەموویان چێژ و تام ڕێکدەخەن، و لە هەر کوێچکەیەکیشدا (١٠٠٠٠) خانە هەیە بۆ کوێ لێبوون، هەروەها لە هەر چاوێکیشدا (١٣٠) ملیۆن خانە هەیە کە ئەرکیان ڕێکخستنی کرداری وەرگرتنی ڕوناکیە، ئەی زەوی بە هەموو ئەو نهێنی و سەیر و سەمەرانەی کە تێیدایە و بەو هەوایەی کە دەوری داوە بە هەموو ئەو زیندەوەرانەی کە هەستیان پێ ناکرێ و نابینرێن، هەروەها ئەو شێوازە سەیرانەی گەردەکانی بەفر کە دەکەونە سەر زەوی بەو وردیە دروست کراون و ئەو جوانیەیان هەیە، کە بەڕاستی تا ئەم سەردەمانە هیچمان لەمبارەیەوە نەدەزانی.

سەیری ئەو زەویە بکە بەو هەموو کانزا و هەموو ئەو نهێنی و سەمەرانەی کە خۆیان تێدا حەشارداوە و هەروەها هەموو ئەو زیندەوەر و ڕوەکە جۆراوجۆرانە و ئەو دەریا فراوانانەو ئەو شاخە سەختانە و ئەو دۆڵە قوڵانە... ئینجا بەراوردی بکە لەگەڵ خۆر دەبینی کە چەند بچوکە بەرامبەر بە خۆر و گەورەییەکەی، خۆر ملیۆن جار لە زەوی گەورەترە هەر هەسارەیەك لەو هەسارانە بە بەراور بە خۆر وەك دەنکە قومێك وایە لە بیاباندا.

ئەو خۆرەی کە (١٠٠) ملیۆن (کم) لێمان دوورە، ئەگەر بێت و بە تیشك بیپێوین، کە خێرایی تیشك بریتیە لە (١٠٠٠٠) (کم) لە چرکەیەکدا، بەمەش دووری خۆر لێمان دەگاتە (٨) خولەك، ئەی چی لەبارەی ئەو ئەستێرەو هەسارانەی کە ملیۆنان ساڵ لێمان دوورن و ڕوناکیەکەیانمان پێ دەگات. هەر ساڵێکی تیشکی دەکاتە (دە هەزار ملیار کیلۆمەتر) ئەی لە ملیۆن ساڵ دەکاتە چەند کم؟

لەو هەسارانە هەسارەی وا هەیە لەنێو مەجەڕەدا کە زانستی فەلەك هیچی لێنازانێت تەنها ئەوە نەبێت کە ئەو مەجەڕەیە هەسارەی تری تێدان، ئەمەش جگە لە خوا کەسی تر هیچی لێ نازانێت, ئەو هەسارانە ئەوەندە گەورەن کە مرۆڤ ناتوانێ بیری لێبکاتەوە لەگەڵ ئەمەشدا بە خێراییەك دەڕۆن کە سنوری ژمارەکان دەشکێنن! ئایا چۆن پێکدادان ڕوونادات؟ .

بابەتێکی زانایەکی گەردوونناسم خوێندەوە کە دەڵێ ئەگەری پێکدادانی ئەو هەسارانە وەکو ئەگەری پێکدادانی شەش مێشهەنگوینە کە بە تەنها لە ئاسمانی زەوی بسوڕێنەوە، کەواتە گەورەیی بۆشایی ئاسمان

هەروەها بانگەشەیان دەکرد کە جێی گومان نییە بیرۆکەی هەبونی خودا و عاتیفە ئاینییەکان پێویستیان بە ڕاڤەکردن هەیە و دەبێ ئەوە بوترێ کە مرۆڤ بونەوەرێکی ئیلاهی یەو لەناخی خۆیدا ڕەگەزی سروشت و خوایەتی هەڵگرتووە هەروەکو چۆن ڕەگەزەکانی مردن و نەمریی لەم ژیانە و هی تریشدا هەن، وە دەبێ ئەوەش بگوترێ کە خوا و دینداری دوو دیاردەی مرۆیین چونکە ڕەگەزی خوایەتی داهێنراوی مرۆڤە نەك مرۆڤ داهێنراوی خوا بێ.[18]

کەواتە مەبدەئی مارکسیەکان ئەوەیە کە خودا هیچ سودێکی لێوە دەستگیر نابێ و دەمەقالێ کردن لەبارەی بوونەکەی هیچ سودێکی نییە، وە ئەوان بیروباوەڕێکیان هەیەو هەرگیز لێی پاشگەز نابنەوە ئەویش ئەوەیە کە لەودیو بونی ماددەوە هیچ شتێك نییە تەنها وەهم و

---

بەرامبەر بە هەسارەکان کە لە ژمارە نایەن وەکو گەورەیی و فراوانی هەموو ئاسمانی زەویە بەرامبەر بە شەش مێشهەنگوین.

لە سەیرترینی سەمەرەکان و لە ئاشکراترینی بەڵگەکان لەسەر خوای گەورەو، ئەوەیە کە ئەو بۆشاییە بە هەموو ئەو شتانەی کە تێیدایە بە بچوککراوەیی هەیە، بە شێوەیەك کە عەقڵ دەرك بە وردی و بچوکیەکەی ناکات هەروەك چۆن دەرك بە فراوانی و گەورەییەکەی ناکات، ئەمەش لە گەردیلەدا بەدی دەکرێت.

ئەو گەردیلەیەی کە تەنها بە وردبینی ئەلیکترۆنی دەبینرێ، ئەو گەردیلەیەی کە زاناو فەیلەسوفە پێشینەکان بە تاکە گەوهەر ناویان بردووە (ئەو بەشەی کە هەرگیز لەت نابێت)، ئەو گەردیلەیە کە زانایان لەبارەیەوە دەڵێن، ئەگەر (٤٠) ملیۆن لەم گەردیلانە لە تەنیشت یەکتر ڕیز بکەین کە درێژیەکەی دەکاتە درێژی (٤٠) ملیۆن گەردیلە ئینجا قەبارەکەی دەبێتە یەك سانتیمەتر. لە ناوەڕاستی ئەو گەردیلەیە بۆشایی ناوك هەیە، کە چەند تەنێکی بچوك بە دەوریدا دەسوڕێنەوە هەروەك سوڕانەوەی هەسارەکان لە بۆشاییدا، قەبارەی ناوك بەرامبەر بە گەردیلە وەك قەبارەی دەنکە گەنمە بەرامبەر بە کۆشکێك، کێشی ناوك هەر بە تەنها یەکسانە بە کێشی (١٨٠٠) ئەلیکترۆن ئایا هەموو ئەوە کاری ڕێکەوتە؟

ئەوەی کە وا دەکات دڵی باوەڕدار سارد ببێتەوە، ئەو وتارە پوچانەی سروشت و ڕێکەوتن، بێگومان ئەو وتارانەو نمونەکانیان لە لایەن زاناکانەوە نین، بەڵکو کەسانێکن وەکو خەڵکی ئاسایی بانگەشەی زانست و زانایی دەکەن ، کەچی نە زاناو نە فێرخوازن.

١٨ أصول الماركسية بەرگی ١ لاپەڕە ٢٠٦

ئه‌فسانه نه‌بێ. ئه‌وان سه‌ره‌ڕای دان نانیان به هه‌بونی هه‌ست و عاتیفه‌ی ئاییني و هه‌بونی دیارده‌ی ئایینه‌كان به‌لاّم هه‌موو ئه‌مانه ده‌گێڕنه‌وه بۆ وه‌هم و ئه‌ندێشه به‌وه‌ی كه گوایه دوو دیارده‌ی مرۆیین، وه‌له‌سه‌ر بنه‌مای ئه‌م یاسایه‌ش پێیانوایه كه مرۆڤ داهێنه‌ری ڕه‌گه‌زی خوداییه نه‌ك خوا داهێنه‌ری مرۆڤ بێت.

**له‌لای ئه‌وان سروشت و مادده هه‌مان مانایان هه‌یه:**

ماركسیه‌كان سروشت به‌مانای مادده ده‌هێنن و مادده‌ش به‌مانای سروشت لێكده‌ده‌نه‌وه به‌تایبه‌تیش كاتێ كه باسی وه‌دیهێنان ده‌كه‌ن، ئه‌نگلز ده‌ڵێ: " وه سروشتیش سه‌ربه‌خۆیه و جیاوازه له‌هه‌موو فه‌لسه‌فه‌یه‌ك، سروشت ئه‌و بنه‌چه‌یه كه ئێمه هه‌مومان تێیدا گه‌شه‌مانكردووه. ئێمه‌ی خه‌ڵكی به‌رهه‌می سروشتین، وه‌له‌ده‌ره‌وه‌ی سروشت و مرۆڤیش هیچ شتێكی تر نییه، به‌لاّم ئه‌و بونه‌وه‌ره بالاّیانه‌ی كه له فرت و فێڵی ساخته‌ی ئاینه‌وه سه‌ریانهه‌ڵداوه جگه له ڕه‌نگدانه‌وه‌ی خه‌یاڵ و ئه‌ندێشه‌مان بۆ گه‌ردوون هیچی تر نین".

دانه‌رانی (أسس المادیه الدیالكتیكیه)ش ده‌ڵێن: "سروشت نه‌ك هه‌ر به‌ر له مرۆڤ هه‌بوه به‌ڵكو به‌گشتی به‌ر له هه‌مو زینده‌وه‌ران بوونی هه‌بووه‌و له ده‌ركپێكردنیش سه‌ربه‌خۆیه، به‌وپێیه‌ش سروشت سه‌ره‌كی یه‌و زانین و ده‌ركپێكردنیش به‌ر له سروشت نه‌یتوانیوه ببێ له‌به‌رئه‌وه لاوه‌كی یه".[١٩]

كه‌واته مادده بۆ هه‌میشه ده‌مێنێته‌وه‌و نه‌مره، وه له نه‌بوونیشه‌وه نه‌هاتۆته بوون چونكه ئه‌گه‌ر شتێ بونه‌كه‌ی له‌ناونه‌برێ ناشتوانرێ بهێنرێته بوون. له‌به‌رئه‌وه بۆمان نیه پرسیاربكه‌ین له‌باره‌ی سه‌ره‌تای مادده‌و كۆتاییه‌كه‌ی چونكه جێپه‌نجه‌كانی مادده زۆر به‌ڕوونی هه‌ستیان پێ ده‌كرێ. جوڵه‌ش به‌هه‌مانشێوه ناتوانرێ وه‌دیبهێنرێ یاخود بونه‌كه‌ی لابرێ چونكه جوڵه یه‌كێكه له‌خاسیه‌ته‌كانی مادده.

---

١٩ أسس المادیة الدیالكتیكیة والمادیة التأریخیة، لاپه‌ڕه ٤٣.

ئەنگلز دەڵێ: "مادده بەبێ جوڵە شتێکی نا ماقوڵە هەروەکو چۆن جوڵەش مانای نییە بەبێ مادده، کەواتە جوڵە ناتوانرێ بهێنرێتە بوون یاخود بوونەکەی بسڕدرێتەوە هەروەکو چۆن ماددەش وایە".

ئا بەمجۆرە ناکرێ جوڵە هەبێ بەبێ بوونی مادده وە ماددەش بەهەمان شێوە. ئەمەش لەبەرئەوەیە چونکە پەیوەستبونێکی تەواو لەنێوانیاندا هەیە، جا ئەگەر جوڵە لەئارادا نەما ئەوا ماددەش لەئارادا نابێ وە پێچەوانەکەیشی ڕاستە.

لەلای ئەوان لەهەموو شتێکدا بنەڕەتەکە بریتیە لە ماددەو هیچی تر، ماددەش ئەزەلی یەو هەمیشە دەمێنێتەوە، وە بوونی ماددەش وەپێش هزروبیرکردنەوە کەوتۆتەوە، بۆیە ئەم بنەمایانەی خوارەوە دەستگیر دەبن:

ماددیگەرایی پێمان دەڵێ جیهانی مادده بە سروشتی خۆی و هەموو شتێ کە لە گەردووندا هەیە لەسەر هۆکارە ماددیەکان هەن و بەپێی ڕێساکانی مادده گەشەدەکەن و پێشدەکەون.

ماددیگەرایی پێمان دەڵێ مادده ڕاستیەکی بابەتیانەیە کە لە دەرەوەی هۆشی ئێمەدا هەیەو لێی جیایە، هەروەها ئەوەشی کە لەهۆشدا هەیە ناکرێ لە مادده دابڕێنرێ بەڵکو هەرچی بەهۆشی مرۆڤدادێ یاخود ڕۆحی یە بەرهەمی کردارە ماددییەکانە.

ماددیگەرایی پێمان دەڵێ دەتوانین جیهان و ڕێساکانی بناسین هەرچەندە زۆرشت هەیە لەجیهانی ماددەو ئێمە دەرکی پێناکەین بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ واقیعێك لەئارادا نییە کە قابیلی زانین نەبێ و بکەوێتە دەرەوەی چوارچێوەی ماددەوە.[20]

بەم پێودانگە جیهان لە چوارچێوەی ماددەدا قەتیس ماوەو، هیچ شتێکی تری تێدا نییە جگە لە مادده، هەرشتێکیشی تێدابێ ئەوا بەروبومی ماددەیە، جا هیچ بوونێك بۆ ڕوحانییەت و غەیبیات لەگۆڕێ نییە چونکە بنەچەکەیان مادده نییە، تەنانەت هەرشتێ بچێتە دەرەوەی چوارچێوەی مادده تەنها وەهم و خورافیاتەو بوونی نییە -وەکو بانگەشەی بۆدەکەن-،

---

٢٠ مدخل الى المادية الجدلية لاپەڕە ٣٠-٣١

هزریش ناگونجێ وەپێش مادده بکەوێتەوه چونکه بەرهەمی ماددەیە، وه هیچ شتێکیش لەواقیعدا نییه که نەتوانین بیناسین هەرچەنده زانیاریشمان به جیهانی مادده زۆر تەسك بێ، هزریش له هەستەوه سەرچاوه دەگرێ، کانگای هەستەکانیش بریتییه له مادده که مرۆڤ بەهۆیەوه مەداری دەسازێ به کاریگەربوون بەو پێویستییانەی که سروشت بەسەریدا دەسەپێنێ. لەمبارەیەوه مارکس دەڵێ:

"هۆشی خەڵکی ئەوشته نییه که بوونەکەیان دیاریدەکات، بەڵکو بوونی کۆمەڵایەتییان هۆش و ئاگاییان دیاریدەکات[٢١]، به ڕەچاوکردنی گۆڕانی ئەو بارودۆخه دەرەکیانەی که لایەنی ماددی دەگرنەخۆ ئەوا هۆشیاریش گۆڕانی بەسەردا دێت، پوختەی مەبەستەکەیان ئەوەیه که بەدرێژایی مێژووی دوورودرێژی مرۆڤایەتی تاکەکان هیچ دەستێکیان له گۆڕینی ئاراستەی ڕووداوەکان دا نەبووه بەڵکو هەرکاتێ بارودۆخه دەرەکیەکانی مادده گۆڕابن ئەوا گۆڕانی بەسەر هەموو شتێکدا هێناوه لەگەڵ خۆیدا له ئایین و ئاکارو هزرو بەهاو نەریتەکانەوه..، بەڕای ئەوان لێرەدا گرنگی بیردۆزی مارکسیەت له ڕوانگەی پڕاکتیکی دەردەکەوێ بەوپێیەی که گوایه مادده وەپێش هزرو بیرکردنەوه کەوتۆتەوه.

بەمشێوەیه بەوجۆرەی که خۆیان بانگەشەی بۆ دەکەن هیچ شتێ بونی نییه جگه له جیهانی مادده، بۆیه گەڕان بەدوای بیروباوەڕ تەنها کات بەفیڕۆدانه چونکه هیچ کاریگەرییەکی له واقیعدا نییه، بەڵکو هزری توندوتۆڵیش لەسەر بنەمای بارودۆخی ماددیگەرایی پێشکەوتوو بەڕێوەدەچێ و هەر ئەو ماددیگەراییيه توانای گۆڕینی خەڵکی هەیه بەوپێیەی که مرۆڤی نەمر بوونی نییه.

بەڕای ئەوان خاوەندارێتی تاکەکەسی ئەو هۆکارەیه که وا له مرۆڤ دەکات ببێته گورگێك و براکەی بخوات بەهۆی ململانێ لەپێناوی ژیان، وه دەڵێن گۆڕانی هۆشیاری خەڵکی له ئەنجامی

---

٢١ أ صول الفلسفة الماركسية، بەرگی ١ ، لاپەڕه ٢٣٨، به وەرگرتن له دراسات فلسفية لاپەڕه ٧٩، مشاركة في النقد الإقتصادي السياسي.

گۆڕانی بارودۆخی ماددەیە، لەبەر ئەم هۆکارانە یەك ڕێگامان لەپێشەو هەرگیز ناتوانین لێی ڕاکەین ئەویش ئەوەیە کە هەردەبێ ئەو شیوعیەتە سەربخرێ کە هەرگیز بەرەنگاری ناکرێ.

جاکاتێ شیوعیەکان ئەم بنەما جەدەلییانە لەسەر گەردوون جێبەجێ دەکەن (کە لەلای ئەوان گەردوون هەمووی ماددەیە) لەدواوەی ئەمەوە ئامانجێك دەپێکن کە بریتییە لە ژێربارخستن و ملکەچکردنی ژیانی مرۆڤ بۆ ئەو ڕێسا جەدەلییانە، بەڕای ئەوان تاقە گەردوونێکی ماددیی هەیە کە هیچ خوایەك یان هیچ مرۆڤێك دروستی نەکردووە.

مرۆڤیش بەپێی ئەوان ماددەیە، هزرەکەیشی بەرهەمی ماددەیەکی بالآیە چونکە بەرهەمی مێشکە، مێشکیش ماددەیەو بەهەمان شێوە ڕۆحیش بەرهەمێکی تری بالآی ماددەیە. جاکەوابێ هەرشتێ بیربکاتەوەو هۆشی هەبێ ماددەیە، هەرشتێکیش بناسرێ و بونەکەی بزانرێ بوونی هەیە، بەوپێیەش کە خودا هەستی پێناکرێ کەواتە دەکەوێتە نێو خانەی نەناسینەوە، کاتێکیش نەناسرێ کەواتە بوونی نییە. مرۆڤیش ملکەچی ئەو ڕێسایانەیە کە سروشت ملکەچە بۆی چونکە مرۆڤ بەشێکە لە سروشت.

## ڕێساکانی مادده:

ماددیگەراییەکان دەڵێن مادده خاوەنی چەند ڕێسایەکی گشتی نەگۆڕە کە پێیان دەوترێ ڕێساکانی جەدەل و ئەوانیش بریتین لە: پێکەوەپەیوەستبوون، جووڵە، گەشەسەندن، دژیەکبوون.

**یەکەم: پێکەوە پەیوەستبوون لە سروشتدا:**

ماددیگەراییەکان دەڵێن: سروشت یەکەیەکی پێکەوەپەیوەستی یەکگرتووە، ڕووداوەکان و شتەجۆربەجۆرەکانیش بەهۆی لەیەکئالأنیانەوە هەرگیز لەیەکتری جیانابنەوە، ناشکرێ لەهیچ ڕووداوێکی سروشت تێبگەین ئەگەر بە جیا سەرنجی لێبدەین و لەو ڕووداوانەی دەوروبەری جیابکەینەوە، بەڵکو بەشێوەیەك دەتوانین لێی حاڵی بین ئەگەر بێتو لەو ڕووداوانەش بکۆڵینەوە کە لەدەوروبەریدا هەن و چۆنایەتی و ئاڕاستەکانی دیاریدەکەن.

**دووەم: جوڵە لە سروشتدا:**

ماددیگەراییەکان دەڵێن: جوڵە یەکێکە لە خاسیەتە هەمیشەییەکانی ماددەو لێی جیا نابێتەوە، ماددەش ئەزەلی و هەمیشەیی یەو ناشبێ پرسیار لەوە بکەین ماددە جوڵەی لەکوێوە هێناوە چونکە لە سروشتدا دۆخی وەستاو ڕۆڵی بالاَ ناگێرێ هەرچەندە وەستاوی لەسروشتدا هەیە بەڵام ئەوشتەی کە بەو ڕۆڵە هەڵدەستێ بریتییە لە جوڵەو گەشەسەندن و گۆڕان, ئەم جوڵەیە هەمیشە لە ناخی ماددە بونی هەیەو یەکێکە لە خاسیەتە بنەڕەتییەکانی و هەرگیز لێی جیانابێتەوە، وە هەر ئەزەلەوە ماددە خاوەنی جوڵە بووە.

لێرەدا مادام باس لە سەرچاوەیەك ئەکەن کە ماددە جوڵەی لێوە وەرگرتبێ، (نەویستانە) دان بەوەدا ئەنێن کە خوایەك هەیەو لەدەرەوەی کیانە ماددیەکەدایەو توانای وەدیهێنان و داهێنانی هەیە، بەڵام چونکە ماددیگەراییەکان تەنها بە چاوی ماددە شتەکان دەبینن بۆیە پێیانوایە لەم گەردونەدا دەستێك نییە ببێتە هۆکاری جوڵەی ماددەو گەشەسەندنی.

**سێیەم: گەشەسەندن لە سروشتدا:**

ماددیگەراییەکان پێیانوایە کە بزوتنەوەی گەشەسەندن بریتییە لە پێشکەوتنێك کە لە گۆڕانکاری ڕێژەیەکی کەم و ساکارەوە دەگۆڕێ بۆ گۆڕانکاری جۆریی بنەڕەت و بەرچاو، وە ئەم گۆڕانکارییە جۆرییە بەڕێکەوت لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی تر دەگۆڕێ لەڕێگەی پازدانەوە. ئەم گۆڕانکاریانەش حەتمی و پێویستن و هەردەبێ ڕووبدەن چونکە فەلسەفەی مارکسیەت وای بۆدەچێ کە هەموشتێ دەبێ بەرەو ڕوخان بچێ و هیچ شتێ ناتوانێ لەم جیهانەدا لەڕووی دا بوەستێ تەنها خۆڕاگری نەبێ، ڕێڕەوی گەشەسەندن و گۆڕانیش بەردەوامەو لە ڕۆیشتن ناوەستێ. فەلسەفەی مارکسیزم بەوە دەنازێ کە دەتوانێ هەموو ئەو تێڕوانینانە تێکبشکێنێ کە پشت بە ڕاستی ڕەها و بارودۆخە مرۆییە ڕەهاکانەوە دەبەستن چونکە ئەم فەلسەفەیە دان بە هیچ شتێکی ڕەهاو پیرۆزدا نانێ و، دەبێ بزوتنەوەی گەشەسەندنیش بەوە لێکبدرێتەوە کە بریتییە لە بزوتنەوەی پێشکەوتن و بەرزبوون، وە گۆڕان بۆ جۆرایەتیەکی نوێ، لە ساکارییەوە بۆ ئاڵۆزی، لە نزمیەوە بۆ بەرزی.

**چوارەم: دژیەکبوون لە سروشتدا:**

ماددیگەراییەکان دەڵێن هەموو شتێك و هەموو ڕووداوێـك لـە سروشـتدا لـەناخی خۆیـدا هەڵگری چەند شتێکی دژەیەکـە، چـونکە هەنـدێ ڕەگـەزی تێداهـەن کـە هەڵـدەپڕوکێن یـان گەشەدەکەن، تێیاندا ڕەگەزەکانی سالیب و موجەب هەیە، یـان ڕەگـەزی مـردن و لـەدایکبون دەبینرێن، هەروەها تێکۆشان و بەرەنگاری لەنێوان کۆن و نوێ دا هەیە، جگە لـە ڕەگـەزەکانی فەوتان و گەشەسەندن کـە نـاواخنی جوڵـەی گەشەسـەندن پێکـدەهێنن، بەهەمانشێوە دەبنـە ناواخنی گوێزرانەوەی گۆڕانکاریە ڕێژەییەکان بۆ گۆڕانکاریە جۆرییەکان.

## کاتێ ماددیگەراییەکان ئەم ڕێسایانە بەسەر ژیانی کۆمەڵگاو مێژووەکەی دا جێبەجێ دەکەن، ئەم شتانە تێبینی دەکرێن:

١- تویژینەوەی مرۆڤ و کۆمەڵگاکەی دەچێتە ژێر باری ڕێـساکانی سروشـت چـونکە مـرۆڤ بەرهەمی سروشتەو بەشێکە لێی، هەرشتێك لەسەر سروشتدا جێبەجێ بکرێ لەسـەر مـرۆڤیش جێبەجێ دەکرێ ئەمەش بەهۆی پتەوی پەیوەندی نێوان بەشەکانی سروشتەوەیە.

٢- ڕێساکانی مادده کاریگەرییان هەیە بەسەر ژیانی کۆمـەڵگاو پێکهێنـەرەکانی لەسـەر بنەمای ئەو بارودۆخە ئابووریەی کە ژیانی مرۆڤ دەسـوڕێنێ و وادەکـات ئـەو سیـستمەی کـە لەگەڵی دەگونجێ ببێتە سیستمێکی پێشکەوتوو و ئەوسیستمەش کە لەگەڵی ڕێکنەکەوێ ببێتە سیستمێکی دواکەوتوو.

٣- هەموو ڕووداوێك و هەموو شتێك لەسروشتدا لەجوڵەدایەو دەگۆڕێ، وەلەسەر ئەم بنەما سەراپاگیرە (کە مرۆڤ و ژیانی کۆمەڵگاش بەشێکن لە سروشت) هیچ شتێ بەهیچ جۆرێ نەگۆڕ نییە، بۆیە ئایینەکان و ئاکارو هزرو نەریت و بەهاو کەلتورەکان تێکڕا بەپێی گۆڕانی بارودۆخی ئابوری دەگۆڕێن.

٤- هەموو شتێ لەگۆڕان دایە، سەرکەوتنی نوێش بەسەر کۆن دا شتێکی حاشا هەڵنـەگرە، وە هیچ سیستمێکی کۆمەلایـەتی نـەگۆڕ لـەئارادا نییـەو لەسـەر ئـەم بنەمایـەش سیـستمی

سەرەتایی هەردەبێ لابچێ چونکە کۆنە و شوێنی بە شیوعیەت پڕدەکرێتەوە لەبەرئەوەی شیوعیەت قۆناغێکی نوێ دەهێنێ و هەر دەبێ سەریشبخرێ بۆیە بەربەرەکانێی لەگەڵدا ناکرێ.

٥- ئینکاری لە هێزی خوا دەکات، ئەو خوایەی کە توانای بە مرۆڤ بەخشیوە ماددە بگوڕێ.

٦- هەموو قۆناغێکی نوێ بەدڵنیاییەوە لە قۆناغەکەی ڕابردووی باڵاترە یان بەجۆرێکی تر بڵێن هەموو وەچەیەکی نوێ لەهی کۆن باڵاترە. دەرەبەگایەتی باشترە لە بەندایەتی، شیوعیەت باشترە لە سەرمایەداری و بەوشێوەیە..، ئەم ڕایەش لەسەر بنەمای گەشەسەندنی سروشت بنیاتنراوەو لە قۆناغێکەوە دەگوازرێتەوە بۆ قۆناغی دواتر لەڕێگەی گواستنەوە لە گۆڕانی ڕێژەیی یەوە بۆ گۆڕانی جۆریی لە شێوەی ڕێکەوتدا.

٧- هەموو کۆمەڵگایەك لە کۆمەڵگاکان جۆرێك لە دژیەکی ناواخنی تێدایە، وە ئەم دژیەکە هەردەبێ هەبێ و پێویستە تیشکی بخرێتەسەر بۆ ئەوەی بەسەریدا زاڵ ببین، دژیەکیش یاسای بنەڕەتی ژیانە بەڵام بە ئیشتراکیەت چارەسەر دەبێ و نەیاریی جێی دەگرێتەوە.

٨- سیستمی تازە سیستمی بەرلەخۆی لەسەداسەد ڕەت ناکاتەوە بەڵکو لایەنە پۆزەتیڤەکانی دەهێڵێتەوە.

## پەیوەندی بیردۆزی پەرەسەندن (گەشەسەندن) بە لێکدانەوەی ماددی بۆ مێژوو:

بیردۆزەکەی داروین لەسەر بنەمای دورخستنەوەی توانستی خوا لەکرداری دروستبونی مرۆڤ بنیاتنراوە، وە پێی وایە کە وەدیهێنەر بریتیە لە پەرەسەندنی ژیانی سروشت و بەم پێیەش بیردۆزێکی ماددیگەراییە، جا لەسەر ئەم بنەما ماددیە کە توانستی خوا لە وەدیهێنانی مرۆڤ ڕەتدەکاتەوەو مرۆڤ بە بەرهەمی پەرەسەندنی ژیانی سروشتی دادەنێ مارکسیەکان لێکدانەوە ماددیگەراییەکەیان بۆ مێژوو لکاند بە بیردۆزی پەرەسەندنەوە، بۆیە مارکسیەکان پێیان وایە

كه ماركس یاسای په‌ره‌سه‌ندنی مێژووی مرۆڤایه‌تی دۆزیوه‌ته‌وه هه‌روه‌ك چۆن داروین یاسای په‌ره‌سه‌ندنی سروشتی دۆزیه‌وه.

ماركس هه‌ڵسا كوشتاری جه‌ماوه‌ری ئه‌وروپای بۆ لێكدانه‌وه‌ی بیردۆزی په‌ره‌سه‌ندن قۆستەوەو ئه‌مه‌ی به‌هه‌موو شتێكی تری ژیانه‌وه گرێدا، ئینجا هه‌ڵسا په‌یوه‌ندییه‌كی دروستكرد له‌نێوان بیردۆزی په‌ره‌سه‌ندن و بیردۆزه‌كه‌ی كه بریتی بوو له ململانێی چینه‌كان و، كردی به بنچینه‌یه‌ك و پشتی پێ به‌ست له باسكردنی په‌ره‌سه‌ندنی كۆمه‌ڵگادا. كه‌واته بیردۆزی په‌ره‌سه‌ندن ڕۆڵێكی بالاَی هه‌یه له سه‌رهه‌ڵدانی بیردۆزه‌كه‌ی ماركس دا، وه به‌ڵكو یه‌كێك بووه له‌و كۆڵه‌گه سه‌ره‌كییانه‌ی كه له لێكدانه‌وه‌ی ماددی بۆ مێژوو پشتی پێ به‌ستووه.[22]

## ئه‌و هۆكارانه‌ی كه بیردۆزه‌كه‌ی داروینیان گه‌وره‌كرد ئه‌مانه بوون:

١- ئه‌و بارودۆخه خراپه‌ی كه بیردۆزه‌كه تێیدا گه‌شه‌ی سه‌ند و بلاَوبویه‌وه، به‌ئه‌ندازه‌یه‌ك كه ئه‌و كاته‌ی ئه‌م بیردۆزه تێیدا سه‌ری هه‌ڵدا پڕی بوو له ململانێی توندی نێوان زانست و ئایین. شۆڕشی پیشه‌سازیش ته‌واو ئه‌وروپای داگرتبۆوه‌و ئه‌وروپای به بۆیاغی ڕزگاربوون له ئایین و ڕه‌وشت بۆیاغ ده‌كرد.

٢- جوله‌كه‌كان به‌شێوه‌یه‌كی قێزه‌ون ئه‌م بیردۆزه‌یان ئیستیغلالكرد، هه‌روه‌كو ڕوون و ئاشكرایه له‌لای زۆرێك له خه‌ڵكی به‌تایبه‌تی زانایان كه جوله‌كه نه‌ته‌وه‌یه‌كه خۆیان خۆشده‌وێ و به‌وه ناسراون كه به‌هۆی فرت و فێڵ و چاوتێبڕین و ڕق وكینه خۆیان به‌سه‌ر ئه‌وانیتردا ده‌سه‌پێنن، له‌به‌رئه‌وه به‌رده‌وام له‌پلان دان بۆ زاڵ بوون به‌سه‌ر مرۆڤایه‌تی له‌ڕێی ڕوخاندنی بیروباوه‌ڕ و ڕه‌وشتیان. جا كاتێ بیردۆزه‌كه‌ی داروین له‌سه‌ر شانۆ ده‌ركه‌وت جوله‌كه‌كان هه‌ڵسان به ئیستیغلالكردنی بۆ له‌ناوبردنی بیروڕای نه‌سڕانیه‌تی شێوێنراوو خۆشكردنی ئاگری شۆڕش له دژی كلێسای نه‌فامی سته‌مكارو دواتریش له‌ناوبردنی ئایینی شێوێنراوی ئه‌وروپا.

٣- پشتگوێخستنی سه‌راپای تیۆره لاهوتیه‌كان.

---

[22] موقف الإسلام من نظرية ماركس، د. أحمد العوايشة. لاپه‌ره ١٦٣-١٧٥

## ئەو کاریگەرییانەی کە بیردۆزەکەی داروین جێی هێشتن:

١- ڕوخانی بیروڕای ئایینی.

٢- ڕەتکردنەوەی هەبوونی هەر مەبەست و ئامانجێك لە دروستکرانی مرۆڤ.

٣- ئاژەڵبوونی مرۆڤ و ماددیگەراییەکەی.

٤- ددان گیرکردن لەسەر پەرەسەندنی ڕەها.

**لەوانەی باسکران ئەم تێبینیانە دەردەکەون:**

١- بیردۆزی پەرەسەندن ئاژەڵیی ژیانی مرۆڤ و ماددیگەراییەکەی لێ کەوتەوە.

٢- ترسناکی ئەم بیردۆزە لە بەرەڵاییەکەیدا دەردەکەوێ کە دواتر بوە مایەی ڕوخانی ئایین و ڕەوشت[23] بەجۆرێك کە ئامانج و مەبەستی دروستکرانی مرۆڤ ڕەتکرایەوەو کرداری وەدیهێنانیش خرایە پاڵ هێزێکی سروشتی کوێر.

---

[23] (کامیل مەحمود) لە گۆڤارێکدا لەژێر ناونیشانی (پەیامی ئەخلاق لەنێوان ئارەزووەکانی غەریزەو ڕێنموونی یەکانی عەقڵدا) هەڵسەنگاندنێکی ڕەخنەیی بۆ تیۆری "مارکسیزم" کردووە، دەڵێ:

... لەنێوان سەدەی نۆزدەهەم بەدواوە کۆمەڵە بیروبۆچونێکی جیاواز سەریان هەڵدا کە هەریەکەیان لە گۆشەنیگایەکەوە دیاردە ڕەوشتیەکان و ئامانج و سەرچاوەکانیان و بنەما بنچینەکانیان لێکدەدایەوەو، داروین و فرۆید و کارل مارکس بەدەرکەوتن کە هەریەکەیان لەوبوارەی شارەزایی لێی هەبوو هەموو دیاردە ئینسانی و بارودۆخەکانی ژیانی لێکدەدایەوەو دەیکردە سەرچاوەی گوفتارو ڕەفتارو هەموو چالاکیە کردەیی و دەروونیەکانی تری مرۆڤ...، ئەمانەو کەسانێکی تریش ئامانج و ئاڕاستەکانیان بۆ سوککردنی ڕەوشت و مرۆڤ بوو، هەریەکەو بەشێوازێك و لەڕێگای خستنەڕووی بۆچونێکی تایبەتی خۆی و دوور لە سروشتی ڕەسەنی ناوەوەو دەرەوەی ئادەمیزادەکان.

جارێك بە بەهانەی (ئاژەڵیەتی سەرەتایی) مرۆڤ و پابەندێتی بەو تایبەتمەندییە ئاژەڵیەوە ڕەوشت دەکرایە حاڵەتێکی ناسروشتی و ڕەتدەکرایەوە، کە داروین پێشەنگایەتی ئەم بیروڕایەی دەکرد، جارێکی تر بە بیانوی کەبت نەکردنی ئارەزوەکانی مرۆڤ و ئازادکردنیەوە فرۆید هەرچوارلای مرۆڤی کردوویە پارچەیەك لە سێکس و

لەو ناوەندەدا جێ پێیەکی بۆ ڕەوشت نەهێشتبویەوە، جارێکی تریش ماددیەت و هۆکارە ئابوورییەکانی مارکس بازنەی ئابلۆقەی لەسەر ڕەوشت توندکردبوو کە مەگەر تەنها ڕەسەنایەتیەکەی خۆی دەروازەیەکی بۆ کردبێتەوەو جارێکی تر دەنگی خۆی بە مرۆڤایەتی گەیاندبێتەوە..

ئەمانە گرنگترین پێکهێنەرەکانی بیرو ئەخلاقیاتی کۆمەڵگەی ڕۆژئاوایی هاوچەرخ و سیمای مرۆڤی نوێی ئەوروپین. بەلام نابێت ئەوەش لەبەرچاو نەگرین کە ئەخلاقی ئەوروپی لەسەرەتاوە لە ئایینەوە سەرچاوەی گرتبو، هیچ سەرچاوەیەکیش جگە لەو کەناڵە ئاسمانی یە بوونی نەبوو، بەلام مرۆڤ و کۆمەڵگە کاتێك لە ئایین و عەقیدەکەی لایدا، لەگەڵیشیدا زۆربەی بەها ئەخلاقیەکان لادەدەن و خۆیان بزر دەکەن، بەلاّم لادانی ئەخلاقی زۆر لەسەرخۆیەو لە نەوەیەکدا هەستی کەمتر پێ دەکرێت، بەلکو تادەگاتە چەندین نەوە ئەگەر بەئاگاهێنەرەوەیەك نەبێ لادانەکە پانتاییەکی گەورە لە هەڵسوکەوتی تاکەکانی کۆمەڵ داگیر دەکات..، هەندێ وا گومان دەبەن کە پەیوەندی لەنێوان ئەخلاق و عەقیدەدا نی یەو دەکرێت مرۆڤ یان کۆمەڵگە لە عەقیدەو ئایین لابدات و بەها ئەخلاقیەکان وەك خۆیان بمێننەوە، بەلاّم ئەم بۆچونە تا ئەندازەیەکی زۆر ڕاست نییەو ئەگەر ئایین و عەقیدە لە ژیانی کۆمەڵگەو تاکەکانیدا بوونیان نەما مەگەر ئەوەندە لە قیەمە ئەخلاقیەکان بمێنێتەوە کە پەیوەندییان بە فیترەت و سروشتی مرۆڤایەتی یان مرۆیانەوە هەیە، هەرچەندە ئایینداری و هۆگری ئایینیش بەشێکە لە فیترەت و سروشتی ئادەمیزادو لادان لەو فیترەت و سروشتە ڕەسەنە لەدەستدانی تایبەتمەندیی ڕەسەنی مرۆییەو ئایین و ئەخلاقیش یەك داهاتوویان دەبێت.

ئەخلاقی ئەوروپی سەرەتا لە مەسیحیەتەوە سەرچاوەی گرتبوو... لەگەڵ لادان و تێکدانی ئەو ئایینەو تێکەلاّوکردنی بەرژەوەندیەکانی قەشەو پاپاکان بە ڕێنموونیەکانی کاریگەری لەسەر ئەخلاقی مرۆڤی ئەوروپیش دروستکردو تا کار گەیشتە گۆشەگیرکردنی یەکجاری ئایینی کلێساو دورخستنەوەی لە ژیانی گشتی خەڵك، لەگەڵ ئەم بارودۆخەشدا پشکی ئەخلاق لەو گۆڕانکاریەدا بەقۆناغ دەرکەوت و بەشێوەیەکیش خێرابوو کە چاوەڕێ نەدەکرا. ئەخلاق لەبوارەکانی ژیان دابڕاو بەڵگەو بەهانەی جۆراوجۆریش لەسەر ئەو دابڕانانە دەهێنرایەوە، بۆنمونە ئەخلاق لە سیاسەت دابڕێنراو (الغایة تبرر الوسیلة) و میکافیلیەت کرایە

تیۆری سەردەم لەوبارەیەوە، بەهەمان شێوە ئەخلاق لە سلوکی ئینسان و جنساویکردنی و لەویشەوە دیسان ئەخلاقیات تەنانەت لە ئەدەب و هونەریش دابڕێ.

ئەمانە هەموو دەرەنجامی کۆمەڵێ بۆچون و ئایدیای جیاوازبوو کە بیریارو فەیلەسوفەکانی ڕۆژئاوا دەربارەی مرۆڤ و ژیان بۆیان دروست بوو بوو، هەریەکەشیان لێکدانەوەی خۆی هەبوو بۆ مرۆڤ و ڕەفتارەکانی و ئامانجەکانی لەم ژیانەدا، ئەوەی زیاتر بەهەڵەیدا بردبوون ئەو تێگەیشتنە جباجیانەبوون کە دەربارەی ماهیەتی مرۆڤ دەیانخستنەڕوو، هەریەکەشیان لەوڕووەوە مرۆڤی هەڵدەسەنگاند کە بواری کارو پیشەکەی خۆی بوو.. هەر لەو گۆشەنیگایەشەوە مرۆڤ و مرۆڤایەتی دەبینی.

هەریەکەیان لە گۆشەنیگایەکی تەسکەوە سەیری ئادەمیزادیان کردووەو ماهیەتیان لێکداوەتەوە. (مارکسیزم ژیانی ئینسان دەگێڕێتەوە بۆ تاقە عاملیێک کە ئەویش ئابووری یە، بەواتایەکی دی لە گۆشەنیگای گەدە -معدة-یەوە هەڵدەسەنگێنیێ و داروینیزم ئینسان بە ئاژەڵێکی ڕووت سەیردەکات لەگەڵ کەرو گایاندا حەشر دەکات، فرۆیدیزم ئینسان لە جلێتاوی جینس هەڵدەکێشێ و جگە لە پاڵنەری جینس هیچ شتێکی تر لە ئینساندا نابینێ و ئەنگزیستانسیالیزم -بوێتی- تەنها بڕوای بە تاك هەیەو دۆرکایم بە پێچەوانەی سارتەری -وجودی-یەوە تەنها بڕوای بە کۆمەڵ هەیەو نیتشەی ئەڵمانی جگە لە کوتەك و هێز بڕوای بە هیچی دی نییە).(١)

ئەمانە هەریەکە لە گۆشەنیگای ئەو چەمك و زانستەوەی خۆی پێوە خەریك کردووە ئادەمیزادیان نرخاندووەو ئەوەیان لەخۆیان شێواندووە کە ئەگەر هەموو بۆچونەکانیان بەیەکەوە تێکەڵ بکرێت ئەوکاتە مەگەر مرۆڤێکی نیمچە کامڵ پێناسە بکرێت..، نەك ئابووریزانێك لە کەناڵی ئابوورییەوە مرۆڤ بناسێنێ وبەهەمان شێوە دەروونناس و کۆمەڵناس و عەقڵ میلیتارەکان و ...هتد.

ئەم بیروبۆچون و لێکدانەوە جۆربەجۆرانە تێگەیشتنی سەیرو جیاوازیشی دەربارەی ئەخلاق و بەها جوانەکان هێنایە کایەو سروشتیشە، تێگەیشتنە کاڵای باڵای بۆچوون و ڕا پێشینەکان بن.

فەوزای عەقڵی و فرەڕایی و بیروبۆچونی جۆراوجۆر زیاتر بەرهەمی شۆڕشی گەورەی فەڕەنسابوو شۆڕشی فەڕەنسی کە شۆڕشی هەستی مرۆڤایەتی بوو لەسەدەی هەژدەهەمداو ساڵی ١٧٨٩ بەرپا بوو، زۆر چەمکی

له‌ژیانی كۆمه‌ڵگه‌ی ڕۆژئاوایی گۆڕی، چه‌مكی (ئازادی فه‌ردی) یه‌كێك بوو له‌و چه‌مكه به‌رچاوانه‌ی كه زیاده‌ڕه‌ویی تیاكراو كه‌ش و هه‌وایه‌كی نالـه‌باری لـه زۆر ڕووی ژیانـه‌وه دروستكرد، چونكه (ئاره‌زووی سه‌ربه‌ستی له‌تاكدا ئه‌گه‌ر جڵه‌وی به‌ته‌واوی بۆ شل كرا له‌ڕووی بیركردنه‌وه‌وه بشێویه‌كی بێ سنووری فیكری لێ ده‌كه‌وێته‌وه... له‌بواری سیاسه‌تیشدا كۆمه‌ڵێ پێوه‌ری نائه‌خلاقی و نائینسانی هێنایه گۆڕێ، لـه‌بواری ئابووریشدا دیكتاتۆریه‌تێكی خولقاند كه به‌رژه‌وه‌ندی له‌دوای به‌رژه‌وه‌ندی هیچی تر نه‌بینێت.. بۆیه نیوسه‌ده به‌ر له هه‌ڵگیرسانی ئه‌و شۆڕشه‌دا تێنه‌په‌ڕی زۆر به‌ڕوونی نیشانه‌كانی فه‌وزای فیكری و سیاسی و ئه‌خلاقی له‌كۆمه‌ڵگای ئه‌وروپی دا به‌دیار كه‌وت، ته‌نانه‌ت سه‌ركه‌شی ماڵ و چاوبرسێتی خاوه‌نـه‌كانی وا ده‌ستپێكرد كه ڕێگا خۆشكه‌ر بوو بۆئه‌وه‌ی سه‌ده‌ی نۆزه‌هه‌م -كه‌سه‌ده‌ی دوای شۆڕشی فه‌ره‌نسی بوو- ببێته سه‌ده‌ی داگیركاری (ئیستیعمار) له‌پێناوی ماڵ و پیشه‌سازی دا، هه‌روه‌ها ببێته سه‌ده‌ی كۆیله‌كردنی گه‌لان له‌جیاتی ئه‌وه‌ی پارێزگاری له ئازادی تاكه‌كان بكرێ له مومارەسه‌كردنی سه‌ربه‌ستیه‌كانی خۆیاندا). (٢)

ئه‌وه‌ی شۆڕشی فه‌ره‌نسی ده‌رباره‌ی ئازادی فه‌رد وه‌ك شیعار به‌رزی كردبوویه‌وه، چونكه پێوه‌رێكی ئه‌خلاقی له‌پشتیه‌وه نه‌بوو به‌رهه‌مه‌كه‌ی كۆیله‌كردنی تاكه‌كان بوو له‌لایه‌ن كۆمه‌ڵه تاكێكی تره‌وه، له ده‌ره‌وه‌و ناوه‌وه ئه‌خلاق بوونی بوو به ده‌گمه‌ن، له ناوه‌وه ئامانج به‌رژه‌وه‌ندی یه له ده‌ره‌وه‌ش داگیركاری و ئیستیعمار، وه‌ك وتمان گۆڕانكاری هه‌موو چه‌مكه‌كانی ژیانی گرته‌وه‌و هه‌ریه‌كه له‌ژێر باڵی (اختصاص)ه‌كه‌ی خۆیه‌وه بۆكێشه‌ی ده‌نواڕی و مرۆڤیان تیا ده‌نرخاند، كۆمۆنیزم ڕۆڵێكی زاتی بۆ مرۆڤ نه‌هێشته‌وه‌و ماركسیه‌كان هۆ ئابووریه‌كانیان كرد به كوێخاو ده‌مڕاستی مرۆڤ و هه‌موو جوڵانه‌وه‌یه‌كی تری ناو ژیان.

**ماركسیزم و تێڕوانینیان بۆ ڕه‌وشت:**

كاتێك له‌ژیاندا هه‌موو سه‌روه‌ری و بڕیار به‌ده‌ستی یه‌ك درایه مادده‌و هیچ نرخێك بۆ هه‌ست و شعورو هه‌ڵچونه‌كانی مرۆڤ و پاشان خولقێنه‌ری ئه‌و مرۆڤه دانه‌نرا... ئه‌وكاته ده‌بێت ئه‌خلاق و به‌های به‌رز به‌چ شێوه‌یه‌ك له مادده و داس و چه‌كوش و ئاشی به‌ردو تراكتۆرو هۆكانی تری به‌رهه‌مهێنان چاوه‌ڕوان بكرێت.

مارکسیزم وای بۆ دەچێت ئەخلاق فێڵێکی بۆرژوازیانەیەو پێویستە لەناوبرێ هیچ بایەخێکیان پێ نەدرێت، وەك لە مانیفێستی کۆمۆنیستی هەردوو سەرکردەی کۆمۆنیزم (مارکس و ئەنجلز) دا هاتووەو دەڵێت: (ئایین و دەستورو ئەخلاق فێڵی بۆرژوازیانەن).

ئەخلاق لە ڕوانگەی ئەوانەوە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی داهێنراوەو لەلایەن بۆرژوازو سەرمایەدارەکانەوە دروستکراون و سەپێنراون بۆ پاراستنی خۆیان و چەواشەکردنی جەماوەرو بەواتاکانی ڕاستگۆیی و شەرم و بەزەیی و حەق و چاکەو ڕێز و دەستپاکی و ...هتد ڕازیان دەکەن. بۆیە تێکشکانی ئەخلاق و سەرکەوتن بەسەریداو لەناوبردنیان یەکێکە لە پێویستیەکانی شۆڕشی کۆمۆنیستی، چونکە بەلایەوە هەموو ئەو دیاردەو حاڵەتانەی پەیوەنیان بە چین و ڕژێمی سەرمایەداریەوە هەیەو بەرهەمی ئەوانن دەبێت لەناوبرێن و مساوەمە لەسەر هیچ یەکێکیان نەکرێت..، ئەخلاقیش وەك ڕوونمانکردەوە فێڵێکی بۆرژوازی یەو دەستکردی چینی سەرمایەدارە بۆ سەپاندنی دەستەڵاتی خۆیان، بۆیە لەناوبردنی یەکێکە لە داخوازیەکانی سەرکەوتنی شۆڕشی کۆمۆنیستی و ڕوخاندنی دەستەڵاتی سەرمایەداری.

بەلای مارکسیەکانەوە بەهیچ شێوەیەك نزیکبونەوەو دانوستان لەگەڵ سەرمایەداریدا نی یەو ململانێ لەنێوان چینی پرۆلیتارو سەرمایەداردا تاکۆتایی هەر بەردەوامە.. ئەگەر ئایینەکان وای ئەبینن (شەیتان) سەرچاوەی هەموو شەڕێکەو پێویستە دژایەتی بکرێت، ئەوا بەلای مارکسیزمەوە ئەو شەیتانە بریتیە لە ڕژێمی سەرمایەداری، بگرە بەشێوەیەکی خراپتریش، خۆ ئەگەر ئایین وای بڕیارداوە کە دوژمنایەتی کردنی شەیتان لەلایەن باوەڕدارانەوە پێویستە بە لانەدان و ڕاستگۆیی و پاککردنەوەو ڕاهێنانی دەروونی مرۆڤایەتی و خێرو چاکەکردنەوە ئەجام بدرێت لەکاتی مامەڵەو ڕەفتارو هەڵوێست نواندندا، ئەوا بەلای مارکسیزمەوە هۆکارێکی دیاریکراو نییە بۆ دژایەتیکردنی شەیتانەکەی خۆی (سەرمایەداری) بەڵکو ئەوەی بەرژەوەندی ئەو (واتە مارکسیزم) بەدی ئەهێنێت بەلایەوە دروست و گونجاوە لەڕووی ئەخلاقیەوە.(٣)

لێرەدا مارکسیزمیش لە گەیشتن بە مەبەست و ئامانجی خۆیدا وەك زۆر ڕژێم و بیروباوەڕی تری زەمینی ڕێبازی (الغایة تبرر الوسیلة) بەکاردەهێنێت و لەم پێناوەدا بەڕەوای دەبینێت کە هەموو قیەمە ئەخلاقیەکان

ژێر پێ بنێت، به‌ڵكو ئه‌وه‌ش نه‌بێت هه‌ر له‌سه‌ره‌تاوه باوه‌ڕی به ئه‌خلاق نی یه‌و به ده‌ستكردی بۆرژوازی ده‌زانێت.

ئه‌مه‌ش وه‌نه‌بێت ته‌نها له‌شێوه‌ی لێدوان و چوارچێوه‌ی تیۆری دا وه‌ستابێت و كۆمۆنیسته‌كان له‌سه‌ر گۆڕه‌پانی واقیع په‌یڕه‌ویان نه‌كردبێت، هه‌موو ئه‌و چه‌ندین ملیۆن قوربانی یه‌ی ژێر ده‌سته‌ڵاتی حه‌فتا ساڵه‌ی كۆمۆنیسته‌كانی شوره‌وی كۆن پراكتیكی ئه‌و گوفتارو تیۆره نائه‌خلاقی یانه‌ن، ئه‌وان هه‌موو شتێك ئه‌كه‌ن و كردوویانه بۆ گه‌یشتن به ده‌سته‌ڵات و سه‌پاندنی ئایدیای خۆیان، پێشه‌وای كۆمۆنیستی (لینین) له‌م باره‌یه‌وه ده‌ڵێت: (له‌سه‌رمانه كه ئاماده‌بین بۆ قبوڵكردنی هه‌موو جۆرێك له جۆره‌كانی فیداكاری، ئه‌گه‌ر پێویستی كرد ئێمه هه‌موو شتێك ئه‌كه‌ین كه بۆمان بكرێت، بۆ ئه‌مه‌ش فێڵ و هونه‌ره‌كانی مه‌كرو فێڵ و هه‌موو هۆكاره نامه‌شروعه‌كان دروستن، هه‌روه‌ها بێده‌نگی و به‌ژێره‌وه‌كردنی حه‌ق و به‌كورتی هه‌موو نه‌ریته‌كان له‌به‌رژه‌وه‌ندی جه‌نگی چینه‌كانه‌وه وه‌رده‌گرین).(٤)

هه‌روه‌ها ده‌ڵێت: (پێویسته له‌سه‌ر تێكۆشه‌ری شیوعی مومارسه‌ی هه‌مو شێوازێكی چه‌واشه‌كاری و غه‌ش و وێڵ كردن بكات، تێكۆشان له‌پێناوی كۆمۆنیزمدا هه‌موو هۆكارێك به پیرۆز ده‌زانێت كه كۆمۆنیزم به‌دی بهێنێت... له‌به‌رئه‌وه كۆمۆنیزم هه‌موو هۆكارێكی دژ به ئه‌خلاقیش به پیرۆز ده‌زانێت ئه‌گه‌ر ئه‌و هۆكارانه یارمه‌تی به‌دیهێنانی ئامانجه كۆمۆنیستی یه‌كانمان بدات).(٥)

هه‌موو ئه‌مانه له‌ماوه‌ی فه‌رمانڕه‌وایه‌تی كۆمۆنیسته‌كاندا به زیاتریشه‌وه په‌یڕه‌وكراوه‌و هه‌موو ژیان و ئازادیه‌كی مرۆییانه كراوه‌ته قوربانی تێگه‌یشتن و بیروبۆچونه نائه‌خلاقیه‌كانی ئه‌وان، له‌جیاتی ئه‌وه‌ی به‌هه‌شتی به‌ڵێن پێدراوی سه‌رزه‌وی (كه به‌رپاكردنی كۆمۆنیزمه) بۆ خه‌ڵك دروست بكه‌ن ئه‌وه‌ش هه‌یان بوو له‌ده‌ستیان چوو، چونكه ئامانج ئه‌گه‌ر پاك و پیرۆز بێت هه‌ر به هۆكاری پاك و پیرۆزیش به‌دی دێت.

### ماركسیزم له‌نێوان عه‌قڵ و غه‌ریزه‌دا:

به‌پێی میكانیزمه نائه‌خلاقی یه‌كانی جێبه‌جێكردن و به‌ئاكام گه‌یاندنی فیكری كۆمۆنیستی له‌سه‌ر ئه‌و بیروڕایانه‌ی ڕابه‌ره‌كانیان به‌ئاشكرا ده‌یخه‌نه‌ڕوو، هه‌وڵه‌كانیان له‌چوارچێوه‌ی به‌دیهێنانی ئاره‌زووه‌كانی غه‌ریزه‌دا تێناپه‌ڕێت، جگه له كاركردن بۆ به‌ده‌سته‌ڵات گه‌یشتنی كۆمۆنیزم یاخود كۆمۆنیسته‌كانی كه

ئامانجی سەرەکی ئەوانەو هەموو هۆکارو ڕێگایەك بۆ ئەو مەبەستە بەرەواو مەشروع دەزانن با دژایەتی لەگەڵ بنەما ئەخلاقی یەکان ناکەن و وەك خۆیان دەڵێن فێڵێکی بۆرژوازی یە.

لێرەدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە سروشتی کۆمۆنیزم و کۆمۆنیستەکان ئالوودەیە بە بەدواداچوونی ئارەزووە غەریزی یەکان و هەموو گوفتارو ڕەفتارێکیان لەو خولگەیەدا دەسوڕێتەوە. ئامانجی گەیشتن بە دەسەڵات و باڵایەتی غەریزەیەکە لە غەریزە فیترِی یەکانی مرۆڤ و ئەگەر دوورخرایەوە لە ڕێنموونیەکانی عەقڵ و پەروەردەیەکی شیاوی عەقلانیانە، بەو شێوەیەی لێ دەکەوێتەوە کە کۆمۆنیستەکان دووچاری بوون و هەموو ئەخلاق و قیەمێکی بەرزیان بۆ بەلاوە ناوە... غەریزەی دەسەڵات ئەگەر لە مرۆڤدا موتڵەق کراو کرایە ئامانجێك هەموو شتێکی لەپێناودا بە مەشروع بزانرێت و ئەوا داهاتوویەکی ترسناکی لێ دەکەوێتەوە ئەگەر ئەو مرۆڤە گەیشت بەو دەسەڵاتەو ئاواتەکەی بەدی هات...

کەواتە ئەو ئامانجەی کە کۆمۆنیستەکان بەوشێوەیە دەیانەوێت بەدی بهێنن دوورە لە فیترەتی ڕەسەن و چاك و دوورە لەو تەفاعولە سروشتی یە ئاکام بەخشەی عەقڵ و غەریزەکان بەوشێوەیەی پێشتر ڕەهەندەکانیمان خستەڕوو.

بەهۆی دابرِانی ئەخلاق لە تەواوی بوارەکانی تری ژیان لە فیکری مارکسیزمدا، دووبارە ڕۆڵی موتڵەقی غەریزەکان هاتەوەکایە، تەفسیری جنسی بۆ سلوکی ئینسان فەوزایەکی تری لەوبوارەی ژیانی کۆمەڵگەدا دروستکرد، ئەم تەفسیرە جنسی یە ئەگەرچی فرۆید پێشەنگ و تیۆرسازی بوو بەڵام مارکس و مارکسیزمەکان ڕێگا خۆشکەر بوون بۆئەوەی کۆمەڵگەی ڕۆژئاوایی و غەیری ڕۆژئاوایی پێوە ئالوودە بکەن.

مارکس دەڵێت: (پاکێتی جنسی لە نەریتەکانی کۆمەڵگەی دەرەبەگایەتی بەسەرچووە). مارکسیەکان جنسگەرایی موتڵەق و ڕەها لە هەموو کەندو کۆتێکی عەقڵ و مەنتیق بە نەریتی کۆمەڵگەی کۆمۆنیستی و مۆدێرنی خۆیان دەزانن و لەم پێناوەدا هەمو شتێك دەکەن بۆئەوەی کۆتی هاوسەرایەتی نێوان ژن و پیاو یاخود چوارچێوەی خێزان هەڵبگرن و غەریزە بێ ئەوەی ڕێکخەرێك ڕێنموونی بکات حاکمی موتڵەق بێت لە ژیاندا، دەبێت لە وەها بارودۆخێکدا ئەگەر بڕەخسێت چی ڕوویدات و تام و چێژی ژیان لەکام شوێنی دا

بمێنێتەوه..، هەرچەندە هەرگیز بارودۆخێکی بەوشێوه ئاژەڵیـەو خـوارتریش هـەرگیز ڕوونـادات و ڕوویـشی نەداوه.. چونکه ئەوه دووره له سروشتی مرۆڤایەتی ڕەسەن و تێگەیستنه مەنتیقیەکانی.

هەڵەی مێژووی مارکسیزم لەوەدایە هەمیشە له یەك بانێژەوه له مـرۆڤ و سـلوکیاتی دەڕوانێـت و یـەك لایەنی مەسەلەیەك لێکدەداتەوه بۆ تەفسیرکردنی. تەماشاکردنی مرۆڤ وەك کائینێکی غـەریزی و پاشـکۆی ئەو غەریزانە، ستەم کردنه له سروشتی ڕەسەنی مرۆڤ و بچوك کردنەوەو قیـزەون کردنـی، مـرۆڤ بـەدەر لـه ڕەهەندە عەقڵی و ڕۆحی و غەریزی و جەستەیی یەکانی تایبەتمەندی مرۆڤانەی خۆی پێ لەدەست دەدات، بـۆ نمونه ئەوانەی دەیانەوێت سامانی ئابووری به یەکسانی دابەشـبکرێت، ئایـا ئـەو یەکـسانی یـه بـەبێ هـیچ پێوەرو بنەمایەکی ئەخلاقی چۆن جێبەجێ دەکرێت.

پەروەردەی ئەخلاقی سەرەتا بریتی یه له چاکسازی، پیش هەموو شتێك بـریتی یـه لـه ڕێکخـستنەوەی کۆمەڵگە..، ئەمەش هەمووی لەسەر پەروەردەی ئەخلاقیی گشتی وەستاوه (واته ئەخلاقی کۆمەڵایەتی).

ئەخلاق: ئاوێنەی یەکسانی و بەرامبەری یه... پێوەری سۆزو خۆشەویـستی و برایـەتی یـە.. بەرنامـەی زانستیانەی ڕۆژانەیە که زنجیرەی تەمەنی مرۆڤایەتی پێکدێنێت و مانا دەدات به ژیان. کاتێك ئەخلاق دوور دەخرێتەوه له ڕەفتارو کرداری مرۆیانەو غەریزەو ئارەزوەکـانی دەکرێتـه پێـوەر لـه ژیانـدا، نابەرامبـەری و بەرژەوەندچێتی و ئارەزووبازی و یەك نەخوێندنەوەو تەنها غـەریزەو بەرژەوەنـدی شەخـسی دەبێتـه هـەوێنی ژیان..، پاکێتی له ژیانی ڕۆڤایەتیدا هەڵدەگیرێ و پـیس و پـۆخڵی دەبێتـه جەوهـەری کـارو هەڵوێـست و مەبەستەکانمان. جگە له مارکسیزم هەمو بیروبۆچوونه یەك جەمسەریەکانی تریش بۆچەنی سەلبی یان هەیـە بەرامبەر به ئەخلاق و چوارچێوەو پێوەرێکی ئەخلاقی بۆ ڕەفتارو هەڵسوکەوتی مـرۆڤ بـه پێویـست نـازانن. مەبەست له یەك جەمسەریش ئەو ئەو ئایدیا جۆراو جۆرانەیە لەڕوانگەی یەك جەمسەری مەعریفی بەشەری خۆیانەوه له مرۆڤ دەڕوانن، فرۆید لەو ڕوانگەیەوه تەفسیری ڕەفتارەکانی مرۆڤ دەکـات کـه جـنس لەپـشتی هەموویانەوەیەو پێویستە ئەو پاڵنەره کپ نەکرێت بەناوی ئەخلاق و نەریت و ئایینەوەو ڕێگـەی لەبەردەمـدا ڕەها بکرێت، چونکه ئەمە کوشتنی زاتیەتی مرۆڤە، فرۆید دەڵێ: (مـرۆڤ واتـی خـۆی بـەدی ناهێنێـت تـا

---

حاڵەتی جنسی تێر نەکات، هەموو کۆتێکیش —لە ئایین و ئەخلاق و کۆمەڵگەو نەریتەکان- کۆتی باتڵن و ڕووخێنەری تواناکانی مرۆڤن و خەفەکردنێکی نامەشروعن).(٦)

داروینیش کە مرۆڤ وەك ئاژەڵێکی گەشەکردوو پێناسە دەکات و لەو دیدگایەوە سەیری مرۆڤ دەکات کە جیا نی یە لەو ئاژەڵانەی بەرچاومان و بگرە ڕۆژێك لە ڕۆژان وەك ئەوان بوون و سروشت و بارودۆخ و پێویستی گەشەی پێداون و کردوونی بەم شێوەیەی ناوی مرۆڤمان لێ ناون و لە جەوهەردا ئێستاش ئاژەڵن و ئارەزووە ئاژەڵی یەکان دەیانجوڵێنن.

لەم ناوەندەدا کە ئەمە تێڕوانینەکان بێت بۆ مرۆڤ دەبێت کام جێگا مابێتەوە بۆ ئۆقرەگرتنی ئەخلاق و بایەخ پێدانی و جیاکردنەوەی، دیارە ئەخلاق لەناو ئەو کۆمەڵگانەدا کە ئەم تێگەیشتنانەی تیادا باوبێت وەك کۆمەڵگەی ڕۆژئاوای ئەمڕۆ ئەخلاق گۆشەگیر کراوەو دابڕاوە لە هەموو بوارو هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ، ئەم دابڕان و فەسادە ئەخلاقی یە ناوی لێ نراوە گۆڕانکاری و پەرەسەندن و پێشکەوتن و پێویستی حەتمی و شتی تر...،.

پەراوێز:

(١) پوختەیەك دەربارەی ئیسلام، مامۆستا عەلی باپیر ل ٢٨١.

(٢) الفكر الإسلامي والمجتمع المعاصر، د. محمد البهي، ل ١٦٣.

(٣) هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

(٤) جاهلية القرن العشرين، محمد قطب، ل ١٥٧.

(٥) هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

(وەرگێڕ)

٣- هەروەها ترسناکیەکەی لە حەتمی بوون و لەڕێ دەرچوونەکەشی دا دەردەکەوێ کە بوە هۆی ددان گیرکردن لەسەر پەرەسەندنی ڕەها، بەو گوتەیەی کە هیچ شتێ نەگۆڕ نییە و هیچ شتێکیش پیرۆز نییە، وە هەمو شتێکیش لە پەرەسەندن دایە. بیروباوەڕ پەرەدەسەنێ، ڕەوشت پەرەدەسەنێ، هزرەکان پەرەدەسەنن و بارودۆخی نوێی دوای پەرەسەندنیش باشترو بالاتره لە بارودۆخە کۆنەکەی.

٤- بیردۆزەکەی داروین بەیەکێك لەو بنچینە گرنگانە دادەنرێ کە مارکس لە بیردۆزەکەیدا پشتی پێ بەست، هەروەها ددان نان بە حەتمیەتی پەرەسەندن و لێکدانەوەی گواستنەوە لە حالێکەوە بۆ حالێکی تر بەوەی کە لە ئەنجامی گۆڕانی بارودۆخی ئابووری یەوە سەرهەڵدەدات، هەروەها ددان نانی بەوەی هەمووشتێکی نوێ لە هی کۆن باشترەو جێی پێ لەق دەکات.

٥- ماددیگەراییەکان و ئەوانەشی کە پێچەوانەیانن باس لەو پەیوەندیە بەهێزەی نێوان بیردۆزی داروین و بیردۆزی مارکس دەکەن لە گەشەسەندنی کۆمەڵگاو پاڵپشتی لێ دەکەن. ئاشکراشە کە هەر گەندەڵییەك ڕوو لە بنەچەکە بکات ئەوا کار لە بناغەو هەیکەلەکەشی دەکات، جا کاتێ بیردۆزەکەی داروین ڕووی کردە لەرزین بەدوای خۆشی دا بیردۆزەکەی مارکسیش کەوتە لەرزین.[٢٤]

## مەرجەکانی ژیانی ماددەگەری:

ماددیگەراییەکان دەڵێن کارتێکەرەکانی سروشت یەکێ لە مەرجە هەمیشەییەکانی ژیانی کۆمەڵگای ماددی پێکدەهێنن و کاریگەرییان هەیە بەسەر گەشەسەندنیەوە، کۆمەڵگا بەشێکە لەم گەردوونە ماددییەو هەمیشە لە پەرەسەندن و گەشەسەندنی دا کاریگەریی لەگەڵ سروشتدا ئاڵوگۆڕدەکات چونکە مەرجێکی پێویستی ژیانی خەڵکی و بونی کۆمەڵگایە. بۆیە زەوی و خۆرو ڕوبارو دەریاکان و سامانە پەنگ خواردووەکانی ژێرخاك و مەرجەکانی کەش و هەوا

---

٢٤ نظرية داروين بين مؤيديها و معارضيها لاپەڕە ٤٤

هەموو پێکەوە ئەو ناوەندە جیۆگرافی یە بۆ کۆمەڵگای مرۆڤایەتی پێکدەهێنن، جا ئەو ناوەندە جیۆگرافی یە کار دەکاتە سەر گەشەکردنی کۆمەڵگا چونکە گەشەکردن یەکێکە لە مەرجە پێویستەکانی ژیانی کۆمەڵگای ماددی کە یان جوڵەی گەشەکردنی کۆمەڵگا بەرەوپێشەوە دەبات یانیش دەبێتە بەربەست لەبەردەمی.

دانەرانی پەرتوکی المادیه التأریخیه دەڵێن: " مەرجەکانی ناوەندێکی جیۆگرافی باش پاڵنەرن بۆ گەشەسەندنی بەرهەمهێنان بەلاَم مەرجە خراپەکان دەبنە بەربەست لەبەردەم ئەم گەشەسەندنەدا". [٢٥]

## ئیشتراکییەت و دیکتاتۆریەتی پڕۆلیتار:

مارکسیەکان مێژوو بەوە ڕاڤەدەکەن کە بریتییە لە گەشەسەندنێکی بەردەوام لەڕێی ئامڕازەکانی بەرهەمهێنان بەتایبەت دوای دۆزینەوە زانستیەکانی سەدەی نۆزدەهەم کە تەکانێکی بە ماددیەت دا و وای لە مارکسیەکان کرد کە ددان لەسەر ماددیگەرایی مێژووی گیربکەن، ئەو ماددیگەرابیە مێژووییەی کە بەڕای خۆیان بریتیە لە جێبەجێکردنی بنەماکانی ماددیگەرایی جەدەلی لە گەشەسەندنی کۆمەڵگای مرۆیی. مارکسیەکان پێیانوایە کە ماددیگەرایی جەدەلی و ماددیگەرایی مێژوویی بەیەکەوە دەبنە بنەمای تیۆریی ئیشتراکیەتی زانستی کە جیاوازە لەگەڵ ئەو ئیشتراکیەتە میسالییەی کە ئەوروپا پێشتر ناسیبوی. لەسەر ئەم بنەمایە پێشکەوتنی ئامڕازەکانی بەرهەمهێنان بوەهۆی پەیدابونی چینی بۆرژوازی کە دەستی بەسەر سیستمی ڕامیاریدا گرت و دواتر شۆڕشە پیشەسازیەکانی ئینگلتەڕاو فەرەنساو بەلجیکاو کەرتەکانی ڕاین ی ڕوسیا سەرەتاکانی ئابووری کۆمەڵایەتییان لێکەوتەوە کە دواتر بۆە هۆی سەرهەڵدانی مارکسیەت. [٢٦]

---

[٢٥] لینین في الأيدولوجية والثقافة الإشتراكية، لاپەڕە ٣-١٠

[٢٦] نشوء الفلسفة الماركسية، دانانی کۆمەڵێك لە زانایانی سۆفیەت، وەرگێڕانی حسان حیدر — دار الفارابي، بەیروت ١٩٩٠ لاپەڕە ١٧

بەڵکو خودی یاساش لەڕێی ماددیگەرایی کۆمەڵگاو ئەوەیشی کەتێیدا هەیە دارێـژرا نـەك کۆمەڵگا لەسەر یاسا ڕابوەستێ و تەنانەت هەڵبژاردنی گشتیش بوەهۆی ڕژاندنی هۆرمۆنەکانی ململانێی نێوان چـینەکان و بەرئەنجامـەکانی، بەتایبـەت لـەلای بۆرژوازیـەکان کـە پێیانوایـە هەڵبژاردن یەکێکە لە چاوگەکانی هێزو دەستەلاتیان.[٢٧]

بەلاَم ئیشتراکیەت بە پێی بۆرژوازیەکان قۆناغی بەر لە شـیوعیەتەو بـە هێـزی شـۆڕش دەگاتە چلەپۆپەو قۆناغی پێگەیشتن. وە شۆڕشیش لەگەڵ پێشکەوتنی پیشەسازی دا ڕوودەدات و کۆمـەڵێ دیـاردەی مـاددی و پاشـان کۆمەلاَیـەتی و ڕامیـاری بـەدوای خۆیـدا دەهـێنێ. پێشکەوتنی پەیوەندییە ئابوری و کۆمەلاَیەتیەکان بوەهـۆی گواسـتنەوەی سیـستمی ئـابوری و کۆمەلاَیەتی لە قۆناغی (لێی گەڕێ با کاربکات لێی گـەڕێ بـا بـڕوا) بـۆ قۆنـاغی سیـستمی چاودێری میری پاشان بۆ قۆناغی سیستمی دەوڵەتی خزمەتگوزاریە کۆمەلاَیەتیـەکان و ئینجـا لەدوای نەمانی خاوەندارێتی تاکەکەسی و تایبەتی بۆ قۆناغی سیستمی خاوەندارێتی دەوڵـەت، ئالێرەشەوە سیستمی ئیشتیراکی سەرهەڵدەدات.

## بۆچی هەمیشە شۆڕشی ئیشتراکی بە چەمکی مارکسیەتەوە دەبەسترێتەوە؟

چونکە قۆستنەوەی دەستی کرێکارەکان لەلایەن خاوەنکارە سەرمایەدارەکانەوە مل دەنێ بۆ سەرهەڵدنی شۆڕش. مارکسیەتیش هەڵسا ئەم قۆستنەوەیەی ڕاڤەکرد بە پشت بەستن بە تیـۆری "فائیزی نرخ" لە زانستی ئابوریناسی دا، ئەی ئەم تیۆرە چیە؟

مـارکس لە کتێبی "رأس المال" دا باسی لە فائیزی نرخ کردوەو لینینیش ئەمەی بە کڕۆکـی تیۆری ئابوری مارکسیەت ناساندووە. فائیزی نرخ ئەو نرخە زیادەیە کە کرێکـاری بـەکرێگیراو بەرهەمی دەهێنێ و دواتریش بەخۆڕایی دەگەڕێتەوە بۆ گیرفانی سەرمایەدار یان خاوەنی کـار. ئائەمەیە جیاوازی نێوان نرخی ئەو کارەی کرێکار لـە بەرهـەمهێنانی کالاَیـەکی دیـاریکراودا ئەنجامیداوە لەگەڵ نرخی ئەو پاداشتەی کە دەسـتی دەکـەوێ لەبەرامبـەر ئـەو کۆششـەی کـە

---

٢٧ تطویر مارکس و انکلز للفهم المادي للتأريخ، دانانی کۆمەڵێك لە زانایانی سۆفیەت، وەرگێڕانی حسان حیدر.

کردوویەتی. زۆربەی جار وایە کە ئەو نرخەی کە کرێکار لە بەرامبەر کارەکەی لەژێر سایەی بۆرژوازیەتدا دەستی دەکەوێ کەمترە لەو نرخەی کە خودی کارەکە هەیەتی. بۆنمونە کرێکارێك ڕۆژانە هەشت سەعات کاردەکات و بەئەندازەی کارکردنی پێنج سەعات نرخ وەردەگرێ، ئەم سێ سەعات زیادە کارکردنە هێزێکی تر دەداتەوە خاوەن کارەکەو نرخێکی ماددی زیاتریشی بۆ دەگەڕێنێتەوە، ئائەمە بریتیە لە فائیزی نرخ: کاتێ خاوەن کار ڕێژەی کارەکەی زیاتر دەکات دەبێتە خاوەنی فائیزی ڕەهاو ئەم فائیزەش بریتیە لە فائیزی نرخ ئەگەر بێتو نرخی کرێکارەکەی زیاد نەکات.

ئەم نرخە زیادەیە بریتیە لە بنەمای ئیستغیلالکردن لە سیستمی ئابوری سەرمایەداری و لەسەر ئەم بنەمایەش مارکسیەت بیردۆزە ئابوریەکەی بنیاتناوە کە پشت بە وروژاندن و هاندانی کرێکارەکان دەبەستێ بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕشی ئیشتیراکی.

زاڵبونی کرێکارەکان "پرۆلیتاریا" بەسەر کاروباری فەرمانڕەوایی و دەوڵەت دەبێتە زاڵبونێکی ڕەها چونکە زۆرینە دەستەڵات دەگرێتە دەست هەروەکو مارکسیەکان ڕاڤەی دەکەن. لەڕاستیدا ئەم زاڵبون و دەستەڵات وەرگرتنەش سیستمێکی دیکتاتۆری لێ دەکەوێتەوە چونکە بوار بۆ هیچ کێبڕکێ و ناڕەزاییەك ناهێڵێتەوە دژ بەو پێڕە کۆمەڵایەتیەی کە فەرمانڕەوایی دەکات هەرچەندە مارکسیەکان بانگەشەی ئەوەدەکەن کە وڵاتەکەیان دیموکراسیەتی پرۆلیتاریایە چونکە زۆرینە دەستەڵات دەگێڕێ، بەڵام زۆرێك لە زانایان بە دیکتاتۆریەتی پرۆلیتار وەسفی دەکەن بەتایبەت دوای ئەوەی ئەزمونە ئیشتیراکیە جۆربەجۆرەکانی جیهان تاقیکرانەوە هەر لە شۆڕشی ١٩١٧ ز ی ڕوسیاوە تا شۆڕشەکانی تری هاوشێوەی.[٢٨]

---

٢٨ تطور الفكر السياسي من الإشتراكية الى الليبرالية الجديدة- د. عدنان السيد حسين. لاپەڕە ٥٠-٥٢

# شیوعیەت

## پێناسەی شیوعیەت:

شیوعیەت بریتیە لە ئەوپەڕی لوتکەی هزری مارکسی و بە پێی شیکردنەوەی مارکسیەت حەتمیە و هەردەبێ ڕووبدات. لە شیوعیەتی نزمەوە کە بەمانای ئیشتیراکیەت دێت بۆ شیوعیەتی بالاّ دەچێ کە بە مانای ڕوخانی دەوڵەت و نەهێشتنی چینایەتی لە کۆمەڵگا دێت. لە قۆناغێکی ئاوادا مرۆڤ لە چوارچێوەی دەوڵەت و چینایەتی و ئایین و ئابووری و خێزان ڕزگاری دەبێ، بۆ ئەوەی بتوانێ زاڵ ببێ بەسەر ئەو ڕێسا گشتیانەی کە لە ئاکار و ڕەوشت نزیکترن بەجۆرێك کە هەموو تاکەکان ئازاد دەبن و بە یەکسانی دەژین تاوەکو مەبدەئی بنەڕەتی شیوعیەت بچەسپێ کە دەڵێ: "هەموو کەسێك بە پێی کارکردنی مافی هەیە و هەرکەسەش ئەوەندەی پێ دەدرێ کە پێویستیەتی". لە قۆناغی شیوعیەتدا مرۆڤ لەوە ڕزگاری دەبێ کە بچێتە ژێرباری کۆت و بەندی دابەشکردنی جۆری کار لە نێوان کاری هزری لەگەڵ کاری جەستەیی و دەست و بازوودا. هەموو ئەو گۆڕانکاریانەی کە مارکسیەت ئاماژەی پێکردوون هەوڵدەدەن ئەو جیاوازیانە نەهێڵن کە لە نێو گەلاّندا هەن وەکو نەهێشتنی جیاوازی نەتەوەیی بە جۆرێك کە کۆمەڵگا دەبێتە یەك کۆمەڵگایەکی گەردوونی کە هیچ جۆرە چینایەتیەکی تێدا نیە و لەسەر بنەمای نەتەوە دابەشنەکراوە[١].

ئەو شیعیەتەی کە کارل مارکس یاسی لێوەکردووە، ئەو شیوعیەتە بەربلاّوە نیە کە لە قۆناغی پێش مێژوودا هەبووە، بەڵکو شیوعیەتی مارکسی بریتیە لە هێنانەدی ئازادکردنی مرۆڤ بە مانای ئازادی تەواو بە جۆرێ کە مرۆڤی بوونی خۆی بەبێ هیچ بەربەستێك بێنێتە

---

١الشيوعية وليدة الصهيونية، أحمد عبدالغفور عطار، لاثەرە ٦٥-٧٠

دی، ئا بەمەش شیوعیەت بریتیە لە چارەسەر بۆ ئەو ململانیٚ و کێشمەکێشمەی کە لە نێوان مرۆڤ و سروشت ومرۆڤ و مرۆڤ و خود و بووندا هەیە. بە پێی مارکسیش "شیوعیەت بریتیە لە گواستنەوەی فەرمانڕەوایی پێویستی بۆ فەرمانڕەوایی سەربەخۆ".

ئەو هزرە بنەڕەتیانەی کە لە دەوری شیوعیەتی مارکسیەتدا دەخولێنەوە لەگەڵ واقیعدا تێکگیران، بە تایبەت لەو ولاٚتانەی کە سیستمی ڕامیاری مارکسیان تێدا دامەزرێنرا. بۆ نمونە شیوعیەتی ئەوروپی لە حەفتاکانی سەدەی بیستدا تەواو لە ناوەڕۆکی مارکسیەت کە بریتیە لە دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا خاڵی کرایەوە و هەوڵی دا لە ڕێگای پەرلەمان واتە ڕێگایەکی ئاشتیخوازانە بگاتە دەستەلاٚت نەك لە ڕێگایەکی توندوتیژی وەکو شۆڕش. ئەمە جگە لەوەی کە شیوعیەتی ئەوروپی دەستی گرت بە بەها لیبڕالیە ڕۆژئاواییەکانەوە (فەرەنسا، ئیتالیا، بەلجیکا ... ) هەروەك چۆن ناکۆکی نێوان هەردوو لایەکەی شیوعیەت (چنی — سۆڤیەتی) لە شەستەکانی سەدەی بیستدا لە سەر چەمکەکانی مارکسیەت بە چەمکی شیوعیەتیشەوە سەری هەڵدا.

سەرەڕای هەموو ئەمانەش ولاٚتانی ڕۆژئاوا پێیان وایە کە شیوعیەت بریتیە لە مەترسی ژمارە یەك لەسەر ئاسایش و ژیاری ئەوروپی، و پێی وایە کە بەرهەڵستی کردنی شیوعیەت لە هەموو شوێنێك بە ولاتە تازەپێگەیشتوەکانیشەوە داخوازێکی ڕۆژئاواییە، زۆر جاریش ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا مکوڕبوو لەسەر ئەوەی کە شیوعیەت مەترسیەکی ڕەتکراوەیە و پێوستە بەرەنگاری بکریٚ.

کەوتە شیوعیەت بیردۆزێکی کۆمەلاٚیەتی و بزوتنەوەیەکی ڕامیاریە کە هەوڵی ئەوە دەدا کە بەسەر کۆمەڵگا و دامەزراوەکانیدا زاڵ بیٚ، بۆ هێنانەدی یوکسانی تاکەکانی کۆمەڵگا بە شێوەیەك کە هیچ تاکێك جیاوکی بەسەر تاکێکی تردا نەبیٚ لەو جیازکانەی کە لە نێو

کۆمەڵگادا هەن و فەزڵی بەسەردا نەخرێ. کارڵ مارکس بە باوکی ڕۆحی بیردۆزی مارکسیەت دادەندرێ. لە گرنگترین ئەو کەسانەش کە خۆی بەم بیردۆزە سەرقاڵکرد و لەم بارەیەوە چەندین پەرتوکی نوسی بریتیبوو لە فلادیمێر لینین[٢].

بەیاننامەی شیوعی بە گرنگترین و بەرچاوترین بەڵگەنامە ی بزوتنەوەی شیوعیەتی جیهانی دادەندرێت، هەروەها سەرچاوەی سەرەکی هزری ڕێبازی شیوعیەتە، ئەم بەیاننامەیە پرەنسیپەکانی بزوتنەوە ئومەمیە ئیشتیراکیەکانی دیاریکرد بە شۆڕشی (١٩١٧)ی سۆڤیەتیشەوە کە یەکەم ئەزمونی مارکسیەت بوو لەسەر ئاستی فەرمانڕەوایی و دەوڵەتدا. ئەگەرچی مارکس و ئەنگلز و ئەوانەشی کە بەدوایاندا هاتن هەڵسان بە دانانی کتێبی تر لەبارەی ئابووری و رامیاری و مێژوو، کەچی بەیانی شیوعی هەر بە مەرجەعی یەکەم دادەندرێت بۆ هەموو ئەو کتێبانە، کەواتە ئەو پرەنسیپە هزریە بنەرەتیانەی مارکسیەت و ئەوانەشی کە لە سەردەمی لینیندا بەدوایدا هاتن چین کەوایان لە شیوعیەتکرد بە شیوعیەتی (لینینی-مارکسی) بناسرێ؟:

## ئایین لە شیوعیەتدا:

شیوعیەکان ئایین بە کۆنەپەرستی دادەنێن و پێیان وایە ئایین لە ئەنجامی وەهم و خەیاڵەوە پەیدابووە و، بریتیە لە کاردانەوەی بارودۆخی ئابووری یاخود پێیان وایە ئایین ئەو ئامرازەیە کە چینی قۆرخکار هەمیشە بۆ بەنجکردنی جەماوەری زەحمەتکێش بەکاری دێنن تاکو نەتوانن داوای مافەکانیان بکەن، ئەو جەماوەرە بەنجکراوە زەحمەتکێشەی کە بەدەستی هەژاریەوە دەناڵێنێ و هەموو هیوایەکی لەدەستداوەو خۆی تەسلیمی ویستی خودا کردووە، بۆیە هزرە

---

٢لینین فی الأخلاق الإشتراکیة، لاپەڕە ٢٠-١١٠

کۆنەپەرستیەکان خۆیان بەسەردا سەپاندووەو، بابای زەحمەتکێش وای لێهاتووە بەدوای تۆڵەی کەرامەتی خۆیدا وێڵە و بەرهەڵستی ئەو کەسە ناکات کە ئیستیغلالی کردووە، بەڵکو لە پێناوی خوادا ئارامگرە لەسەر ئەو بەلاو ناڕەحەتی و قۆڕخکاریەی کە بەسەری هاتووە و چاوی بڕیوەتە ئەو بەهەشت و بەخششەی کە ئایینەکان و پیاوانی کڵێسا بەڵێنیان پێ بە خەڵکی داوە، لە کاتێکدا کە پیاوانی کڵێسا خۆیان خاوەنی پشکێکی بێشوماری زەویە دەرەبەگیەکان بوون.

شۆڕی شیوعیەت (کە بە پێی بانگەشەی شیوعیەکان لەسەر بنەمایەکی زانستی سەریهەڵدا) بەسەر هێزی بەرهەمهێناندا زاڵبوو لە سروشتداو، هزری ئایینی لە مێشکی خەڵکیدا سڕیەوە، هەروەها چەمکی (بیرکردنەوە بۆ خەڵك و کارهەڵسوڕاندنیش بۆ خودا) یان ڕەتکردەوە و جێیان بە چەمکی "بیرکردنەوەو کارهەڵسوڕاندنیش بۆ خەڵك" پڕکردەوە. بۆیە جێی سەرسوڕمان نیە کاتێ شۆڕشی شیوعی هەڵدەستێ ڕەتکردنەوەی هەموو پەیوەندیەکانی بە بیروڕا ئاینیەکانەوە، ئەو بیروڕا ئاینیانەی بە پەیوەندیەکی توندوتۆڵ لەگەڵ خاوەنداریێتی نەریتگەری گرێدرابوون، لەبەر ئەمەش شیوعیەت بە فەرمی دژایەتی کردنی ئایینەکانی ڕاگەیاند و هەڵسا بە دانانی وانەکانی ماددیگەرایی و ئیلحاد لە قوتابخانەکانیدا بەو بیانوەی کە بیروڕایەکی زانستیە، هەروەکو چۆن بڕواداران ئاینەکەیان دەخوێنن، شیوعیەکانیش بەهەمانشێوە هزری ئیلحادیان دەخوێنن، نەك هەر ئەمەش بەڵکو چەندین ئامراز و هۆکاری جۆراوجۆر بەکاردێنن بۆ بلاوکردنەوەی پڕوپاگەندەو بانگەشە پڕوپوچەکانیان تلوەکو خەڵکی لە دووربخەنەوەو ڕەگەکانی ئایین لە کۆمەڵگادا هەڵبکێشن، جا بەپێی ئەوان مرۆڤی ڕەسەنی تێکۆشەر ئەو کەسەیە کە هەموو توانایەکی بۆ لەناوبردنی ئایین و بلاوکردنەوەی هزری ئیلحادی لە ڕیزەکانی کرێکاراندا دەخاتەگەڕ.

بیردۆزی شیوعیه‌ت له هه‌موو بیردۆزه ده‌ستكرده‌كانی تر به‌وه جیاده‌كرێته‌وه كه نه‌ك هه‌ر دژایه‌تی ئایین ده‌كات، به‌ڵكو به ئیلحاد له دژی ده‌وه‌ستێ و، ڕێگایه‌كی تایبه‌تیشی هه‌یه بۆ سه‌پاندنی هزری ئیلحادی، پێشی وایه ئه‌و جۆره ئیلحاده ئیلحادێكی پۆزه‌تیڤه. ئه‌وه‌ی كه ئیلحادی ماركسی له جۆره‌كانی تری ئیلحاد جیده‌كاته‌وه ئه‌وه‌یه كه ماركس به‌وه وازی نه‌هێنا كه بڵێ ئایین فێڵ له خه‌ڵك ده‌كات و له لایه‌ن سته‌مكارانه‌وه دارێژراوه یان بڵێ ئایین ته‌نها بریتیه له وه‌هم و خه‌یاڵ و له نه‌فامیه‌وه سه‌ری گرتووه، به‌ڵكو ماركس و ئه‌نگلز هه‌ڵسان به بانگه‌شه‌كردن به‌وه‌ی كه گوایه مرۆڤ هه‌ندێك غه‌ریزه‌ی هه‌یه كه ئایین چاوبه‌ستانه‌و قۆرخكارانه پڕی ده‌كاته‌وه، به‌وه‌ش نه‌وه‌ستان به‌ڵكو ماركس وتی " ئایین ڕه‌نگدانه‌وه‌ی ڕه‌نج و مه‌ینه‌تی مرۆڤه‌كانه و ئیدانه‌كردنی ئه‌و ڕه‌نج و ماندووبوونه‌یه".

## ڕه‌وشت له شیوعیه‌تدا:

مادیه‌كان ده‌ڵێن ڕه‌وشتی شیوعیه‌ت زۆر جیاوازه له‌و ڕه‌وشته‌ی كه قۆرخكاره‌كان هه‌یانه، چونكه شیوعیه‌كان خاوه‌ندارێتی گشتی ده‌پارێزن و به پیرۆزی ڕاده‌گرن، له كاتێكدا كه قۆرخكاره‌كان خاوه‌ندارێتی تاكه‌كه‌سی به پیرۆز داده‌نێن و پارێزگاری لێده‌كه‌ن و به هه‌موو ئامرازێكی مادی و هزری به‌رگری لێ ده‌كه‌ن "ئاكاری شیوعیه‌ت ته‌واو جیایه له ئاماری قۆرخكاره‌كان و ڕایده‌گه‌یه‌نێ كه خاوه‌ندارێتی گشتی پیرۆزه‌و ده‌بێ پارێزگاری لێبكرێ، ئه‌و خاوه‌نداریه‌تیه‌ی كه بڕوای به خۆشگوزه‌رانی تێكڕای كۆمه‌ڵگا و ته‌واوی زه‌حمه‌تكێشان هه‌یه"[٣].

---

٣المادية التأريخية/ لاپه‌ڕه٤٦٤

ڕەوشتی شیوعیەت مرۆڤی شیوعی وا پەروەردە دەکات کە خۆی تەواو بۆ ئەم ڕێبازە یەکلابکاتەوەو نیشتیمانی ئیشتیراکی و ولآتە ئیشتیراکیەکانی خۆش بویّ، چونکە ڕێسای "تاك لەپێناوی هەموان و هەموانیش لەپێناوی تاك "[٤] بانگەشە بۆ ئەمە دەکات. ئەو ڕێسایە وا لەمرۆڤ دەکات خاوەنی ئازادی خۆی نەبیّ تەنها لەچوارچێوەی کۆمەڵ نەبێت، مارکس دەڵێ: تەنها لە کۆمەڵدا مرۆڤ دەبێتە خاوەنی ئەو ئامرازانەی کە گەشە دەدەن بە بەهرەکانی و، ئازادی تاکیش تەنها لە چوارچێوەی کۆمەڵدا دەستگیر دەبیّ".

هەروەها مارکسیەت ددان گیر دەکات لەسەر ئەوەی کە دەبیّ سیستمی ئیشتراکیەت لەسەر بناغەیەکی بیّ ڕەوشت دابمەزریّ و، قسەی ئەو هزریارو کۆمەڵناسە بۆرژوازیانەش ڕەتدەکاتەوە کە دەڵێن ئیشتیراکیەت لەسەر بناغەی ڕەوشتی سادە بنیاتنراوە وەکو دادگەریی نەمرو ڕاستی ڕەها..، بەبیّ ئەوەی لەم ڕێسا بابەتیانەوە گەشەسەندنی کۆمەڵگا شی بکەنەوە. بەپێی قسەی لینینش بیّ ئەم جۆرە ئیشتیراکیەتە مسقاڵە زەرەیەك ڕەوشتی تێدا نادۆزرێتەوەو، بۆ دروستکردنیشی هیچ پێویستیەکی بە ڕەوشت نییە بەڵکو پێوستی بە بناغەیەکی زانستی هەیە.

مارکسیەت پێی وایە کە زۆرداری شتێکی بنەڕەتی نیە بەڵکو بەرەنجامی سەرمایەداری یەو، یەکێك لە گرنگترین بنەماکانی ڕەوشتی شیوعیەت کە (بەگوتەی شیوعیەکان) پشتی مافخوراوان دەگریّ بریتیە لە سەیرکردنی کار وەکو داهێنان، دەبیّ کابرای شیوعیش کاربکات بۆ کۆمەڵگا چونکە ویستی ژیان لەسەر حیسابی ئەوانیتر لەگەڵ ڕەوشتی کۆمەڵگای ئیشتیراکی دا تێکدەگیریّ.

---

٤ المادية التأريخية، لا ٤٧٤

شیوعیەکان ئەوپەڕی ئامادەیی خۆیان دەردەبڕن بۆ کردنی هەر کارێك کە دژی ڕەوشتە تەنها بۆ ئەوەی مەبەست و ئامانجەکانیان پێ بهێننەدی، کردارەکانیشیان بە گوتەی "ئامانج ڕەوایی دەداتە هۆکار" پەردەپۆش دەکەن. لینینیش دەڵێ: " پێویستە بابای شیوعی ڕاستەقینە هەمو جۆرە فێڵ و فرت و پیلان و چاوبەستن و گومڕاکردنێك بگرێتەبەر، چونکە هەر هۆکارێك لەپێناوی هێنانەدی شیوعیەتدا بێت پیرۆزە".

## هەڵوێستی شیوعیەت بەرامبەر خێزان:

ماددیەکان پیاو لەخێزاندا بە چینی بۆرژوازی کۆمەڵگا دەشوبهێنن و ئافرەتیش بە پرۆلیتار. هەروەها پێیانوایە کە ڕەهەندی تاکڕەوییش لەسەر بناغەی سیستمی ئابوری سەریهەڵدا چونکە پیاو هەڵگیرسێنەری شۆڕشە، بەلاّم لێرەدا پرسیارێك دێتە گۆڕێ ، ئەویش ئەوەیە کە ئەگەر بێتو بە هۆکارە ئابوریەکان تاکڕەویی پیاو لەخێزاندا دروست بوبێ، ئایا بە نەمانی ئەو هۆکارانەش تاکڕەوی لادەچێ؟.

ئەنگلس دەڵێ: " ئەم تاکڕەوییە لەبری ئەوەی لابچێ بەڵکو زیاتر قوڵ دەبێتەوە چونکە بە گواستنەوەی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان بۆ خاوەندارێتی گشتی لەگەڵیدا بەکرێگرتنی کاریش نامێنێ (پرۆلیتاریا)، بەم هۆیەش ئەو بەناچاری کارکردنەش نامێنێ کە زۆرێك لە ئافرەتانی چەوساندۆتەوەو دەتوانرێ سەرژمێر بکرێن کە خۆیان تەسلیم کردووە لەپێناوی پارە دا".[5]

هەروەها دەڵێ: " بە گواستنەوەی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان بۆ خاوەندارێتی گشتی چیتر خێزان نابێتە یەکەی ئابوری کۆمەڵگا، ئابوری نێوخۆی ماڵیش دەگۆڕێ بۆ پیشەسازی کۆمەلاّیەتی و، چاودێری منداڵان و پەروەردەکردنیان دەبنە کاروباری گشتی، لەمەشەوە

---

٥ أصل الأسرة، لا ١١٧

کۆمەڵگا چاودێری سەرجەم منداڵان دەکات چ یاسایی بن یاخود نایاسایی، بەمەش چیتر کچ توشی دڵەڕاوکێ و ترس نابێ لەوە کە ڕوبەڕوی ئەو سزایانە نابێتەوە کە لەم ڕۆژگارەی ئێستاماندا بۆتە جێی بایەخی کۆمەڵگای ئابوری و ڕێگری دەکەن لەوە کە بەبێ دودڵی خۆی پێشکەشی ئەو کەسە بکات کە خۆشی دەوێ. جا ئایا ئەمە نابێتە هۆکارێك بۆ ڕەواجدان بە ئازادی جۆرێك لە جۆرەکانی بەیەکگەیشتنی سێکسی و، فشارخستنە سەر ڕای گشتی تا نەرمیی بنوێنن لەبارەی ئابڕوی کچێنی و شەرمی ئافرەت؟".[٦]

## کاریگەریەکانی شیوعیەت بەسەر خێزانەوە:

شیوعیەکان ئامانجیان ئەوەیە هەردوو کۆڵەگە سەرەکیەکەی خێزان بڕوخێنن، کە ئەوانیش بریتین لە هاوسەرگیری و پەروەردەکردنی منداڵ، پێیانوایە پەیوەندی نێوان دوو ڕەگەزەکە تایبەتی نییەو تەنها دوو لایەنەکەی هاوسەرگیری ناگرێتەوە بەڵکو دەبێ خاوەندارێتی تایبەتی هەڵبوەشێنرێتەوەو پەروەردەکردنی منداڵیش دەکەوێتە ئەستۆی کۆمەڵگا.

ئەوە خودی ئەنگلس وتوویەتی: "پەیوەندی نێوان دوو ڕەگەزەکە بابەتێکی تایبەتی یەو لەچەند کەسێکی دیاریکراو بەولاوە کەسی تر ناگرێتەوەو کۆمەڵگا دەست ناخاتە نێویەوە، دەتوانین ئەوە بێنینەدی کە خاوەندارێتی تایبەتی ڕەتبکەینەوەو پەروەردەکردنی منداڵیش بخەینە ئەستۆی کۆمەڵگاوە. لە ئەنجامی ئەمەشدا هەر لە بنەڕەتدا پەیماننامەی هاوسەرگیری هەڵدەوەشێنرێتەوە، چیتر ئافرەت نابێتە پاشکۆی مێردەکەی و منداڵەکانیش لە خێزاندا قەتیس ناکرێن، ئەم پاشکۆبونەی خێزان هێشتاش بەهۆی خاوەندارێتی تایبەتی هەر هەیە".

---

٦ هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ١١٨

شیوعیەکان گاڵتەیان بەوە دێ کە بۆرژوازیەت لە زۆری ڕێژەی ئافرەت دەترسێ، چونکە بەربلاّوی ئافرەت بەڕای ئەوان بونی هەر هەبووە، شیوعیەکان پێیانوایە کە بۆرژوازیەکان چێژ وەردەگرن لەوە کە لەگەڵ ئافرەتانی یەکتری دا ڕابوێرن، بە بلاّوبونەوەی لەشفرۆشی فەرمیش ڕاناوەستن، هەروەها بەوەش ڕاناوەستن کە بەئارەزوی خۆیان مامەڵە بە ئافرەتان و کچانی پرۆلیتار بکەن. پێشیانوایە کە هاوسەرگیری بۆرژوازی دەبێتەهۆی زۆربونی ئافرەتانی هاوسەردار و ئامادەشن ئەو تۆمەتەی کە دەخرێتە پاڵیان لەبارەی لێکهەڵوەشاندنی خێزان و نەهێشتنی پەیوەندی خێزانی قبوڵ بکەن. لەهەموشی گرنگتر ئەوەیە کە شیوعیەکان بە ئاشکرا بانگەشە بۆ ئەم بیروڕا شیوعییانەی خۆیان دەکەن و دەڵێن بەربلاّوی ئافرەت بە نەهێشتنی پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان نامێنێ.

مارکس و ئەنگلس دەڵێن: "شیوعیەکان پێویستیان بە بەربلاّوی ئافرەت نییە، چونکە بەربلاّوی ئافرەت پێشتر بونی هەر هەبووە. هەروەها بۆرژوازیەکان بەوە ناوەستن کە ئافرەتان و کچانی پرۆلیتار بخەنە ژێر چنگی خۆیان و بە ئارەزوی خۆیان مامەڵەیان پێوەبکەن —ئەمە جگە لە لەشفرۆشی ئاشکرا- بەڵکو چێژێکی تایبەت وەردەگرن لە ڕابواردن بە ئافرەتانی یەکتری".

هەروەها بەڕای ئەوان، هاوسەرگیری بۆرژوازی لە واقیعدا تەنها دەبێتەهۆی زیادبونی ئافرەتانی هاوسەردار، بەم هۆیەوە شیوعیەکان بەوە تۆمەتباردەکرێن کە دەبنەهۆی بەربەست لەبەردەم بەربلاّوی ئافرەت و نەهێشتنی پەیوەندی هاوسەرگیری لە خێزاندا.

"بەلاّم زۆر ئاساییە کە نەهێشتنی پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان لە حاڵی ئێستادا بەسروشتی خۆی دەبێتەهۆی ڕێگرتن لە بەربلاّوبونی ئافرەت، واتە لەشفرۆشی و زینا جا چ بە ئاشکرا بێ یان بە نهێنی بەرەو نەمان دەچێ ".[٧]

---

٧ بەیانی شیوعی لاپەرە ٦٢-٦٣

## شیوعیەت و دژایەتیکردنی ئایینەکان:

شیوعیەت هەمو ڕێوشوێنە زانستی و هزریەکانی بەکارهێنا لەدژی ئایینەکان بەتایبەتی ئیسلام، بەشێوەیەك کە شیوعیەت ڕوی لەهەر ولاّتێك کردبێ جەنگێکی بێ وێنەی لەدژی ئایینەکان (جگە لە ئایینی جولەکە) تێدا ڕاگەیاندوە. هەروەها شیوعیەت چەندین هۆکارو فشاری هزری و ماددی بەکارهێنا بۆ دژایەتیکردنی ئایینەکان و هێنانەدی ئامانجەکانی، بۆنمونە هەڵسا بە داخستنی مزگەوت و کڵێساکان و لەسێدارەدانی زانایانی مسوڵمان و پیاوانی کڵێسای مەسیحی، جگە لە کوشتنی ملیۆنەها مسوڵمان و هی تریش، هەروەها دورخستنەوەی ملیۆنەها مسوڵمانی تر لە ماڵ و حاڵی خۆیان..، شیوعیەت هەڵسا بە راگوێزانی چەندین خێزانی مسوڵمان و ئاوارەکردنیان بۆ خاکی سیبیریا، هەروەها بینیمان و بیستمان کە چۆن شیوعیەتی دڕندە هێرشی هێنا سەر ئەفغانستانی مسوڵمان و چەندەها موجاهیدی لێ شەهیدکردن هەر تەنها لەبەرئەوەی بەرگرییان لە خاك و بیروڕای خۆیان دەکرد.

جگەلەمەش، ڕوسیای شیوعی هەڵسا بەسەپاندنی ئیلحاد بەسەر گەلەکەی و ئەو گەلانەی کە لەژێر چنگی دا بوون، بۆئەم مەبەستەش خوێندنی ئایین لە قوتابخانەکان قەدەغەکراو سزای زیندانیش سەپێنرا بەسەر هەرکەسێکدا کە ڕێنماییەکانی ئایینی بلاّوکردبایەوە لەنێو ئەوکەسانەی کە لە خوار تەمەنی پێگەیشتندان.

## هۆکارەکانی دوژمنکاری شیوعیەت بەرامبەر بە ئایینەکان:

توێژەران جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە ئەوهۆکارەی وای لە شیوعیەت کرد کە دژایەتی ئایینەکان بکات و جەنگی کوشندە لەدژیان ڕابگەیەنێ دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی دەرونی جولەکە کە هەمو هەوڵ و کۆششێکی بۆئەوەیە کە دروشمی "گەلی هەڵبژێردراوی خوا"

بەرزبێتەوە، جێی سەرسوڕمانیش نیه ئەگەر بڵێین شیوعیەت بەرهەمی جولەکە بوو و زۆربەی سەرکردەکانیشی جولەکە بوون[٨].

جولەکەش گەلێکە ناسراوە بەوەی کەهەمیشە هەڵگری ڕق و کینەیە دژ بە ئایینەکانی ترو، هەمیشە چاوتێبڕ و چڵێسەو بە خۆشویستنی ماڵ و بەدڕەوشتی دەناسرێتەوە..، هەرهەڵێك لەبەردەمی جولەکەکاندا بێ دەیقۆزنەوە بۆ بەدڕەوشتکردنی خەڵکی[٩] و دورخستنەوەیان لە بنەماکانی ئاین تاوەکو بتوانن پلانە گڵاوەکانیان جێبەجێبکەن لە ڕوخاندنی بیروباوەڕی خەڵکیو تێکدانی ڕەوشتیان هەروەها گومان و دوودڵی دەخەنە دڵی خەڵکیەوە بەرامبەر بە

---

[٨] دانا عوسمان حەسەن، نوسەری کتێبی (جولەکە ، عەقیدەو شەریعەت و مێژوویان) لە لاپەڕە ١٢٥ ناوی ئەو کەسایەتیانەی ڕیزکردوون کە لەنێو یەکێتی سۆڤیەتی ڕوسیادا جولەکە بوون:

لینین، ستالین، تروتسکی، کامینیف، سوکولنکوف، زینوفیف.

هەروەها باس لەوەدەکات کە زۆربەی پلەو پۆستە ئیداری و سیاسیە گرنگەکانی سۆڤیەت لەلایەن جولەکەکانەوە قۆرغکرابون:

"لە ٢٢ وەزیر ٧ کەسیان جولەکە بوون، دەستەی بەڕێوەبردنی جەنگ لە ٤٣ کەس پێکهاتبو ٣٤ یان جولەکە بوون، لیژنەی کاروباری ناوەخۆ ٦٤ کەس بوون ٤٥ یان جولەکە بوون، لیژنەی کاروباری دەرەوە لە ١٧ کەس پێکهاتبوو ١٣ یان جولەکە بوون، لیژنەی کاروباری ماڵی لە ٣٠ کەس پێکهاتبوون ٢٦ یان جولەکە بوون، دەستەی کاروباری قەزایی لە ١٩ کەس پێکهاتبوو ١٨یان جولەکە بوون، لیژنەی کاروباری تەندروستی لە ٥ کەس پێکهاتبوو ٤ یان جولەکە بوون....هتد". هەروەها دواتر ناوی ئەوانە ڕیزدەکات کە لەسەردەمی (ستالین) دا ئەندامی مەجلیس شیوعی بوون بەجۆرێك کە ١٧ کەس بوون و ١٤ یان جولەکە بوون (وەرگێڕ)

[٩] دانا عوسمان حەسەن، لەهەمان کتێبدا لاپەڕە ٢٢٠ ئاماژە بۆ یەکێك لە بڕگەکانی پرۆتۆکۆلەکانیان دەکات کە دەڵێ : " (يجب لنعمل لتنهار الأخلاق في كل مكان فتسهل سيطرتنا، إن فرويد منا وسيظل يعرض العلاقات الجنسية في ضوء الشمس كي لا يتقى في النظر الشباب شيء مقدس، ويصبح همه الأكبر هي إرواء غرائزه الجنسية و عند ئذ تنهار أخلاقه). واتە: پێویستە کار بکەین لەپێناو ڕوخاندنی ڕەوشت لە هەمو شوێنێکدا بۆئەوەی بەئاسانی زاڵبین، فرۆید لە ئێمەیە، بەردەوام پەیوەندیە جنسیەکان پەخش دەکەین، وەك تیشکی خۆر، بۆ ئەوەی شتێك نەمێنێتەوە لە بیری گەنجەکاندا بەناوی پیرۆزی یەوە، وە بۆئەوەی کە گەنجەکان گەورەترین خەونیان بریتی بێت لە تێرکردنی غەریزە جنسیەکانیان، هەرکات ئەمەی ئەنجامدا ڕەوشتیش دەڕوخێت)". (وەرگێڕ)

ئایینەکەیان، لەم سۆنگەیەشەوە شیوعیەت یەکێك بوو لە گرنگترین ئەو چەکانەی کە جولەکە وەکو پیلان بەکاریهێنا.

کەواتە شیوعیەت وەکو ئایین و بیروباوەڕێك دەرکەوت کە ویستی شوێنی ئایینە کۆنەکان بگرێتەوەو لەدژیاندا بوەستێ و، بە ئیلحادو ماددیگەرایی کە خواو پێغەمبەر بەدرۆدەخەنەوە بەرەنگاریان بکات.

بەرەنگاری ئەو جەنگە کردەییە ناکرێ کە شیوعیەت لەدژی ئایینەکان ڕایگەیاندوەو ئێستاشی لەگەڵدابێ هەر بەردەوامە تەنها بەوە نەبێ کە گەلان بگەڕێنەوە بۆ ئایینەکەیان کە ئیسلامە، تاکو لە واقیعی ژیاندا ئایین فەرمانڕەوایی بکات و ئاڵای جیهادیش لەپێناوی خوا بەرزبکرێتەوە.

شیوعیەت جەنگێکی هزری لەدژی ئایینەکان گێڕاو، ئایینی بە بێهۆشکەرو وەهم و خەیاڵات و خورافیات وەسفکرد، هەروەها مرۆڤی دینداریشی بە دواکەوتوو و کۆنەپەرست و نەفام لەقەڵەمدا بەڵام بەپێچەوانەوە مرۆڤی مولحیدی بە ئازادیخوازو پێشکەوتوو پێناسەکرد تاوەکو ئەو جەنگە کردەییەی کە لەدژی ئایینەکان و شوێنکەوتوانیان ڕایگەیاندوە پەردەپۆش بکات.

# زایۆنیزم

## پێناسەی زایۆنیزم:

هیچ کام لەو کتێبانەی کە لە بارەی ڕێبازە هاوچەرخەکانەوە نوسراون ئاماژەیان بە زایـۆنیزم نەکردووەو، هیچ کەسێکیشم نـەدیوە لـەپاڵ ڕێبازەکـانی تـرەوە شـتێکی باسـکردبێ لـەبارەی زایۆنیزمەوە.

زایۆنیزم یەکێکە لە ترسناکترین بزوتنەوەو ڕێبازەکان چونکە وایلێهاتوە بۆتە بـیروڕای پـانزە ملیۆن جولەکە لە جیهان، وە سێ ملیۆن جولەکە کە خاکی فەڵەستینیان داگیر کـردووە، ئەمـە جگە لە هەزارەها بەکرێگیراو کە لەدەوروبەرماندا دەژین و هەموو خەمو هەوڵێکیان لـەپێناوی ئەو دەوڵۆتۆکەی جولەکەدایە کە لەسەر خاکی فەڵەستین دامەزراوە، ئێستا ئەوانەی کە بڕوایان بە زایۆنیزم هەیەو جولەکە نین مەترسـیان زیـاترە لەوانـەی کـە جولەکـەن چـونکە هەوڵـدەدەن ڕاییمان بکەن بەوەی کە ئیسرائیل لە نێوخۆماندا قبوڵ بکەین و زایۆنیزم بکەینـە یـەکێك لـەو ڕێبازانەی کە لەگەڵی دا بسازێین، هەر بۆ ئەم مەبەستەش چەندین هۆکار و ئامراز بـەکاردێنن. جا لەبەرئەوە زایۆنیزمم کردە یەکێك لەو ڕێبازانەی کە لـەو کتێبـەدا باسـکراوە چـونکە هـیچ هۆکارێك نی یە وامان لێبکات توێژینەوە بکەین لە شیوعیەت و سەرمایەداری و مارکسیەت و پراگماتیزم بەلاّم زایۆنیزمی لێ بهێنینە دەرەوە، کە لە ڕاستیدا هزر و بیروڕاکـان جۆراوجـۆرن بەلاّم سەرەنجامەکەی یەکە.. کە دەبێ لە بەرامبەری دا بوەستین و لێکۆڵینەوەی لەسەر بکـەین تا تێیبگەین و هەڵوێستی گونجاوی لە بەرامبەر دا بنوێنین کە عەقیدەی ئیسلامی لەسـەرمانی پێویست کردووە.

وشەی صەهیۆنیەت (زایۆنیزم) لە (صەهیۆن)ەوە هاتووە کە شاخێکە یان سـەنگەرێکە یـان گردێکە لە ئۆرشەلیم.

صەهیۆنیەت بریتیە لە بزوتنەوەیەکی ڕەگەزپەرستی ئیستیعماری کە لەسەر ئەساسی مەزهەبیەتی خۆبەگەورەترین زانین بنیاتنراوەو ئامانجیشی ئەوەیە کە بە خۆبەرفراوان کردن و کۆنترۆڵکردن و دوژمنکاری و لە ڕێگای بەکارهێنانی ئامرازەکانی توندوتیژییەوە بگاتە مەبەستەکانی.

بزوتنەوەی زایۆنیزم لە ئەوروپا پەیدا بوو لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە دوور لە فەلەستین و ئاینی جولەکە.. بۆ یەکەمجاریش زایۆنیزم کاری ڕێکخستنی لە کۆنگرەی زایۆنی یەکەم بە خۆوە بینی کە لە ساڵی ١٨٩٧ گرێدرا، هەر ئەو کۆنگرەیەش بوو کە سەرۆکی بزوتنەوەی زایۆنی و دامەزرێنەرەکەی (تیۆدۆر هرتزل) دەوڵەتی جولەکەی ڕاگەیاند[١]. بزوتنەوەی زایۆنی هەر لە سەرهەڵدانیەوە تا ئێستا لەسەر چەند تیۆرێکی هەڵە بنیاتنراوە وەکو ئەوەی کە جولەکە ئاین و گەلە و، هەربۆیەش هەوڵدەدات ئەوەی کە پێی دەوترێ (نەتەوایەتی جولەکە) و (یەکێتی گەلی جولەکە) دروست بکات. جا بۆ ئەم مەبەستە تێدەکۆشێ بۆ داگیرکردنی فەلەستین تاوەکو ئامانجە ئیستیعماریەکانی بێنێتە دی لە دامەزراندنی نیشتیمانێك بۆ جولەکە بۆئەوەی ئومێدی جولەکە بگەڕێتەوە لە دامەزراندنی دەوڵەتی جولەکە لەسەر خاکی فەلەستین. هزرە سەرەکیەکانی زایۆنیزم بەو شێوەیەی کە سەرکردەکانی دایانڕشتووە لەم خاڵانەدا کورت دەبێتەوە:

١- جولەکە گەلی هەڵبژێردراوی خوایە.

٢- جولەکە گەلێکە پاشەڕۆژێکی مێژویی هەیە و تایبەتمەندە بە هەندێك خاسیەت و پێی لە گەلانی تر جیا دەکرێتەوە.

---

١الموسوعة الفلصطينية لاپەرە ١٠٩

